kurdpdf.com

پوختەی عەقیدەی سەلەفی صالح

ئەهلی سوننەو جەماعە

# الوجيز

في عقيدة السلف الصالح

نووسینی

عبدالله بن عبدالحمید الأثري

وەرگێڕانی

ناصح ئیبراهیم سازانی



ناريـن




ناوی کتێب: پوختەی عەقیدەی سەلەفی صالح.

نووسینی: عبد الله بن عبد الحمید الأثري.

وەرگێرانی: ناصح ئیبراهیم سازانی.

نۆرەو ساڵی چاپ: چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٢٢.

ژمارەی سپاردن: (٢٧٥٢)ی ساڵی (٢٠١٢) ی پێدراوە.

---




هەولێر/ بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
Website: www.nareenpub.com
E-mail: nareenpub@gmail.com
مۆبایل: ٠٠٩٦٤٧٧٢٤٠٦١٠١٠

# پوختەی عـەقیدەی سەلەفی صالح

## ئەهلی سوننە و جەماعە


نووسینی

عبد الله بن عبد الحميد الأثري

وەرگێڕانی

ناصح ئیبراهیم سازانی


کۆمەڵێ لە زانا پایەبەرزەکان پێیدا چوونەتەوە و پێشەکییان بۆ نوسیووە



بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ ﴾ سورة البقرة: ١٢٧.

واته: خوایه ئەم کردەوەمان لێ گیرا بکە بەڕاستی هەرتۆی بیسەری زانا.

# پێشەکی وەرگێڕ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغفِرُهُ، ونَعُوذُ باللهِ مِن شُرُورِ أنفُسِنَا وسَيِّئَاتِ أعْمَالِنَا، مَن يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، ومَن يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، واشْهَدُ ان لاَ إلَهَ إلاَّ اللهَ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، واشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

لەپێش هاتنی دینی پاکی ئیسلامدا نەفامی باڵی ڕەشی کێشابوو بەسەر خەڵکدا، مرۆڤەکان لە تاریکیەکانی بت پەرستی و هاوبەش بۆ خوا داناندا دەژیان و سەرگەردان بوون و بەدوور بوون لە یەکتاپەرستی، تیرەو هۆزەکان جەنگ و هەرایان بوو یەکتریان دەکوشت، خاوەن دەسەلات بێ دەسەڵاتی دەچەوساندەوە، مرۆڤەکان دەکرانە بەندەو کۆیلە، مافی خزمایەتی و دراوسێیەتیان نەدەپاراست، ئافرەتان بەش خوراو بوون و بەسوك سەیر دەکران، کچان زیندە بەچاڵ دەکران، هەتا خۆری ئیسلام هەڵهات و درزی بە شەوەزەنگی نەفامی دا، خوای گەورە بە بەزەیی و میهرەبانی خۆی موحەممەدی (صلی الله علیه وسلم) ڕەوانەکرد؛ هەتا مرۆڤەکان لەبەندایەتی بەندەکانەوە ڕزگار بکات بۆ بەندایەتی خوای تاقانە، لەزوڵم و ستەمی ئاینەکانەوە بۆ دادپەروەری ئیسلام، لەتەنگی ژیانی دنیاوە بۆ فراوانی دواڕۆژ.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سیانزە ساڵ لە مەککە شەو و ڕۆژ بەبێ وچان لەسەر ئەم بانگەوازە بەردەوام بوو، لەپێناوی ئەوەدا کە عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلام لەدڵ و دەروونی هەواڵەکانیدا بچەسپێنێت و دامەزراویان بکات لەسەر بە تەنیا خواپەرستی، بۆیە جێگەی خۆیەتی موسوڵمانان بایەخ بدەن بە فێربوونی ئەو عەقیدەو بیروباوەڕە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی و؛ هەوەڵان (صحابە)و شوێنەکەوتوان (تابعین)و شوێنکەوتوانیان لەسەری بوون و بە چاکی جێبەجێیان کردووە، چونکە بەوە نەبێ چاکسازی ناکرێت.

شەیتانی نەفرین لێکراو شەو و ڕۆژ لە کەمیندایە بۆ فریودانی موسوڵمانان و لادانیان لەسەر ڕێی ڕاست و شێواندنی عەقیدەو بیروباوەڕیان، هەروەها ڕاپێچ کردنیان بەرەو تاریکیەکانی هاوبەش بۆ خوا دانان، هەروك لەم فەرمودە قودسیەدا هاتووە:

(وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ، وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ، وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَا أَحْلَلْتُ لَهُمْ، وَأَمَرَتْهُمْ أَنْ يُشْرِكُوا بِي مَا لَمْ أُنْزِلْ بِهِ سُلْطَانًا) رواه مسلم: (٢٨٦٥).

واتە: من بەندەکانی خۆمم بەپاکی بەدیهێناون لەسەر خوا بە تەنها پەرستی، بەڵام شەیتانەکان بۆ لایان دەچن و فێڵیان لێ دەکەن و دەیان خەڵەتێنن و لەڕێی ڕاست لایان دەدەن، ئەوەی کە من بۆم حەڵاڵ کردون لێیان حەرام دەکەن، فەرمانیشیان پێدەکەن کە هاوەڵ و شەریکم بۆ دابنێن!.

ئەم کتێبە بەنرخەی برای بەڕێزم شێخ (عبدالله الأثري) باسێکی زۆر گرنگە سەبارەت بە عەقیدەو بیروباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە؛ مانای عەقیدەی ئیسلامی زۆر بەجوانی ڕونکردۆتەوە لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا؛ بۆیە پێویستە لە کتێبخانەی هەموو موسوڵمانێکدا هەبێ و منداڵەکانیانی لەسەر پەروەردە بکەن، لەبەر بەپێزی باسەکەی و لەسەر داوای نوسەر خۆی ئێمەش هەستاین بەوەرگێڕانی بۆ زمانی شیرینی کوردی، بەو هیوایەی خوێنەرانی کورد لێی بەهرەمەند بن و شوێن عەقیدەو بیروباوەڕی سەلەفی صالح ئەهلی سوننەو جەماعە بکەون بەڕاستی؛ نەك شوێنی عەقیدەی چەوتی دەستەو تاقمە گومڕاو سەرلێ شێواوەکان.

ئەم زانا پایە بەرزانە پێشەکیان بۆ کتێبەکەی نوسیوەو پەسەندیان کردووە:

١- (شيخ عبد الله بن عبد العزيز العقيل).

٢- (شيخ العلامة عبد الله بن عبد الرحمن الجبرين).

٣- (شيخ العلامة صالح بن فوزان الفوزان).
٤- (شيخ العلامة القاضي محمد بن اسماعيل العمراني).
٥- (شيخ صالح بن عبد العزيز آل الشيخ).
٦- (شيخ العلامة صالح بن عبد الرحمن الحصين).
٧- (شيخ محمد بن ابراهيم شقرة).
٨- (شيخ الجليل الدكتور الأمين الحاج محمد).
٩- (شيخ سعود بن إبراهيم الشريم).
١٠- (الأستاذ ناصر بن عبد الكريم العقل).
١١-(الأستاذ الدكتور محمد بن عبد الرحمن الخميس).
١٢- (شيخ الدكتور ماهر بن ياسين الفحل).
١٣- (الدكتور عبد المحسن بن عبد العزيز العسكر).
١٤- (شيخ الجليل محمد راشد بن خالد القرة كويلي).
١٥- (شيخ الجليل محمد بن جميل زينو).
١٦- (الدكتور عبد الرزاق بن طاهر معاش الجزائري).
١٧- (شيخ الجليل الدكتور محمد يسري ابراهيم).
١٨- (شيخ محمد سيدى بن سليمان النووي).
١٩- (شيخ الأستاذ الدكتور ساجد مير).
٢٠- (شيخ الدكتور سعيد بن محمد بابا سيلا).

ناصح ئیبراهیم سازانی

سلێمانی/ ١٤٣٤ كۆچی بەرامبەر بە ٢٠١٢ زایینی

# پێشەکی دانەر بۆ چاپی یەکەم

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعُوذُ باللهِ مِن شُرُورِ أنفُسِنَا وسَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَن يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، ومَن يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وأَشْهَدُ أن لاَّ إِلَهَ إلاَّ اللهَ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ آل عمران: ١٠٢.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾ النساء: ١.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ الأحزاب ٧٠ – ٧١

أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كَلامُ اللهِ، وَإِخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٍ، كُلُّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ[١].

**ئەی برای موسوڵمانی بەڕێز و ئازیز و خۆشەویست، ئەمانە چەند وشەیەکی کورت و پوخت و ئاسانن لە ڕونکردنەوەی:**

**(عەقیدەو بیروباوەڕی پێشینە چاکەکان، ئەهلی سوننەو جەماعە).**

---

١- ئەم وتارە پێی دەوترێت: (خطبة الحاجة) بۆ ئەوە دانراوە کە لە هەموو کاروبارێکی دینی دا بەمە دەست پێ بکەین، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاوەڵەکانی خۆی فێر دەکرد تا لەکاتێکدا کە دەیانەوێ قسە بۆ خەڵك بکەن بەمە دەست پێ بکەن لە هەموو کاروبارێکی دینیاندا ئیتر ئەو کاروبارە بریتی بوایە لە ژن مارەبڕین بێت، یان وتاری هەینی، یا (محاچرە) وتاردان بۆ خەڵك، یان جگە لە مانەش، زۆربەی کتێبەکانی سوننە ئەم (خطبة الحاجة)یان ریوایەت کردوە بە جیاوازی لە شێوازی دەربڕینیدا لە: (سنن ابن ماجة) كتاب النكاح، باب خطبة النكاح، وفي (سنن الترمذي)، و (سنن أبي داود) و (سنن النسائي) ورواها أبو يعلى في : (مسنده) والطبراني في : (المعجم الكبير) والبيهقي في: (سننه) والإمام أحمد في : (مسنده)، وورد ذكر طرف من هذه الخطبة في: (صحيح مسلم) كتاب الجمعة، باب خطبته صلى الله عليه وسلم في الجمعة. وللبسط في تخريجها انظر كتاب (خطبة الحاجة) للشيخ المحدث العلامة محمد ناصر الدين الألباني.

ئەوەی کە وایکرد هەستم بە دانانی ئەم پەرتووکە ئەوەیە کە ئومەتی ئیسلامی بە بارێکی ناهەمواردا تێ دەپەڕێ و توشی دوبەرەکی و ناکۆکی و جیاوازی و دەستە دەستەیی بووە، خۆیان لەو حیزب و کۆمەڵە هەوچەرخانەدا دەبیننەوە کە بوونیان هەیە لە گۆڕەپانەکەداو بوونەتە دەمڕاستی موسوڵمانان و نوێنەرایەتی خەڵك دەکەن؛ هەر یەکەیان بانگەشە بۆ عەقیدەو بیروباوەڕی بەرنامەو پرۆگرامی خۆی دەکات و، خۆی لەوانی تر بە چاکتر و بە پاکتر دەزانێت؛ هەتا کار گەیشتۆتە رادەیە موسوڵمانان سەریان لێ شێواوەو، بە شێوەیە کە نازانن چی بکەن شوێن کێ بکەون؟ وە کێ بکەنە سەرمەشق و پێشەنگی خۆیان؟!

بەڵام ئەوەی کە جێی باسە سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو خاوەن منەت بەسەر ئێمەوە وای لێ نەهاتووە کە خێر لەناو ئەم ئوممەتەدا نەما بێت وە وایشی لێ نایەت کە نەمێنێ، بەڵکو بەردەوام کۆمەڵێ لە موسوڵمانان دەست دەگرن بە هەق و هیدایەتەوە هەتا رۆژی دوایی کە بریتییە لە عەقیدەو بیروباوەڕە راستەقینەکە؛ هەروەك راستگۆ و بەراست زانراو رایگەیاندووە لەکاتێکدا کە دەفەرموێت: (لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ، لايَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ؛ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ وَهُمْ كَذٰلِكَ)[1]. واتە: بەردەوام کۆمەڵێ لە ئوممەتەکەم دیارو ئاشکران و لەسەر هەقن، ئەوانەی کە دەیانەوێت زیانیان پێ بگەیەنن یان زەلیل و سەرشۆڕیان بکەن ناتوانن زیانیان پێ بگەیەنن؛ ئەوانە هەر بەو شێوەیەن هەتا رۆژی قیامەت دادێت.

هەروەها دەفەرموێت: (مَثَلُ أُمَّتِي مَثَلُ الْمَطَرِ لا يُدْرَى أَوَّلُهُ خَيْرٌ، أَمْ آخِرُهُ؟)[2]. واتە: نموونەی ئومەتەکەی من وەك نموونەی باران وایە نازانرێت سەرەتاکەی خێر و چاکە؛ یان کۆتاییەکەی.

(١) – رواه مسلم: ١٩٢٠.

(٢) – (صحيح سنن الترمذي) – تحقيق الألباني: حسن صحيح، المشكاة (٦٢٧٧)، الصحيحة (٢٢٨٦).

ئا لێرەوە پێویستە لەسەرمان ئەم کۆمەڵە موبارەکە بناسین کە پابەندبوون بە ئیسلامە حەق و راستەکەوە ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی و؛ هەوەڵان(صحابە)و شوێنەکەوتوان(تابعین)و شوێنکەوتوانیان بە چاکی پەیڕەویان کردووە؛ خوای گەورە وامان لێ بکات کە لەوان بین و بمانخاتە ریزی ئەوانەوەو لەگەڵیان حەشرمان بکات، (اللّهم آمین) خودایە بە بەزەیی خۆت لێمان وەرگری.

ئەم کۆمەڵەش بریتییە لە کۆمەڵی رزگار بوو (فرقة الناجیة) و دەستەو تاقمی سەرخراون (طائفة المنصورة)، کە ناسراون بە ئەهلی سوننەو جەماعە، ئەهلی فەرمودە(حدیث)، ئەهلی(الأثر والإتباع)، ئەوانەش لەسەر ئەو بەرنامەو رێبازە بوون کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هەوەڵانی لەسەری بوون رەزای خوایان لێ بێ.

ئا لەم دەروازەوە لەم رووە بەرز و مەزنەوە خێرا هەستام بە پوختەکردنی پەرتووکە گەورەکەم کە ناوی: (المیسر في عقیدة السلف الصالح)ە[1].

**ئەم پەرتووکە هەڵم گۆزیوە لە کتێبەکانی پێشەوایانی سەلەف ئەوانەی کە شاهیدیان بۆ دراوە کە خاوەن دادپەروەری و زانست و زانیارین، ئەم پەرتووکەم لەوانەوە وەرگرتووە کە شوێن سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەوتون و بونە پێشەوا، کە ئەوانیش هەڵیان گۆزتوە لە سوننەت و رێبازی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) گەورە لە گەورەوە زانا لە زانا — بۆ نموونە شوێنکەوتوان لە هاوەڵانەوەو وەریان گرتووە ئەوانیش لە پێغەمبەری خواوە (صلی**

(١) — داواکارم لەخوای گەورە کار ئاسانی بکات بە چاپ بگەیەنرێت و بڵاوبێتەوە چونکە مەشروعی تەمەنمە.

الله عليه وسلم)، سورم لەسەر ئەوەی ئەم کتێبەم کە ناوی (الوجيز)ە بخەمە بەردەستی خوێنەران بە دەستەواژەیەکی کورت و بەشێوازێکی روون و ئاسان، لەگەڵ پابەند بوونی تەواوم بەو دەربڕینە شەرعیانەوە کە لە پێشەوایانی سەلەفەوە بۆمان ماوەتەوە بەپێی توانا؛ هەتا هەموو خوێنەرێك لێی بەهرەمند ببێ و سودی لێ وەربگرێت، بە تایبەتی تر ئەو تازە پێگەیشتوانە لە نەوەکانی ئەم رابوونە ئیسلامیە پیرۆز و موبارەکە، هەروەها ئەم کتێبە ببێتە یارمەتی دەر بۆ بەدەستهێنانی پوختەی عەقیدەی سەلەفی صالح بە شێوەیەکی گشتی و ئاسان بۆ ئەو گەنجە تازە پێگەیشتوانەی کە لەسەر رێی راستن و رێنمایی کراون، چونکە زانستی عەقیدە وەك زنجیرێ وایە هەندێکی پەیوەستە بە هەندێکی تریەوە؛ زانستی عەقیدەش بە یەکەوە بەسراوە جا ئەگەر موسوڵمان نەتوانێ لە پوختەی عەقیدەو بیروباوەڕ تێ بگات؛ ئەوا ناتوانێ لە درێژەی باسەکانی عەقیدەو بەشە بەرفراوانەکانی حاڵی بێت.

من لەلایەن خۆمەوە هیچ شتێکم بۆ زیاد نەکردووە؛ تەنها ئەوەندە نەبێ کە ئەوەی پێویست بووە لەسەرم بەیانم کردووەو روونم کردۆتەوە، دەمەوێ ئاگادارتان بکەمەوە لە کۆتایی کتێبەکەدا ئەو سەرچاوانەم نوسیوە کە پشتم پێ بەستوون بۆ دانان و ئامادەکردنی ئەم کتێبی پوختەیە (الوجيز).

لەکۆتایی دا سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە یارمەتی دام بۆ تەواوکردنی ئەم کتێبی پوختەیە (الوجيز)، داوا لە خوای گەورە دەکەم ئەم باس و ئەم هەوڵە مام ناوەندەم ببێتە چاکسازی ئەوەی کە خراپ بووە لە عەقیدەو بیروباوەڕی موسوڵمانانندا، بیکاتە کتێبێ بەهەرەمەند بن لێی و سودی هەبێ بۆیان، ببێتە پاڵنەرێ بۆ گەڕانەوەیان بۆ سەر قورئانەکەی خۆی و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

هەروەها سوپاسی ئەو کەسانەش دەکەم کە فەزڵیان بەسەرمەوەیە یارمەتیاندام بۆ تەواوکردنی ئەم کتێبی پوختەیە (الوجيز)، لە دەربڕینی بۆچونێك، یان پێداچونەوەی و، یا ئامۆژگاری کردنم، لە پێش هەموویانەوە هەردوو زانای بەڕێز و پایەبەرز (شيخ سعود بن إبراهيم الشريم) و (شيخ محمد بن جميل زينو)، کە ئەرکیان کێشا کتێبەکەیان خوێندەوەو پێشەکیان بۆ نوسی خوای گەورە پاداشتیان بەخێر بداتەوە.

ئەم پەرتووکە بریتییە لە هەوڵ و کۆششێکی کەم کە دامناوەو خستومەتە بەردەستی خوێنەرە بەڕێزەکان؛ ئەگەر پێکابێتم و راستم نوسی بوو ئەوە لە خوای گەورەوەیە، خۆ ئەگەر هەڵەشم کردبێت ئەوە لە دەروونی خۆم و لە شەیتانەوەیە، من ئومێدەوارم هەرکەس رەخنەیەکی هەیە یان هەڵەیەکی بینی با لەئامۆژگاری کردنم رژدی و چروکی نەکات و پێم رابگەیەنێت بۆئەوەی راستی بکەمەوە.

داواکارم لە خوای گەورە ئەم کارەم وا لیّ بکات لەبەر رەزامەندی ئەو بیّ و لێم وەربگریّ، سودمەند بیّ بۆ موسوڵمانان و، من بەرائەتی خۆم رادەگەینم لەهەر شتیّ لەم پەرتووکەدا نوسرا بێت پێچەوانەی قورئانەکەی خوای گەورە بیّ یان پێچەوانەی سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بیّ، یا پێچەوانەی تێگەیشتنی پێشینە چاکەکانمان بێت، ئەگەر شتی وەها رویدابیّ ئەوە لەمنەوەیەو بە بیّ مەبەست رویداوەو بە ئەنقەست نەبووە، پاشگەز دەبمەوە لێی و لەژیانمداو لەدوای مردنیشم لێی پەشیمانم، خوای گەورە بۆ خۆی ئاگادارە لەسەر ئەوەی کە دەیڵێم.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

# پێناسە گرنگ و زەروریەکان

## ناساندان و پێناسەی عەقیدە

**عەقیدە لە زمانەوانی دا:**

عەقیدە لە (عقد)ەوە هاتووە واتە: گرێ، گرێدان، بەستن، قایم کردن، پتەوکردن، شەتەکدانی بەهێز، یەکگرتن، لەیەکدان، جێگیرکردن، دڵنیایی و بڕیار لەسەردان.

وشەی (عَقْد)گرێدان دژی (حلّ)ە واتە هەڵوەشاندنەوەیە، دەوترێت: گرێی دا بەگرێدانێکی توندو قایم، هەروەك سوێندخواردن و مارەکردن (نکاح) بەگرێ بەستە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ﴾ سورة المائدة: ٨٩.

واتە: خودا ناتانگرێ و سزاتان نادات لەسەر ئەو سوێنانەی کە دێن بە دەمتاندا و نیازی دڵی لەگەڵدا نی یە، بەڵام لەسەر ئەو سوێنانە دەتان گرێ کە بەنیازی دڵ داتان بەستبێت.

**عەقیدە:** بریتییە لەو حوکم و بڕیارەی کە بە هیچ جۆرێك گومان و دودڵی هەڵناگرێ لەلای ئەو کەسەی کە هەڵگری ئەو بیروبۆچونەیە، واتە جێگەی قبوڵ کردن نیە لەلای ئەو کەسەی کە باوەڕی بەو حوکم و بڕیارە هەیە کە خۆی بیروباوەڕی لەسەری دامەزراوە، عەقیدەش لە دیندا بریتییە لە بیروباوەڕ بەبێ کردار؛ وەك باوەڕبوون بەبوونی خوای گەورەو هەروەها باوەڕبوون بە ناردنی پێغەمبەران.

کۆی عەقیدەش بریتییە لە (عَقائِد)[1] واتە: بیروباوەڕەکان.

کورتەو پوختەی ئەم قسەیە: عەقیدە ئەوەیە کە ئادەمیزاد دڵی دامەزراو بێت لەسەری؛ ئیتر ئەمە عەقیدەیە، جا عەقیدەی هەق بێت یان عەقیدەی پوچ و ناڕەواو درۆ بێت.

عەقیدە لە زاراوەدا:

بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە دڵ بەڕاستیان بزانێ، نەفس ئارام و دڵنیاو ئاسودە بێ لەسەریان، هەتا دەبێتە دڵنیاییەکی دامەزاو، کە بە هیچ جۆرێ گومان و دوودڵی ئاوێتەو تێکەڵاوی نابێت.

واتە: بریتییە لەو ئیمانە تەواو رێکوپێك و دامەزاوە کە گومان و دودڵی ناتوانێ خۆی لەقەرەی ئەو باوەڕو بیروبۆچونە بدات کە کەسی خاوەن باوەڕ بڕوای پێیەتی و باوەڕی لەسەر دامەزراندووە، پێویستە ئەوبیربۆچونە دەقاو دەق گونجاو بێت لەگەڵ واقیعدا، گومان و دوودڵی قبوڵ نەکات، خۆ ئەگەر ئەو زانستە نەگاتە پلەی دڵنیایی دامەزاو ئەوە پێی ناوترێت عەقیدە.

وە بۆیە ناسراوە بە عەقیدە؛ لەبەرئەوەیە ئادەمیزاد دڵەکەی لەسەری گرێ دەدات و جێگیر و دامەزاوی دەکات.

عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامی:

بریتیە لە باوەڕی تەواو و دامەزاو بە پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی و ناوەکانی و سیفەتەکانی خوای گەورە، هەروەها بە مەلائیکەکانی و بە پێغەمبەرانی و بە دواڕۆژو، بە قەزاو قەدەر بە خێر و شەڕ و چاك و خراپییەوە، بەهەموو ئەو کاروبارە

(١) – انظر معاجم اللغة: لسان العرب، القاموس المحيط، المعجم الوسيط: (مادة عقد).

نادیارانەی کە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت سەلمێنراون، بە بنەماکانی دین و، ئەوانەی کە پێشینە چاکەکان یەکدەنگ و کۆن لەسەری، بریتیە لە خۆبەدەستەوەدانی تەواو و تەسلیم بوون بە فەرمان و بڕیارەکانی خوای گەورە و، ملکەچی بۆی و گوێڕایەڵی کردنی، شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم).

عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامی:

هەرکاتێ ئەو ناوە بە رەهایی هات واتە: عەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعە، چونکە تەنها ئەوە ئیسلامی راست و دروستەو خوای گەورە پێی رازیە دینی بەندەکانی بێت، ئەویش بریتیە لەعەقیدەی هەر سێ چەرخ و سەدە گەورەکەی هەوەڵان (صحابە)و شوێنەکەوتوان (تابعین)و شوێنکەوتوانیان بە چاکی.

عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامی:

لەلای ئەهلی سوننەو جەماعە کۆمەڵە ناوێکی تری هەیە: کە هاو واتاو هاوشێوەی عەقیدەی ئیسلامین و بەو مانایە دێن و بەڵگەن لەسەری، لەوانە: یەکخواناسی (التَّوحِید)، سوننە (السُّنَّة)، بنەماکانی دین (أُصُول الدِّین) ، فیقهی گەورە (الفِقهُ الأَکبَر)، شەریعەت (الشَّرِیعَة)، ئیمان (الإِیمَان).

ئەمەی کە باسمان کرد بەناوبانگترین ئەو ناوانە بوون کە لەلایەن ئەهلی سوننەو جەماعەوە بەکاردەهێنرێن بۆ زانستی عەقیدە.

## ناساندن و پێناسەی سەلەف

سەلەف لە زمانەوانی دا:

بریتیە لەوەی کە رابوردوەو پێشکەوتووە، دەوترێت: سەلەف واتە رابورد، سەلەف بریتیە لەو کۆمەڵە کەسەی کە لە رێگەو رۆیشتندا لەپێشەوە بن، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْءَاخِرِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ سورة الزخرف: ٥٥ - ٥٦.

واتە: کاتێ کە فیرعەون و داردەستەکەی تورەیان کردین تۆڵەمان لێ سەندن و هەر هەمویانمان نقوم کردو خنکاندنمان — لەدەریای نیل دا — وکردمانن بە پێشین وە بە نموونە بۆ ئەوانەی کە لەدوای ئەوانەوە دێن.

واتە: کردمانن بە پێشین بە پێشکەوتو بۆ ئەوانەی بەکاروکردەوەی ئەوان رەفتار دەکەن، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ئەوانەی لەدوای ئەوانەوە دێن ئەوان لەبەرچاو بگرن و پەند وەربگرن، هەروەها تا کەسانێ تریش کە دواتر دێن بە هەمان شێوە پەند و ئامۆژگاری و سود وەربگرن.

**سەلەف:** بریتیە لەو کەسانەی کە لەپێش تۆوە رۆیشتون لە باب و باپیران و خزمەکانت ئەوانەی کە لەسەرووی تۆوەن لە تەمەن و گەورەیی و چاکەدا، هەر لەبەرئەوەیە کە سەرەتای ئیسلام و چەرخی یەکەم لە شوێنکەوتوان پێیان دەوترێت سەلەفی صالح.

**سەلەف لە زاراوەدا:**

هەرکاتێ لەلایەن زانایانی بیروباوەڕەوە وشەی سەلەف باسکرا؛ ئەوە پێناسەکانیان بەدەوری موسوڵمانانی هەر سێ چەرخ و سەدە خاوەن فەزڵ و چاکەکەی یەکەمدا دەخولێتەوە لە هاوەڵان و شوێنکەوتوان یان هاوەڵان و شوێنکەوتوان و ئەوانەی شوێن ئەوان کەوتون لە چاکەدا؛ لەوانەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شایەتی بۆ داون کە چاکن؛ موسوڵمانانی ئەو سێ چەرخ و سەدە موبارەکانە چاکترینی ئوممەت بوون بە ڕەهایی؛ چونکە لەناویاندا بوو ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان وپێشەوایانی دین ئەوانەی کە خوای گەورە هەڵی بژاردبوون بۆ هاوڕێیەتی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) و گەیاندنی پەیامەکەی، ئەوانە لە دامەزراوان بوون لە زانیندا، بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕێنمویی کرابوون، پارێزەری سوننەتەکانی بوون و، ڕێ نیشاندەری ڕێی ڕاست بوون، چرای روناککەرەوەی شەوەزەنگ بوون؛ لەپاشدا ئەوانەی کە شوێنیان کەوتن لە زانا دادپەروەرەکانی ئیسلام؛ لە پێشەوا گەورە ڕێ نیشاندەرەکان کە شایەتی پێشەوایەتی و چاکەو شوێنکەوتنی سوننەو پێشەوایەتی کردن و دورکەوتنەوە لە بیدعەیان بۆ دراوە، هەروەها ئەو کەسانەی کە زانایانی ئوممەت ڕێککەوتون لەسەر پێشەوایەتیان و گەورەیی پلەو پایەی بەرزیان لەدیندا.

هەر لەبەر ئەوەیە کە سەرەتای ئیسلام و سەردەمی یەکەم ناسراوە بە سەردەمی پێشینی چاك، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ ﴾ سورة النساء: ١١٥.

واتە: هەرکەسێك دژایەتی پێغەمبەر بکات پاش ئەوەی کە ڕێبازی ڕاستی بۆ ڕوون بوویەوە، شوێنی ڕێگایەکی تر بکەوێ بێجگە لەڕێگای بڕواداران، ڕووی

وەردەگێڕین بۆ ئەو ڕێبازەی کەهەڵی بژاردووەو دەیخەینە دۆزەخ، ئای چ پاشەڕۆژێکی خراپە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ ﴾ سورة التوبة: ١٠٠.

واتە: پێشکەوتووە یەکەمەکان لەکۆچەران و یاریدەدەران ئەوانەش زۆر بە چاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە و شوێنیان کەوتوون خوا لێیان ڕازییە، ئەوانیش لەخوا ڕازین، (خوا) بەهەشتانێکی بۆ ئامادەکردوون کە ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا، تێیدا دەمێننەوە بێ بڕانەوە ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)[1]. واتە: (چاکترین خەڵك خەڵکانی چەرخ و سەردەمی منن مەبەست لە هاوەڵانیەتی، لەپاشدا ئەوانەی کە بەدوای ئەواندا دێن، ئینجا ئەوانەی کە بەدوای ئەواندا دێن)[2].

کەواتە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانیان لە چاکەدا؛ سەلەفی ئەم ئوممەتەن، هەموو ئەوانەی کە بانگەوازیان بۆ ئەوە بێت کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانیان لە چاکەدا

---

(١) - رواه البخاري ومسلم..

(٢) - ئیمام نەوەوی لە راڤەی (صەحیح موسلم)دا لە شەرحی ئەم فەرمودەدا دەڵێت، موغیرە وتویەتی، چەرخ و سەردەمی ئەو واتە هاوەڵانی، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان واتە ئەوەکانیان، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان واتە ئەوەی ئەوەکانیان. بە یەکدەنگی زانایان ئەو سێ چەرخ و سەردەمە چاکترین چەرخ و سەردەم بوون ئەوانەش بریتین لە، ( صحابە)هاوەڵان و (تابعین) شوێنکەوتوان و، (أتباع لا تابعین) شوێنکەوتەی شوێنکەوتوان بە چاکی. وەرگێڕ.

بانگەوازیان بۆ کردووە، ئەوە ئەو کەسە لەسەر ڕێباز و بەرنامەی سەلەفە، واتە سەلەفییە.

کات و ڕۆژگاری دیاریکراو مەرج نیە بۆ ئەو مەبەستە، بەڵکو مەرج ئەوەیە کە عەقیدەو بڕیار و ڕەفتار و کردار بەپێی قورئان و سوننەت بێ بە تێگەیشتنی سەلەف؛ هەرکەسێ کاروکردەوەی هاوڕێك بێ لەگەڵ قورئان و سوننەدا ئەوکەسە لە شوێنکەوتوانی سەلەفە، ئیتر با لەنێوان ئەوان و ئەودا شوێن و کات و ڕۆژگارێکی دوور بێت، ئەوانەی کاروکردەوەیان پێچەوانەی ئەوان بێت ئەوە لەوان نین، با لەناو ئەوانیشدا ژیا بن.

پێشەوای سەلەفی صالح بریتیە لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ﴿٢٩﴾ ﴾ سورة الفتح: ٢٩.

واتە: موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ئەو (باوەڕدار)انەش کەلەگەڵیدان بەرامبەر بێ باوەڕان توندو تیژن و لەنێوان خۆیاندا بە بەزەیین، دەیان بینی (هەمیشە) لە ڕکوع و سەجدە بردندان و داوای بەهرەو ڕەزامەندی خـوادا دەکـەن، نیشـانەیان لــە ناو چاوانیاندا دیارە بەهۆی زۆر سەجدە بردن (یانەوە)، ئەوە نمـوونەیانە لە تەوراتدا، ئەوە نموونەشیان لــە ئینجیلدا، وەك کشــتوکاڵێك وایە چەکەرەی دەرکردبێ (سەوز بووبێ)، ئەنجا چەکەرەکەی بەهێز کرد بێ و قاییم بوو بێ ، جا لەسەر لاسکی خۆی ڕێك وەستابێ (ئەوەندە جوان بێ) جوتیارەکانی سەرسام کرد بێ، تابە (زۆر بوونی) هاوەڵانی داخ و

مەراق بدا بەکافران، خوا بەڵێنی داوە بەوانەیان کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکەیان کردووە بە لێبوردن و پاداشتی گەورە (کە بەهەشتە).

خوای گەورە گوێڕایەڵی بۆ خۆی و گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەرە کەی صلی الله علیه وسلم پێکەوە گرێداوەو نزیک کردۆتەوە، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ﴾ سورة النساء: ٦٩.

واتە: هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بکات جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خوا بەهرەی ڕشتووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان، ئەوانە چ هاوڕێ و هاوەڵێکی چاکن.

خوای گەورە گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بە گوێڕایەڵی کردن بۆ خۆی داناوە، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ ﴾ سورة النساء: ٨٠.

واتە: هەر کەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکات ئەوە بەراستی گوێڕایەڵی خوای کردووە، هەرکەسێکیش پشت هەڵبکات ئەوە ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە بە چاودێر و پارێزەر بەسەریانەوە.

خوای گەورە رایگەیاندووە کە گوێڕایەڵی نەکردنی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) هۆکاری پچڕان و پوچکەرەوەی هەموو کاروکردەوە چاکەکانە هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾ سورة محمد: ٣٣.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە فەرمان بەرداری خواو پێغەمبەربن، کردەوە (چاکە)کانتان هەڵمەوەشێننەوە.

خوای گەورە سەرپێچی فەرمانەکانی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) لێ قەدەغەکردوین، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾ ﴾ سورة النساء: ١٤.

واتە: هەر کەسێك سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات و سنورەکانی (خوا) ببەزێنێت دەیخاتە ئاگرێکەوە هەمیشە دەمێنێتەوە تیایدا، وەسزایەکی ڕیسواکەری بۆ هەیە.

خوای گەورە فەرمانی پێ کردوین ئەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ کردوین وەریبگرین، ئەوەی لێمانی قەدەغەکردووە وازی لێ بێنین، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ﴿٧﴾ ﴾ سورة الحشر: ٧.

واتە: ئەوەی پێغەمبەر پێ ی دان وەریبگرن، ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بێنن، لە خوا بترسن بێگومان خوای گەورە سزای سەختە.

خوای گەورە فەرمانی پێ کردوین پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) بکەینە دادوەر لە هەموو کاروبارێکی ژیانماندا، هەروەها بگەڕێینەوە بۆ بڕیار و فەرمانی ئەو، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ سورة النساء: ٦٥.

واتە: سوێند بەپەروەردگارت بڕوادار نین تاتۆ نەکەنە دادوەر لەهەر ئاژاوە و دووبەرەکیەکی نێوانیان دا، لە پاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بەهیچ بێزارییەك لەو بڕیارەی کە تۆ داوتەو ملکەچ نەکەن بەملکەچیەکی تەواو.

خوای گەورە رونی کردۆتەوە بۆمان؛ بەوەی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بریتیە لە سەرکردەیەکی زۆر چاك و سەرمەشقێکی زۆرر باش و نموونەیەکی زۆر گەورەو جوان و بێ وێنەیە، کە پێویستە شوێن کەوتنی و بیکەینە سەرمەشق و پێشەوای خۆمان، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ سورة الأحزاب: ٢١.

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقی و پێشەوایەتی چاك.

خوای گەورە رازیبوونی خۆی بەڕازیبوونی پێغەمبەرەکەیەوە (صلی الله علیه وسلم) پێکەوە گرێداوەو نزیك کردۆتەوە، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ ﴾ سورة التوبة: ٦٢.

واتە: مونافیق و دووڕووەکان سوێندتان بە خودا بۆ دەخۆن کە شتێکی خراپیان نەوتووە بۆ ئەوە ئێوە رازی بکەن، لەکاتێکدا کە هەق وایە خواو پێغەمبەرەکەی لە خۆیان رازی بکەن، ئەگەر ئەوانە راست دەکەن و ئیماندارن.

خوای گەورە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بە بەڵگە بۆ خۆشویستنی خۆی داناوە، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾ سورة آل عمران: ٣١ – ٣٢.

واتە: ئەی پێغەمبەر! بە ئیمانداران بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێت، شوێنی من بکەون، خوداش ئێوەی خۆشدەوێت و لەگوناهو هەڵەکانتان خۆشدەبێت، ئەو خوایە لێ خۆشبوو میهرەبانە.

لەبەرئەوەیە؛ کە تاکە سەرچاوەیە کە سەلەفی صالح لەکاتی دووبەرەکی و ناکۆکی دا دەگەڕێنەوە سەری، بریتیە لە قورئانەکەی خوای گەورە و سوننەتەکانی پێغەمبەرە ئەمین و دەست پاکەکەی (صلى الله عليه وسلم)؛ هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْۖ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيْرٞ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾ ﴾ سورة النساء: ٥٩.

واتە: ئەی کەسانێك کەباوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن، پاشانیش گوێڕایەڵی کاربەدەستە (عادیلە)کانی خۆتان بن، جا ئەگەر دووبەرەکیتان هەبوو لە شتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی ئەوە باشترە، ئاکام و ئەنجامی چاکترە.

**چاکترین سەلەف؛** لەدوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاوەڵە بەرێزەکانن خوای گەورە رازی بێ لەهەر هەموویان، ئەوانەی کە دینەکەیان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەڕاستی و بەپاکی وەرگرت، لەسەر زانست و، کاریان پێ کرد،،هەروەك خوای گەورە وەسفیان دەکات لە قورئانە مەزنەکەیدا بەم ئایەتە:

﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٖ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلٗا مُّبِينٗا ﴿٣٦﴾ ﴾ سورة الأحزاب: ٣٦.

واتە: بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی موسڵمان نیە کاتێ خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری هەر کارێکیان دا (بۆیان نیە) سەرپشك بن لە کارەکەیاندا، هەرکەس سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بەڕاستی گومڕابووە بە گومڕابونێکی ئاشکرا.

لەپاشدا ئەوانەی کە بەدوای ئەواندا دێن لە چەرخ و سەدە زێڕینەکانی سەرەتادا لە شوێنکەوتوان و ئەوانەی کە شوێن ئەوان کەوتن لەچاکەدا، ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەربارەیان دەفەرموێت:

(أُوصِيكُمْ بِأَصْحَابِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)(١).

واتە: وەسیەتتان بۆ دەکەم بەوەی کە ئاگاتان لە هاوەڵانی من بێ، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن.

هەروەها دەفەرموێت: (خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)(٢).

واتە: (چاکترین خەڵك خەڵکانی چەرخ و سەردەمی منن مەبەست لە هاوەڵانیەتی، لەپاشدا ئەوانەی کە بەدوای ئەواندا دێن، ئینجا ئەوانەی کە بەدوای ئەواندا دێن)(٣).

لەبەرئەوەیە؛ هاوەڵان و شوێنکەوتوانی ئەوان شایستەترن بەوەی شوێنیان بکەوین نەك کەسانی تر، ئەمەش لەبەر راستگۆییان لە باوەڕهێنانیاندا، لە دڵسۆزیان لە پەرستشەکانیاندا، بەڕاستی ئەوان پارێزەری عەقیدەو بیروباوەڕ بوون، پارێزەری شەریعەتی ئیسلام بوون، کاریان پێ کرد بە وتەو بەکردەوە، هەر لەبەرئەوە بوو کە خوای گەورە هەڵی بژاردبوون بۆ بڵاوکردنەوەی دینەکەی و، گەیاندنی سوننەتی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) و شەرعەکەی بە هەموو خەڵك بەگشتی.

---

(١) - صحيح سنن الترمذي للألباني.

(٢) - رواه البخاري ومسلم.

(٣) - ئیمام نەوەوی لە راڤەی (صەحیح موسلم)دا لە شەرحی ئەم فەرمودەدا دەڵێت: موغیرە وتویەتی؛ چەرخ و سەردەمی ئەو واتە هاوەڵانی، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان واتە نەوەکانیان، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان واتە نەوەی نەوەکانیان. بە یەکدەنگی زانایان ئەو سێ چەرخ و سەردەمە چاکترین چەرخ و سەردەم بوون ئەوانەش بریتین لە: (صحابە)هاوەڵان و (تابعین)شوێنکەوتوان و، (اتباع للتابعين) شوێنکەوتەی شوێنکەوتوان بە چاکی. وەرگێڕ.

* لە (عَبْدُاللَّه)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

(تَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً؛ كُلُّهُمْ فِي النَّارِ إِلاَّ مِلَّةً وَاحِدَةً). قَالَ: مَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (مَا أَنَا عَلَيْهِ وَأَصْحَابِي)[1].

واتە: (ئوممەتەکەی من دابەش دەبێت بەسەر حەفتاو سێ پارچەو بەشدا، هەر هەموویان دەبێت بچنە ئاگری دۆزەخەوە تەنها خەڵکانی یەك دەستەو تاقمیان نەبێت)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو دەستەو تاقمە کامەیە؟ فەرمووی: (بریتیە لەوەی کە من و هاوەڵانم لەسەرینی).

وشەی **سەلەفی** بەکاردەهێنرێ بۆ هەموو کەسێ کە شوێن سەلەفی صاڵح کەوتبێ، لەسەر بەرنامەو ڕێبازی ئەوان ڕۆیشتبێ لە سەردەمە جیاوازەکاندا، پیتی (ی) سەلەفی نیسبەیە بۆ لای ئەوان و دەدرێتە پاڵیان و جیاکەرەوەی نێوان ئەوان ئەو کەسانەیە کە جیاوازن و لەسەر بەرنامەو ڕێبازی سەلەف ناڕۆن، شوێن ڕێگەو ڕێبازی جگە لەوان دەکەون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ ﴾ سورة النساء: ١١٥.

واتە: هەرکەسێك دژایەتی پێغەمبەر بکات پاش ئەوەی کە ڕێبازی ڕاستی بۆ ڕوون بوویەوە، شوێنی ڕێگایەکی تر بکەوێ بێجگە لەڕێگای بڕواداران، ڕووی وەردەگێڕین بۆ ئەو ڕێبازەی کەهەڵی بژاردووەو دەیخەینە دۆزەخ، ئای چ پاشەڕۆژێکی خراپە.

بۆ هیچ موسوڵمانێکی ڕاستگۆ نیە لەگەڵ دەرونی خۆیدا کە ڕاست بکات، لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا کە ڕاست بکات ئیللا ئەوە نەبێ کە شانازی بکات بەوەی کە شوێن

(١) - صحيح سنن الترمذي للألباني.

پێشین کەوتووەو بەوەی کە بڵێ من سەلەفیم و ناوی سەلەفی لێ بنرێت، کردەوە کردن بە رێگەو رێباز و رێنمویی ئەوان.

دەربڕینی ئەو شێوازە کە دەوترێت **سەلەف** و دەربڕینی ناوەڕۆکی زاراوەیی و زانستی؛ بووەتە مەشخەڵێکی دیارو ئاشکرا لەسەر رێگەو رێبازی سەلەفی صالح؛ لە وەرگرتنی ئەو ئیسلامە هەق و راستەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هێنای، تێگەیشتنی لەسەر ئەو مەبەستەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەبەستی بوو، جێبەجێ کردنی ئەوە بە گوفتار و بەکردارو بەبیروباوەڕ.

هەر ئا لەوەوە؛ چەمکی سەلەفیەت؛ لەو موسوڵمانانە دەنرێت کە پابەندن بە قورئانەکەی خواو، بەو سوننەتانەوە کە لە پێغەمبەرەکەیەوە (صلى الله عليه وسلم) سەلمێنراون و صەحیحن بە پابەندبونێکی تەواو بە راستگۆیی، زۆر بەڕوونی، بە ئاشکرا و بە نهێنی، پەیوەستن بە سەلەفی صاڵحەوە لە خەڵکانی هەر سێ سەدە چاك و زێڕینەکەی سەرەتای هاتنی ئیسلام پێوەی پەیوەست بوون، ئەوانەی کە هیچ شتێکیان لە دیندا دانەهێناو هیچ شتێکیان لێ زیادو کەم نەکرد، ئەوانەی کە گەردەلولی هەواو هەوەس و فیتنەو بەڵاو گومڕایی نەیهەژاندن و نەیخستن بەم لاو لادا هەتا ئەو کاتەی کە خوای گەورە و کاربەجێ زەوی و ئەوەی لەسەریەتی بە میرات دەگرێ، ئەوانەی کە سوربوون لەسەر ئەوەی کە حاڵ و کاروباری ژیانیان لەسەر ئەو حاڵەت و بارودۆخە بێت کە سەلەفی صالح لەسەری بوون.

## ناساندن و پێناسەی ئەهلی سوننەو جەماعە

سوننە لە زمانەوانیدا، داتاشراوە یان وەرگیراوە لە: (سَنَّ يَسِنُّ) دایناوە، دایدەنێ ڕێگەو ڕێبازێك، (وَيَسُنُّ سَنًّا) پەیڕەوکراو دانراو، (فَهُوَ مَسنُونٌ) هەر ڕێگەو ڕێبازێ دابنرێ ئەوە (مَسنُونٌ).

(وسَنَّ الأمرَ): واتە: ڕونیکردۆتەوە.

(السُنَّة): بریتیە لە ڕێگەو ڕێبازێ، جا ئیتر چاك و پەسەند بێ یان خراپ و ناپەسەند، هەروەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەم فەرمودەدا باسی ئەوە دەکات دەفەرمووێت: (لَتَتَّبِعُنَّ سُنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، شِبْرًا بِشِبْرٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ)[١].

واتە: سوێند بە (الله) ئێوە بست بە بست و باڵ بە باڵ شوێن ڕێگەو ڕێبازێ ئەوانە دەکەون کە لەپێش ئێوەوە بوون واتە جولەکەو گاورەکان.

واتە: ڕێگەو ڕێبازیان لە دین و لە دونیادا.

هەروەها فەرمودەکەی (صلى الله عليه وسلم): (مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ)[٢].

واتە: هەرکەسێ لە ئیسلامدا ڕێبازێکی چاك دابهێنێ خەڵك کاری پێ بکەن؛ بە ئەندازەی خێر و پاداشتی ئەو کەسانەی کاری پێ دەکەن خێر و پاداشتی بۆ دەنوسرێت؛ بەبێ ئەوە هیچ لە خێر و پاداشتی ئەوان کەم بکاتەوە، هەرکەسێ لە ئیسلامدا ڕێبازێکی خراپ دابهێنێ خەڵك ڕەفتاری پێ بکەن؛ بە ئەندازەی ئەوانەی کاری پێ دەکەن گوناهی بۆ دەنوسرێت؛ بەبێ ئەوە هیچ لە گوناهی ئەوان کەم بکاتەوە[٣].

---

(١) – رواه البخاري ومسلم.

(٢) – رواه مسلم.

(٣) – انظر معاجم اللغة: لسان العرب، مختار الصحاح، القاموس المحيط: مادة : (سَنَن).

هەموو کەسێ لەسەرەتاوە کارێ بکات خەڵکانێکی تر کار بەو کارەی بکەن وتراوە: ئەوە پێی دەوترێت: (سُنة) سوننە.

سوننە لە زاراوەدا:

بریتیە لەو رێنمایی و رێبازەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی لەسەری بوون بە زانستەوە، بە بیروباوەڕێکی تەواو پاکەوە، بە وتەی جوانەوە، بە کردەوەی رێکوپێکەوە، بە دانپێدانانێکی تەواوە، هەروەها کە دەوترێت سوننە بەکاردەهێنرێت بۆ سوننەتەکانی پەرستشەکان و بیروباوەڕەکان.

بەرامبەر بە سوننەت: بیدعەیە واتە بیدعە دژی سوننەتە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ بَعْدِي الرَّاشِدِينَ)(١).

واتە: هەرکەسێك لەئێوە لەدوای من بژی ئەوا جیاوازییەکی زۆر دەبینێت، بۆیە ئامۆژگاریتان دەکەم دەست بگرن بە سوننەتەکانی من و خەلیفە رێنموییکراو شارەزاو تێگەیشتو راستەکانمەوە.

جەماعە لە زمانەوانیدا:

کۆمەڵ (جەماعە) وەرگیراوە لە (جمع)، بریتیە لە کۆکردنەوەی شتێك؛ بەنزیکردنەوە هەندێکی لە هەندێکی تری، دەووترێت: کۆمکردەوە؛ کۆبووەوە.

(جەماعە) وەرگیراوە لە (الإجتماع) کۆبوونەوە، کۆبوونەوەش دژی پارچە پارچەگەرێتی جیایی و دەستە دەستەییە.

(١) - صحيح سنن الترمذي للألباني.

**جەماعە:** بریتیە لە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك، هەروەها بریتیە لە کۆمەڵێ لە خەڵك کە یەك مەبەست کۆیکردونەتەوە.

جەماعە: بریتین لە کەسانێ لەسەر کار و ئامانجێ کۆبونەتەوە[1].

**جەماعە لە زاراوەدا:**

بریتیە لە کۆمەڵی موسوڵمانان، ئەوانە سەلەفی ئەم گەلە موسوڵمانە موبارەکەن کە خوای گەورە روحمی پێ کردون لە هاوەڵە بەڕێزەکان و شوێنکەوتووە پایە بەرزەکان گەورەکان و، ئەوانەی کە شوێنیان کەوتون لە پێشەوا پایە بەرزەکان بەڕاستگۆیی و دڵسۆزی پاکی و چاکی هەتا رۆژی دوایی؛ ئەوانەی کە کۆبونەتەوە لەسەر قورئان و سوننەت، رۆیشتون لەسەر ئەو رێگەو رێبازە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسەری بووە، بیروباوەڕ و زانست و کاروکردەوەی ئاشکراو نهێنیان بەو شێوەیە بووە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ کردووە یان پێی خۆش بووە.

خوای گەورە فەرمانی کردووە بە بەندە باوەڕدارەکانی و، هانی داون لەسەر ئەوەی کە پێکەوەبن و یەك کۆمەڵ بن و یەکگرتوبن و هاوکاری یەکتر بکەن، هەروەها خوای گەورە هۆشیاری کردونەتەوەو نەهی کردووە لەوەی کە دەستە دەستە بن و دووبەرەکی و ناکۆکی بکەوێتە نێوانیانەوەو لەگەردنی یەکتر بدەن، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴾. سورة آل عمران: ١٠٣.

واتە: هەر هەمووتان بە توندی دەست بگرن بەدینی خواوەو پەرت و بڵاو مەبن.

---

(١) – انظر معاجم اللغة: لسان العرب، مختار الصحاح، القاموس المحيط: مادة : (جمع).

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ سورة آل عمران: ١٠٥

واتە: بەوێنەی ئەوانە مەبن کە بەش بەش و جیاواز بوون لەپاش ئەو بەڵگانەی بۆیان هات، ئەوانە سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (إنَّ هَذِهِ الْمِلَّةَ سَتَفترِقُ عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ، ثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ، وَوَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ، وَهِيَ: الجَمَاعَةُ)(١).

واتە: (ئەم ئوممەتەی من دابەش دەبێت بەسەر حەفتاو سێ پارچەو بەشدا، حەفتاو دوو بەشیان دەچنە ناو ئاگری جەهەننەمەوە، تەنها یەکێ لەو حەفتاو سێ بەشە دەچێتە بەهەشتەوە، کە ئەوەش بریتیە لە جەماعە.

هەروەها دەفەرموێت: (علَيْكمْ بالجماعَةِ، وإيَّاكمْ والفرْقَةَ، فإنَّ الشَّيْطانَ مَعَ الوَاحِدِ، وهُوَ مَعَ الاثْنَيْنِ أبْعَدُ، مَنْ أرَادَ بحْبُوحَةَ الجَنَّةِ؛ فلْيَلْزَم الجماعَةَ)(٢).

واتە: وریابن و دەستبگرن بە جەماعەوەو لێی دانەبڕێن، ئاگادارین لە دەستە دەستەیی و پارچە پارچەیی و جیایی چونکە بێگومان شەیتان لەیەك کەس نزیکترە هەتا دوان کە بوون بەدوان زیاتر دوور دەکەوێتەوە، ئەوەی دەیەوێ بچێتە ناوەڕاستی بەهەشتەوە با پەیوەست بێ بە جەماعەوە.

هاوەڵی بەڕێز (عَبْدُ اللَّهِ)ی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (الجَمَاعَةُ مَا وَافَقَ الحَقَّ، وَإِن كُنْتَ وَحْدَكَ)(٣).

واتە: جەماعە بریتیە لەوەی کە هاوڕێك بێ لەگەڵ هەقدا، با بەتەنیاش بیت).

---

(١) – صحيح سنن أبي داود للألباني، في "السلسلة الصحيحة" ١ / ٣٥٨.

(٢) – رواه الإمام احمد في مسنده وصححه الآلباني في كتاب السنة لإبن عاصم – تحقيق الألباني: صحيح، ابن ماجة ( ٢٣٦٣ ) – .

(٣) – أخرجه اللالكائي في: ( شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

بریتین لەو کەسانەی کە دەستیان گرتووە بە رێگەو رێباز و سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، لەوانەی شوێنی کەوتون لە هاوەڵە بەرێزەکانی، لەوانەی کە شوێن هاوەڵە بەرێزەکان کەوتون کە بریتین لە تابعین، هەروەها لەوانەی کە شوێن تابعین کەوتووە رێنمویی کراوە بە رێنمویی ئەوان و رێگەو رێبازی ئەوانی گرتۆتەبەر لە بیروباوەڕدا، لە وتەو گوفتار و کرداردا، ئەوانەی کە دامەزراو و بەردەوامبون لەسەر شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت و دوورکەوتبونەوە لە بیدعە و داهێنان لە دیندا، ئەهلی سوننە جەماعە ماون دیارن سەرخراون هەتا رۆژی دوایی؛ شوێنکەوتنی ئەوانە رێنمویی و هیدایەتە، سەرپێچی کردنی ئەوانە گومڕایەتیە.

**ئەهلی سوننەو جەماعە:**

ئەهلی سوننەو جەماعە بەم چەند سیفەت و تایبەتمەندیە لە دەستەو تاقمەکانی تر جیادەکرێنەوە:

١- ئەوان واتە ئەهلی سوننەو جەماعە بریتین لەو کۆمەڵەی کە ناوەندێتیان گرتووەو و مام ناوەندن، لەنێوان رۆچوون و کەمتەرخەمی و گوێ پێ نەداندا، ئیتر لە بیروباوەڕدا بێت یان لە ئەحکامەکان و خورەوشت و رەفتاردا بێت، ئەوانە لەنێوان دەستەو تاقمەکانی ئوممەتدا مام ناوەندن، وەك چۆن ئوممەتی ئیسلام مام ناوەندن لەنێوان گەلاندا.

٢- دەقەکانی قورئان و سوننە بە گەورەڕادەگرن، ئەگەر بیانەوێ بەڵگە وەرگرن لەسەر کارێك ئەوا لەو دوو سەرچاوەوە وەردەگرن کە بریتین لە قورئان و سوننە، زۆر گرنگیان پێی دەدەن، بە رەهایی خۆیان تەسلیمی دەقەکانیان

دەکەن، پێشنی چاك چۆن لێی تێگەیشتبون ئەوانیش بەو شێوەیە لێی تێ دەگەن.

٣- هیچ پێشەوایەکی گەورەو پایە بەرزیان نیە جگە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، هەموو قسەیەکی لێ وەردەگرن و وازدەهێن لەو قسانەی کە پێچەوانەی قسەکانی ئەون؛ ئەوانە زاناترین کەسن بە ئەحواڵ و کاروباری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و فەرمودەکان و فەرمایشتەکانی و کردەوەکانی و ژیانی؛ هەر لەبەر ئەوەیە توندترین کەسن بۆ خۆشویستنی سونەت و لەهەموو کەس زیاتر خۆشەویستیان بۆی هەیە، زۆر سورن لەسەر شوێنکەوتنی سوننە، لەهەموو کەس زیاتر ئەهلی سوننەیان خۆش دەوێ.

٤- وازیان هێناوە لە دووبەرەکی و دەمە دەمێ لە دیندا، دوردەکەونەوە لەو کەسانەی کە ئەهلی دەمە دەمێ و موناقەشەن، وازیان هێناوە لە دەمە دەمێ و موناقەشە لەسەر باسەکانی حەڵاڵ و حەرام، هەموو دین وەردەگرن و پەیڕەوی لێ دەکەن.

٥- پێشینە چاکەکان و پێشەوایانیان بە گەورەڕادەگرن، قەناعەت و بیروبۆچونیان وایە کە ڕێگەو ڕێباز و بەرنامەی سەلەف؛ زۆر پارێزراو تر سالم تر و تەواوتر و چاکتر و تۆکمە تر و پتەوترە.

٦- (تأویل الکلامي) ڕەت دەکەنەوە واتە لێکدانەوە بە بیروبۆچونی خۆیان — ئەوەی کە دەڵێن ئەهلی کەلام  ئاوا دەڵێن ئا ئەوە ڕەت دەکەنەوە — ، تەسلیمی شەرع دەبن بە تەواوی، لەگەڵ ئەوەشدا نەقڵ پێش عەقڵ دەخەن، عەقڵ ملکەچی نەقڵ دەکەن.

٧- ئەگەر بڕیارێ دەرکەن ناڵێن هەمووی وایە کوێرانە بڕیار نادەن، ئەگەر کێشەو مەسئەلەیەکیان بێتە بەردەم هەموو دەقە شەرعیەکان کۆدەکەنەوە، دەربارەی، ئەو شتانەی کە لێکچون (متشابە) دەیگێڕنەوە بۆ ئەو شتانەی کە

پتەو(محکم)ن، ئەو شتانەی کە (مجمل)ن واتە بە کورتی باسکراون دەگێڕنەوە بۆ ئەو شتانەی کە بە درێژی باسکراون، ئەو شتانەی کە بە (مطلق)رەهایی باسکراون دەیگێڕنەوە بۆ ئەو شتانەی کە (مقید)بەسراوە بە شتێکەوە، ئا بەوە پارێزراون لەوەی کە خۆیان خۆیان هەڵوەشێننەوە، هەر بەوە گەیشتون بە حەق و راستی.

٨- بەڕاستی ئەهلی سوننەو جەماعە سەرمەشق و پێشەنگی پیاو چاکانن؛ ئەوانەی کە رێنمویی خەڵك دەکەن بۆ حەق و راستی، نیشاندەری رێگەی راستن؛ ئەوەشیان بەوە بەدەستهێناوە کە جێگیرن لەسەر حەق و راستی، هەڵناگەڕێنەوە لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر، عەقیدەو بیروباوەڕیان رێکە لەهەر کوێ بن عەقیدەو بیروباوەڕیان هەر یەکە، نێوانی زانست و پەرستش کۆدەکەنەوە زانست وەردەگرن بۆئەوەی لەسەر ئەو زانستە پەرستش ئەنجام بدەن، پشت بە خوای گەورە دەبەستن بەتەواوی بەڵام واز لە هۆکارەکانیش ناهێنن – ئەگەر نەخۆش کەوتن دەچنە لای دوکتۆر – ، نێوانی فراوانی خۆشیەکانی دونیاو بەکەمزانینی کۆدەکەنەوە – هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی دەوڵەمەند بن بەڵام بە حەڵاڵی – ، نێوانی ترس و هیواو ئومێد کۆدەکەنەوە – هیواو ئومێدیان بە خوای گەورە هەیەو لێش دەترسن – ، نێوانی خۆشەویستی و رق لێ بوون کۆدەکەنەوە – هەموو کەسیان خۆش ناوێ و رقیشیان لە هەموو کەس نیە – ، نێوانی سۆز و بەزەیی و نەرمونیانی بەرامبەر بە باوەڕداران و، توندی سەختگیری و دڵڕەقی بەرامبەر بە بێ باوەڕان – بەرامبەر بە باوەڕداران بە بەزەیی و نەرمونیانن، بەرامبەر بە بێ باوەڕانیش دڵڕەق توندو تیژن – ؛ ئەگەر کات و شوێن گۆڕانکاریان تێدا رویدا ئەوان گۆڕانکاریان تێدا رونادات.

٩- هیچ ناوێ لەخۆیان نانێن جگە لە ئیسلام و ئەهلی سوننەو جەماعە.

١٠- زۆر سورن لەسەر بڵاوكردنەوەی دینی ئیسلام و بیروباوەڕی ڕاست و دروست، فێركردنی خەڵك و ڕێنمایی كردنیان، سورن لەسەر پێشكەشكردنی ئامۆژگاری بۆیان، هەوڵ دەدەن گرنگی بدەن بە كاروباریان.

١١- بەڕاستی ئەهلی سوننەو جەماعە لەهەموو كەس زیاتر ئارامگرن لەسەر وتەكانیان و عەقیدە و بیروباوەڕیان و بانگەوازیان.

١٢- زۆر سورن لەسەر دەستگرتن بە جەماعەت كۆمەڵی موسوڵمانان هەوڵی پارچە پارچەیی نادەن، دڵیان هەمیشە وابەستەی یەكە دژی یەك نین، بانگەوازیان هەر بۆ ئەوەیەو، خەڵك هاندەدەن بۆ دەستگرتن بە جەماعەوە، زۆر دورن لە هەموو جیایی و دەستە دەستەیی و دابەشبونێك، خەڵك ئاگاداردەكەنەوە لەو دەستەو تاقمانە.

١٣- خوای گەورە ئەهلی سوننەو جەماعە پاراستوە لەوەی كە (تەكفیر)ی یەكتری بكەن و یەكتر بە بیدعەچی و لەڕێ دەرچوو لەقەڵەم بدەن، ئەوانە لەهەموو كەس زیاتر تێگەیشتون و شارەزای ئەحكامەكانی شەرعن، ئەگەر حوكم دەركەن بەسەر كەسێكی غەیری خۆیاندا بەزانست و بە دادپەروەری و بە ویژدانەوە حوكمی دەدەن.

١٤- ئەهلی سوننەو جەماعە خۆشەویستی و سۆزو بەزەییان بەرامبەر بە یەكتر بە دینداری دەزانن، هەندێكیان دەپارێنەوە بۆ هەندێكی تریان، زۆر بەرگری لەیەكتر دەكەن، كەموكوڕی و نەنگی یەكتری دەشارنەوەو ڕێگری لێ دەكەن بۆ ئەوەی تەشەنە نەكات، خۆشەویستی و دۆستایەتیان تەنها لەسەر بنچینەو بناغەی دینە.

بەكورتی: بەڕاستی ئەهلی سوننەو جەماعە لەناو خەڵكدا چاكترین كەسن لەڕووی ڕەوشت و ئاكاری جوانەوە، زۆر سورن لەسەر خاوێنكردنەوەی كردنەوەی نەفسیان بە تاعەت و گوێڕایەڵی خوای گەورە، زۆر بە بەرفراوانی بیر دەكەنەوە

**تەسك بین نین، زۆر دووربینن، سنگیان زۆر فراوانە بۆ خیلاف، شارازاترین کەس بە ئادابەکان و بنەماکانی خیلاف ئەهلی سوننەو جەماعەن.**

**پوختەی قسە لە تێگەیشتنمان بۆ ئەهلی سوننەو جەماعە:**

ئەوانەن کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەڵێنی پێ داون رزگاردەبن لە دوارۆژدا لەناو دەستەو تاقمەکاندا، خولگەی ئەم وەسفەش لەبەر ئەوەیە کە شوێنکەوتەی سوننەن، رێکن لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی لە عەقیدەو بیروباوەڕ و پەرستش و رێگەو رێباز رێنمایی و رەفتار و رەوشت و ئاکاری جوان، پابەندن بە کۆمەڵی موسوڵمانانەوە.

**بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە پێناسەی ئەهلی سوننەو جەماعە لە چوارچێوەی پێناسەی سەلەف دەرناچێت و جیاوازییان نیە،** پێشتر زانیمان کە سەلەف ئەوانەن کاروکردەوە بە قورئان دەکەن و، دەستدەگرن بە سوننەتەوە؛ کەواتە سەلەف ئەهلی سوننەن، ئەوانەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باسی کردون مەبەستی لێیان بووە، ئەهلی سوننە هەر ئەوانن پێشینە چاکەکان، ئەوانەش کە لەسەر بەرنامەو رێگەو رێبازی ئەوان دەڕۆن.

**ئەمە تایبەتترین مانای ئەهلی سوننەو جەماعەیە؛** هەموو کۆمەڵە بیدعەچیەکان و ئەهلی هەواو ئارەزوو لەم مانایە بەدەرن و ئەم مانایە نایانگرێتەوە وەك: (خوارج) و (جهمیة) و (قدریة) و (معتزلة) و (مرجئة) و (رافضة)و جگە لەمانەش لە ئەهلی بیدعە ئەوانەی کە رێگەی ئەوان دەگرنەبەر.

کەواتە سوننە لێرەدا بەرامبەر بە بیدعەیە، جەماعە بەرامبەر بە دەستە دەستەیی و پارچە پارچەییە، ئەوەش مەبەست لێیەتی واتە مەبەست بوون لەو فەرمودانەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی لەوبارەوە دەستگرتن بە کۆمەڵی موسوڵمانانەوەو، قەدەغەدەکردنی دەستە دەستەیی و پارچە پارچەیی.

ئا ئەمەش ئەوەیە کە تەرجومانی قورئان (عَبْدُالله)ی کوڕی عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ باسی لێ کردووەو مەبەستی لێی بووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴾ سورة آل عمران: ١٠٦. واتە: لەو ڕۆژەدا (واتە لە ڕۆژی دوایی دا) هەندێ ڕوخسار سپی دەبێ و هەندێکیش ڕەش.

(تبيضّ وجوهٌ) **ئەهلی سوننەو جەماعەن**، (وتسودّ وجوهٌ) **ئەهلی بیدعەو جیایی و دەستە دەستەییە**[1].

دەربڕینی گۆی (**سەلەفی صالح**) هاو واتای زاراوەی ئەهلی سوننەو جەماعەیە؛ وەك چۆن ئەم ناوانەیان لێ ناوە: (أهل الأثر) **ئەهلی** ئەسەر، (أهل الحديث) **ئەهلی** فەرموودە، (الطائفة المنصورة) کۆمەڵی ڕزگاربوو، (الفرقة الناجية) دەستەو تاقمی ڕزگاربوو، (أهل الاتباع) **ئەهلی شوێنکەوتەی قورئان و سوننە**، (الغرباء).

هەموو ئەم ناو لێ نانە لەلای زانایانی پێشینەوە بەربڵاو بووە.

---

(١) – انظر: « تفسير ابن كثير » ج ١، ص ٣٩٠، والآية : ١٠٦ من سورة آل عمران .

## تایبەتمەندیەکانی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە

## بۆچی بیروباوەڕی پێشینی چاکەکان لەپێشترە بۆ شوێنکەوتن؟!

بەڕاستی عەقیدەو بیروباوەڕی راست و دروست بناغەی ئەم دینەیە، بەڕاستی هەموو زانست و شارەزاییەکانی لەسەر بونیاد دەنرێت؛ ئەوکەسەی کە عەقیدەکەی راست و دروست بێ کردەوەکانیشی راست و دروست دەبن، هەرکەسێ عەقیدەو بیروباوەڕی خراپ و پوچەڵ بێ کاروکردەوەکانیشی خراپ و پوچەڵ دەبێت، هەموو کارێك لەسەر ئەم بنچینە پتەوە بونیاد دەنرێت ئەوە سەرەنجامەکەی بەرەو نوشوستی و رووخاندن و تیاچونە.

هەوەها عەقیدەو بیروباوەڕ راست و دامەزراو لەدڵی هەر بەندەیەکی باوەڕداردا؛ بریتیە لە بزوێنەرێ کە نزیکی دەکاتەوە لە خوای گەورە، دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی دۆستایەتی کردنی خوای گەورە و رەزامەندی، عەقیدەو بیروباوەڕ راست و دامەزراو قەڵایەکی پۆڵاینە باوەڕدار خۆیپێ دەپارێزێ لە فێڵ و تەڵەکەی دوژمنانی لە شەیتانەکانی ئادەمیزادو جنۆکە، بنچینەکانی ئەم عەقیدەو بیروباوەڕەش بریتیە لە:

**زانستێکی راست و دروستە هەڵگیزراوە لە هەردوو وەحیە شکۆدار و بەڕێزەکە کە بریتین لە قورئان و سوننە، هەروەها باوەڕبوون بە نادیار(غیب)، باوەڕ نەبوون بە شەیتان و بتەکان و لەڕێ دەرچووان و ستەمکاران، هەستان بەگوێرەی ئەوەی کە شەرع داوای کردووە، ئیخلاص بۆ خوای گەورە لە پەرستنشدا، راستگۆیی لە شوێنکەوتنی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم).**

ئا لەوەوەیە ئێمە دەبینین گرنگیدانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەڕواندن و جێگیرکردن و دامەزراندنی ئەم بیروباوەڕە لەدڵی هاوەڵە بەڕێزەکانیدا، پەروەردەکردنی هاوەڵەکانی لەسەری بەدرێژایی تەمەنی (صلى الله عليه وسلم)، ئەمەش لەپێناو ئەوەدا بوو کۆمەڵە پیاوێ دروست بکات لەسەر بناغەو بنچینەیەکی پتەو، بە بەردەوامی سیانزە ساڵ لە مەککە بۆ یەك مەبەست قورئان دادەبەزی، ئەویش باسی عەقیدە بوو، هۆشیاریدان بوو بەرامبەر بە هاوبەش بۆ خوا دانان بە

هەموو جۆرەکانیەوە، لە پێناوی ئەمەدا بوو لە مەککە هیچ بانگەوازێکی نەدەکرد تەنها بۆ عەقیدە نەبێ، هاوەڵە بەرێزەکانی پەروەردە دەکرد لەسەر عەقیدە؛ لەبەرئەوە مەبەستی هەرە گەورە لەدروستکردنی ئادەمیزادو جنۆکە، ناردنی پێغەمبەران، ناردنەخوارەوەی پەرتووکە ئاسمانیەکان یەکخواناسینە لە پەرستشەکاندا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ سورة الذاريات: ٥٦.

واتە: من هەر بۆیە جنۆکەو ئادەمیم دروستکردووە بم ناسن و بم پەرستن.

ئا لێرەوە پێویستە لەسەر هەموو بانگخوازانی ئیسلام یەکەمجار بانگەشە بۆ عەقیدەی ئیسلامی بکەن، پێش هەموو شتێ هەوڵ بدەن بۆ چاکسازی عەقیدەی موسوڵمانان، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾ سورة النحل: ٣٦.

واتە: سوێند بەخوا لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە، بەمەی تەنها خوا بپەرستن و دوورکەونەوە لە(پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر.

گرنگی خوێندن و توێژینەوەی عەقیدەی سەلەفی صالح دەگەرێتەوە بۆ گرنگێتی رونکردنەوەی عەقیدەی پێغەمبەرایەتی، زۆر پێویستی بەوردی کارکردن لە پێناو گەرانەوەی موسوڵمانان بۆ سەر ئەو عەقیدە پاکە بە دڵ و بە گیان، پێویستە لەسەر بانگخوازانی ئیسلام موسوڵمانان رزگاربکەن لە گومراییەکانی دەستەو تاقمەکان و بیدعەکانیان ئەوەی کە دایانهێناوە لەدیندا، رزگاریان بکەن لە جیاوازی و ناکۆکی کۆمەڵە جیاوازەکان هەواو ئارەزووەکانیان و پەرت و بڵاویان و ئەو حیزبایەتیەی کە دایانناوە.

**عەقیدە لەسەر بەرنامە و ڕێگەی سەلەفی صالح:**

ئەو عەقیدەیە کۆمەڵێ سیفەت و تایبەتمەندی تاك و بێ وێنەی هەیە کە بەهاو نرخەکەی ڕون دەکاتەوە لەگەڵ زەرورەتی دەستگرتن پێوەی و، کارکردن بە ئەحکامەکانی، لە گرنگترینیان ئەمانەن:

**یەکەم: پارێزراویەتی سەرچاوەی وەرگرتن:**

هەڵگۆزراوەو وەرگیراوە لەسەرچاوەی پاك و ڕوونی قورئان و سوننە، لە یەکدەنگی سەلەفی صالح و، ئەوانەی کە شوێنیان ئەوان کەوتوون لەچاکەدا لە پێشەوا تێکۆشەرە شەرعناسە پایەبەرزەکان، کە ئەوەش بریتیە لە شوێنکەوتنی ڕێگەو ڕێباز و بەرنامەی ئەوان، تێگەیشتنی ئەوان لە دین.

**دووەم: گەیاندنی ڕشتە (سند) بە خواو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم):**

ڕاستەخۆ موسوڵمان دەبەستێتەوە بە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەیەوە (صلی الله علیه وسلم)، بە خۆشەویستی و بەگەورەدانانی ئەو دوانەوە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی، بە دەستپێشخەری نەکردنی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی، واتە لە هیچ کارو بڕیارێکدا پێشیان ناکەون؛ ئەویش لەبەرئەوەیە کە سەرچاوەکەی: خوای گەورە دەفەرموێت و، پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت؛ بەدوور لەوەی کە هەواو ئارەزوو ئەو شوبوهات و گومانانەی کە بۆی دروست دەبێت یاری پێ بکەن، زۆر دورەو خاڵیە لەوەی کە کارتێکەرە بیانی و دەرەکیەکان کاریگەری لێ بکەن وەك: فەلسەفەو، ژیربێژی (منطق)و، عەقڵانیەت؛ ئەوان هیچ سەرچاوەیەکیان نیە جگە لە قورئان و سوننە و یەکدەنگی زانایان.

**سێیەم: شیعاریان تەسلیم بوونی تەواوە بۆ خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم):**

ئائەوە بونیاد نراوەو راوستاوە لەسەر تەسلیم بوونی تەواو بۆ خوای گەورەو لەگەڵ بۆ پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) لەهەموو کارێکدا ئیتر گەورە بێت یان بچوکدا، لەگەڵ بەراست دانانێکی تەواو لەگەڵ بە دانپێدانانێکی تەواو بە حوکم و بڕیارەکانیاندا؛ لەبەرئەوە باوەڕبوون بە نادیار (غیب) بریتیە لە بنچینەی تەسلیم بوونی تەواو بۆ هەموو فەرمانەکان و قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم).

**چوارەم: روونێتی و ئاشکرایەتی و ئاسانیەتی و ئاسانکردن:**

ڕێگەو ڕێبازی سەلەفی صالح هیچ گومان دودڵی تێدا نیە، هیچ لێڵی و تاریکی تێدا نیە، هیچ دژایەتییەکی تێدا نیە، زۆر دوورە لە ئاڵۆزی، زۆر دوورە لە گۆڕینی دەقەکان، دەربڕینەکانی دیار و ئاشکرایە، ئەگەر دەروونی ساغ و سەلیم بێت ئەوا رادەکات بۆ لای، خۆ ئەگەر ئەوەشی نەفسی نەخۆش بێت ئەوا لێی رادەکات، ئەو کەسەی قەناعەت و بڕوای پێیەتی دەروونی ئارام و زۆر ئاسودەیە خۆشحاڵ و دڵشادە، دوورە لە شك و گومان و دوودڵی و وەهم و رارایی و ترس و دڵەڕاوکێ و وەسوەسەی شەیتان، هەمیشە شادن، ئەو کەسەی ئەم رەوشتە جوانانەی هەیە بۆیە بەو شێوەیە چونکە رۆیشتوە لەسەر رێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی و ئەوانەی کە شوێن ئەوان کەوتوون لە پێشەواو زانا پایەبەرزەکان.

**پێنجەم: یەکخواناسیی (التوحید) کۆمەڵ بوون( جماعه)و کۆبونەوە (الإجتماع) و سەرکەوتن:**

بەڕاستی عەقیدە حەبلی خوای گەورەیە کە زۆر پتەوە، ڕێگەی خوای پەروەردگارە کەزۆر بەهێزە، ڕێگە راستەکەیەتی، چونکە عەقیدەی یەکتاپەرستیە بە پاك و خاوێنی بەرون و ئاشکرا، دوورە پەرێزە لە هەموو هاوبەش بۆ خوا دانان و بیدعە بە هەموو جۆرەکانیەوە، ئا بەم عەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعەیە، بەکاروکردەوە پێی، بە بانگەوازکردن بۆی، ریزەکانی موسوڵمانان پتەو و بەهێز دەبن و یەکدەگرن، هەر هەموویان یەك قسەیان دەبێت، هەرکەس وابوو لەپاشدا سەردەکەوێ دەسەڵاتی دەست دەکەوێ و بە شەرعی خوا حوکم دەکات، بەڕاستی مێژوی ئیسلام چاکترین شاهیدە لەسەر ئەو راستیە؛ چونکە وەڵامدانەوەیەکی راستگۆیانەیە بۆ ئەم ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت:

﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ ﴾ سورة آل عمران: ١٠٣.

واتە: هەر هەمووتان بە توندی دەست بگرن بەدینی خواوەو پەرت و بڵاو مەبن.

هەموو کۆمەڵ و کۆڕ و کۆبوونەوەیە لەسەر غەیری ئەم عەقیدەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) سەرەنجامەکەی ئەمەیە کە ئەمڕۆ بە چاوی خۆمان دەیبینین لە حاڵی موسوڵمانان کە دەستە دەستەن و پەرتەوازەن و ناکۆکن و بەزیون و توشی نوشوستی بوون و هەڵوەشاوەن.

**شەشەم: مانەوەو جێگیربون لەسەر بارودۆخێك و گشتگیری:**

لە گرینگترین تایبەتمەندیەکانی ئەم عەقیدە موبارەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)؛ مانەوەیە لەسەر ئەو شتەی کە لەسەری بووە، جێگیربونە لەسەر ئەو شتەی کە لەسەری بووە، سەقامگیر و نەگۆڕە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، ڕێککەوتن، گشتگیریەتی، پارێزراویەتی واتە پارێزراوە؛ بەڕاستی عەقیدەیەکی دامەزراو و جێگیر و سەقامگیرو پارێزراوە؛ (روایة ودرایة): (روایة) واتە چۆن گێڕراوەتەوە هەر بەوشێوەیەش ماوەتەوە، (درایة) واتە ئەو زانست و زانیارییەی تیایەتی پارێزراوە، گشتگیرە و شامل و کاملە، جیاوازە، زۆر چاك و گونجاوە، چاکسازیە بۆ هەموو گەل و سەردەم و کات و ڕۆژگار و شوێنێك؛ عەقیدەیەکی زیندو نەمرە، ماوەیە دیارە هەتا ڕۆژی قیامەت هەر دەمێنێ، پارێزراوە خوای گەورە خۆی دەی پارێزێت، نەوە لەدوای نەوە نەقڵی دەکەن بۆ یەکتر، گەورە لە گەورەوە، بەبێ ئەوەی هیچ زیاد و کەمیەکی تێدا بێت، بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕین و لادان و تێکەڵ و پێکەڵ کردنێکی تێدا بێت.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ سورة الحجر: ٩.

واتە: بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە، بەڕاستی هەر ئێمەش دەی پارێزین.

**حەوتەم:** بەڕاستی دەستگرتن بە عەقیدەی سەلەفی صالح لە گەورەترین هۆکاری نزیکبونەوەیە لە خوای گەورە، هۆکاری سەرکەوتنە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و، هۆکارە بۆ دەستخستنی بەهەشتەکەی خوای گەورە، هۆکاری رزگاربوونە لە سزای سەختی.

ئەم سیفەت و تایبەتمەندیانە جێگیرە بۆ عەقیدەی سەلەفی صالح – کە ئەهلی سوننەو جەماعەن – سوپاس بۆ خوای گەورە بەردوام بەو شێوەیەن لەهەموو ئان و زەمان و شوێنێکدا هەن و هیچ شوێنێ خاڵی نیە لێیان و دیارن[1].

* ومن هنا يتضح جليا كذب ما قيل من أن: (السلفية مرحلة زمنية؛ لا مذهب إسلامي !!) ذلك» لأن مذهب السلف الصالح – أهل السنة والجماعة – مشتمل على أساسين عظيمين: القدوة الحسنة الصالحة. والمنهج النبوي الشرعي.

* فالقدوة؛ هُم أصحاب العصور الثلاثة من الصحابة والتابعين وتابعيهم بإحسان.

* والمنهج ؛ هو الطريقة المتبعة في هذه العصور المباركة في فهم الوحيين الشريفين؛ وهو منهج العلمي في تلقي الإسلام وفهمه والعمل به وتحكيمه، وذلك في جميع جوانب علوم الشريعة الغراء من الفقه، والاستدلال، والتقرير، والعلوم الإعتقاد، والإيمان والسلوك.

## بنچینەکانی عەقیدەی سەلەفی صالح

## ئەهلی سوننە و جەماعە.

بەڕاستی ئەهلی سوننە و جەماعە ڕۆیشتون لەسەر ڕێگەو ڕێبازی پێشینە چاکەکان، دەڕۆن لەسەر کۆمەڵە بنچینەیەکی جێگیر و دامەزراو و ڕون و ئاشکرا لە بیروباوەڕدا، لە کاروکردەوەدا، لە ڕەفتاردا، ئەم بنچینانە درێژکراوەیە بۆ کتێبەکەی خوا واتە وەرگیراون لە قورئان و فەرموودە ڕاست و دروستەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئیتر (متواتر) بن – واتە کەسانێکی زۆر یەك لەدوای یەك ئەو فەرمودەیان ریوایەت کردبێ – یان (آحاد) بن – واتە تەنها کەسێکی باوەڕپێکراو ریوایەتی کردبێ –، لەسەر تێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت لە هاوەڵان و شوێنکەوتوان و ئەوانەی شوێن ئەوان کەوتون لە ڕاستگۆیی و پاکی و چاکەدا؛ ئەوانە خۆیان تەسلیمی دەقەکانی هەردوو وەحیەکە دەکەن واتە قورئان و سوننەت، دەقەکان کۆدەکەنەوە، ئەو ئایەتانەی کە (متشابه)ن واتە مەبەستەکانیان روون نیە دەگێڕنەوە بۆ لای ئەو ئایەتانەی کە (محکم)ن واتە مەبەستەکانیان روون و ئاشکرایە، ملکەچن بۆ قورئان و سوننە لەگەڵ ئەوپەڕی بە گەورە دانان و بەرزڕاگرتنیاندا، جیاوازی ناخەنە نێوانیان، نابنە کۆمەڵ کۆمەڵ و دەستە دەستەو پەرت و بڵاو نابن، بەڵکو بە توندی دەست دەگرن بەدینی خواوە، دژایەتی و بەرهەڵستی قورئان و سوننە ناکەن: بە ئەقڵی کورت، بە ئیحتیمالاتی زمانەوانی، بە قیاس پێوانەی پڕو پوچ، بە فەلسەفەو، بە کەشف وەك ئەوەی دەڵێ عەقڵی من ئەوەی کەشف کرد – ، بە زەوق.

بەڕاستی بنچینەی دین پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆی ڕوونی کردۆتەوە بە ڕونکردنەوەیەکی تەواو؛ بۆ هیچ کەسێ نیە شتێکی تێدا دابهێنێ بەلایەوە وابێت کە ئەوە دینە، هەر لەبەرئەوەیە دەستیان گرتووە بەو بنچینە گەورانەوە، دوورکەوتونەتەوە لەو دەربڕینە داهێنراوانەی کە داهێنراون، پابەندن بە دەربڕینە شەرعیەکانەوە، هەر

لەبەر ئەوەیە ئەهلی سوننەو جەماعە بریتیە لە درێژبوونەوەیەکی سروشتی و حەقیقی و راستەقینە بۆ سەلەفی صالح.

**جا ئەوەی کە بنچینەی دینە لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە بەکورتی بەم شێوەیە:**

## بنچینەی یەکەم

## پایەکانی باوەڕهێنان (ئیمان)

بێگومان بیروباوەڕی پێشینە چاکەکان – ئەهلی سوننە و جەماعە – سەبارەت بە تەفسیری باوەڕهێنان کورت دەبێتەوە لە: بەڕاست دانانێکی پڕاو پڕو جێگیر و، دان پێدانانی گشتی و تەواو، بە هەر هەموو ئەو شتانەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە بەوەشی کە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ کردووە، ملکەچی بۆیان لە روکەش و لە ناخدا؛ بریتیە لە بەڕاست دانانی دڵ واتە لەدڵەوە بە راست بزانرێن، بڕوا پێ بوونی کردەوەکانی دڵ و ئەندامەکانی جەستە دەگرێتە خۆی، ئەمەش گشتگیرە بۆ هەستان بە ئەنجامدانی کار و فەرمانەکانی هەر هەموو دین.

ئەمما عەقیدەو بیروباوەڕیان واتە بیروباوەڕی پێشینە چاکەکان سەبارەت بە بنەماکانی دین کورت دەبێتەوە لە:بەڕاست دانانی هەر شەش پایەکانی باوەڕهێنان؛ هەروەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی داوە لە فەرموودە درێژەکەی جبریل دا سەلامی خوای لەسەر بێ لەکاتێکدا کە هاتە خزمەتی و دەربارەی باوەڕهێنان پرسیاری لێ کرد؛ وتی: ئیمان چیە؟ ئەویش فەرمووی: (أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَالْقَدَرِ كُلِّهِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ). رواه البخاري ومسلم في كتاب الإيمان.

واتە: ئەوەیە باوەڕت هەبێ بە خوای گەورەو بە مەلائیکەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و رۆژی قیامەت و بە قەزاو قەدەر بە خێر و شەڕی.

کەواتە باوەڕهێنان لەسەر ئەم شەش پایەو روکنە وەستاوەو دادەمەزرێت؛ هەر هەر هەموویان بە یەکەوەن و بەش بەش ناکرێن، هەر لەبەر ئەوەیە ئیمانی بەندەیە ڕاست و دروست و تەواو نیە هەتا هەموو پایەکان بەتەواوی نەهێنێتەدی و جێبەجێیان نەکات، ئەگەر یەکێك لەم پایانەی لەدەست دا یان تێیدا نەهاتەدی؛ ئەوە ئیمانە باوەڕهێنانەکەی روخاوەو پوچەڵ دەبێتەوە، ئەو بەندەیە هەرگیز باوەڕدار نیەو، باوەڕهێنانەکەی لێ وەرناگیرێ بە باوەڕبوون بە پایەکانی ترو هێنانەدییان؛ لەبەر ئەوەیە یەکێ لە پایەکانی باوەڕهێنانی ونکردووە، باوەڕهێنان راناوەستێ و دانامەزرێت ئیللا لەسەر هەموو پایەکانی نەبێت بەتەواوەتی، هەروەك چۆن بینا لەسەر هەموو پایەکانی نەبێت راناوەستێ و دانامەزرێت.

**لەبەر ئەوەیە ئیمان تەواو نیە؛ تەنها بەو شەش پایە نەبێت بەڵام لەسەر ئەو شێوە ڕاست و دروستەی کە بەڵگەی لەسەر هاتووە لە قورئان و سوننەدا نەك بە عەقڵی خۆی، هەرکەسێك دانی نەنا بە شتێ لەوانەداو ئینکاری کرد ئەوە دڵنیابە ئیمانی نیەو کافرە، با خۆشی بە ئیماندار بزانێ و بانگەشەی باوەڕهێنانیش بکات و هەستێ بە ئەنجامدانی هەندێ لە پایەکانی ئیمان.**

## پایەی یەکەم

## باوەڕهێنانە بە خوای گەورە

**باوەڕهێنان بە خوای گەورە بریتیە لە بەڕاست دانانێکی پڕاوپڕ واتە هیچ درۆیەکی تێدا نەبێت، دان پێدانانێکی تەواو بەبوونی خوای گەورەو بەرزو بڵند،** **باوەڕت بە** (الربوبیة) **پەروەردگاریتی (الله) هەبێت** – واتە: خوای گەورە خالق و بەدیهێنەر و پەروەردگار و گەورەو فەرمانڕەواو پاشاو نەخشە بۆ داڕێژەر و هەڵسوڕێنەر و ڕێکخەری هەموو شتێکە – **باوەڕت بە** (الوهیة) **پەرستراویتی (الله) هەبێت** – واتە: باوەڕت هەبێ کە تەنها خوای گەورە شایەنی عیبادەت بۆکردن بێت و بە تاکی بپەرسترێت – باوەڕت هەبێ بە (أسماء وصفات) **ناو و ئاوەڵناوەکانی خوای گەورە** – واتە: باوەڕت هەبێ بەوەی خوای گەورە وەسفکراوە بە هەموو ئاوەڵناوێکی تەواو، هەموو سیفەتێکی بەرز و شکۆدار، هەموو و ناوێکی جوان، **هیچ هاوەڵ و هاوبەشێکی نیە لە تایبەتمەندیەکانیدا، هەستان بەجێ بەجێ کردنی ئەم دان پێدانانە بەکردەوە** و بەعیلم و زانستەوە – واتە: دڵ دامەزراو بێت لەسەری و دڵنیا و ئاسودە بێ بە شێوەیە کە شوێنەواری ببینرێت بە ڕەفتاری بەندەوە، فەرمانەکانی جێ بەجێ بکات واتە پابەندبێ بە فەرمانەکانی خوای گەورەوە و دووربکەوێتەوە لە قەدەغەکراوەکانی.

**باوەڕبون بە خوای گەورە**: بریتیە لە بنچینەی عەقیدەی ئیسلامی کرۆکی و ناوەڕۆکی؛ بریتە لە پایەیەکی چەسپاو و جێگیر، بنچینەی بنچینەکانە، هەر هەموو پایەکانی عەقیدەو بیروباوەڕ دەدرێنە پاڵ باوەڕبون بە خوای گەورە، شوێنکەوتەی ئەوە.

**باوەڕبون بە خوای گەورە**: ئەوە دەگرێتە خۆی کە باوەڕت وابێ خوای گەورە تاک و تەنیایەو هەرخۆی شایەنی ئەوەیە پەرستشی بۆ ئەنجام بدرێت، باوەڕت

هەبێ بە ناو و ئاوەڵناوە جوانەکانی؛ لەبەر ئەوەی بوون و پەرستراوێتی خوای گەورە و بەرز و بڵند؛ گەورەترینی راستیەکانە بە رەهایی، بوونی خوا بریتیە لەو بەڵگەنەویستانەی کە بە هیچ جۆرێك گومان هەڵناگرێت، ئەوەشی کە بەڵگەیە لەسەر ئەم قسەیە: **سروشتی پاکێتی مرۆڤ** (فطرة سلیم) و، **عەقڵی سەلیم و، (حس) هەستکردنە لە ئادەمیزاد دا، لەگەڵ ئەو شەرعە پاکەی کە دابەزیوە**، ئەمانەی کە باسکران هەر هەموویان بەڵگەن لەسەر بوونی خوای گەورە.

لە باوەڕبون بە خوای پەروەردگار: باوەڕ بوونە بە تاك و تەنیایی و، (أُلوهیته) پەروەردگارێتیی و، ناو و ئاوەڵناوەکانی، ئەمەش دێتەدی بە دان پێدانان بەهەرسێ جۆرەکەی یەکتاپەرستی (التوحید) و باوەڕبون پێیان و کارپێ کردنیان، هەرسێ جۆرەکەی یەکتاپەرستیش بریتین لەمانە: **(توحید** الربوبیة) **یەکتاپەرستی پەروەردگارێتی و، (توحید** الألوهیە) **یەکتاپەرستی پەرستراوێتی و، یەکتاپەرستی (التوحید** الأسماء وصفات) **ناو و ئاوەڵناوەکانی.**

**١- (توحید الربوبیة) یەکتاپەرستی پەروەردگارێتی،**

بریتیە لە بەڕاست دانانێکی پڕاوپڕ، دان پێدانانێکی تەواو: بەوەی کە خوای گەورە بە تەنیا پەروەردگاری هەموو شتێکە، خاوەنیەتی، دروستکەر و بەدیهێنەریەتی، رۆزی دەریەتی، هاوتاو هاوەڵ و هاوبەشی نیە، زیندووەو نامرێ، راگریی بوونەوەرە و هەڵسوڕێنەریەتی، هەرگیز ناخەوێت، پاك و خاوێن راگیراوە لە هەموو کەموکورتی و نەنگی و بێ توانایی و پەککەوتەیی، داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی یە بە جوانترین شێوە فەراهەمی هێناون، هەڵسوڕێنەر و رێکخەری جیهانەو، بە ئارەزووی خۆی دەیبات بەڕێوە چی بوێت دەیکات، لێهاتو بەتواناو زاڵە بەسەریدا؛ فەرمان و بڕیار هەر بۆ ئەوە، هەموو خێر و چاکەیە بەدەستی خوایە، هەر فەرمانێکی دا هیچ کەسێك ناتوانێ رەتی بکاتەوەو بیداتەدواوە، هەر بڕیارێکی

دا جێبەجێی دەکات و کەس ناتوانێ ڕێگری لێ بکات، هەرچی بیەوێ دەیکات، هەرچی ئە نەیەوێ نابێت، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بەندەی ئەوەو لە چنگی خوای گەورەدایەو، لەژێر دەسەڵات و رکێفی ئەودان، دەبێت باوەڕت بە قەزاو قەدەری خوا هەبێ ، دەبێت باوەڕت هەبێ و دان بەوەدا بنێی لە هەموو ئەو شتانەی کە خوای گەورە تەقدیری کردووەو ئەندازەی بۆ داناوە و بڕیاری لەسەرداوە دادپەروەر بووە، دەبێ باوەڕت بە وەحدانیەتی خوای گەورە هەبێت لە زاتی خۆیدا، لە کاروکردەوەکانیدا.

**پوختەی قسە ئەمەیە: (بە تاك دانانی خوای گەورەو بەرزو بڵند لەکارو کردەوەکانیدا).**

بێگومان چەندەها بەڵگەی شەرعی هەیە لەسەر پێویستێتی باوەڕبون بە پەروەردگارێتی خوای پەروەردگار، قورئانی گەورەو شکۆدار و پیرۆز پڕە لە باسی ئەو بەڵگانە لەسەر پەروەردگارێتی خوای گەورە، هیچ سورەتێ لە سورەتەکانی قورئان نابینی خاڵی بێت لە باسی پەروەردگارێتی خوای پەروەردگار، یان لە ئاماژەپێدانی؛ ئەمەش بنچینەیەکە بە نیسبەت جۆرەکانی تری یەکتاپەرستیەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ سورة لفاتحة: ٢.

واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە پەروەردگاری جیهانە.

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ سورة الأعراف: ٥٤.

واتە: بێداربن کەبەدیهێنان و فەرماندان هەر بۆ خوایە، پیرۆزی و هەموو بەرەکەتێك بۆ خوای پەروەردگاری جیهانە.

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ سورة البقرە: ٢٩

واتە: خوا ئەو خوایەیە کە هەرچی لەزەوی دایە دروستی کردووە بۆ ئێوە.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴾ سورة الذاريات: ٥٨

واتە: بەڕاستی تەنها خوا خۆی ڕۆزیدەرە کە خاوەن دەسەڵاتی زۆر بەهێزە.

﴿ قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ ﴾ سورة المؤمنون: ٨٨

واتە: بڵێ کێ فەرمان ڕەوایی هەموو شتێکی بەدەستە.

کافرەکانی قورەیش دانیان نابوو بەم جۆرە یەکتاپەرستی (توحید)ەدا، زۆربەی گەل و نەتەوەکان و خاوەن دیانەتەکان و، هاوەڵ بۆ خوا دانەرانی سەردەمی کۆن کە خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆ ناردون؛ هەر هەموویان دانیان نابوو بەوەدا کە خوای گەورە بە تاك و تەنیا دروستکەری جیهانە و ئەوەی لە ناویایەتی، ڕۆزیدەری هەموو دروستکراوانە. خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ سورة لقمان: ٢٥.

واتە: سوێند بەخوا ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؟ بێگومان دەڵێن: خوا، (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) بڵێ: سوپاس بۆ خوا (کەدان بەو ڕاستیەدا دەنێن)، بەڵام زۆربەیان نازانن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾ سورة يونس: ٣١.

واتە: (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) بڵێ: ئایا کێ ڕسق و ڕۆزیتان دەدات لەئاسمان (بە باران)و لەزەویەوە (بە ڕووەك)، یا کێ خاوەنی (دروستکەری) گوێ و چاوانە، کێ زیندوو لە مردوو دەردەهێنێ، مردوو لەزیندوو دەردەهێنێ، هەروەها کێ کارەکان هەڵدەسوڕێنێ، بێگومان یەکسەر دەڵێن خوا، کەواتە (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) پێیان بڵێ: دەی بۆ خۆتان ناپارێزن (لەسزای خوا)؟.

لەبەرئەوە دڵی بەندەکان بە فیترەت پاکەو دانیان ناوە بە پەروەردگارێتی خوای گەورەدا، هیچ کەسێ ئینکاری ئەم یەکتاپەرستی (توحید)ەی نەکردووە جگەلە (الدهرية)ەکان لەپێشدا، شیوعیەکانیش لەم سەردەمەی ئێستاماندا.

هەر لەبەر ئەوەیە؛ هەر کەسێ باوەڕی تەنها بەم جۆرەی یەکخواناسی هەبێ یەکتاپەرست نیەو، نابێ بە یەکێ لە موسوڵمانان و ناچێتە شورای ئیسلامەوە، خوێن و ماڵ و سامانی پارێزراو نیە، لە ڕۆژی دواییدا ڕزگاری ناکات لەسزای ئاگری دۆزەخ مانەوەی بەهەتا هەتایی تێیدا؛ هەتا پابەند نەبێ بەجۆری دووهەمەوە لە جۆرەکانی یەکخواناسی، کە ئەویش بریتیە لە یەکتاپەرستی پەرستراوێتی.

**٢- (توحيد الوهية) یەکتاپەرستی پەرستراوێتی:**

بریتیە لە بەڕاست دانانێکی پڕاوپڕ، دان پێدانانێکی تەواو: بەوەی کە خوای گەورە بە تەنیا هەر خۆی پەرستراوی هەقە، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لەو؛ کە شیاوی ئەوە بێ پەرستشی بۆ بکرێت و ملکەچی و گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری ڕەهای بۆ بکرێت، هەموو پەرستراوێك جگە لە (الله) پوچ و ناڕەواو بێ بایەخە، پێویستە ئادەمیزاد پشت بکاتە هەر هەموویان.

واتە: بریتیە لە بەتاك دانانی خوای گەورە و بێ هاوەڵ؛ لەهەموو جۆرەکانی عیبادەت و پەرستشە روکەش و شاراوەکاندا؛ ئیتر بە وتە بێت یان بە کردار، پێویستە هەموو دڵسۆزی و نیەتپاکیە بۆ دین بێ و لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بێت، پێویستە هیچ شتێ لە عیبادەت و پەرستش ئەنجام نەدرێن بۆ جگە لەخوای گەورە؛ وەك نوێژو، ڕۆژوو، زەکات و، حەجکردن و، پاڕانەوەو، هانا بۆ بردن و، پەناگرتن و، (نذر) لەسەرخۆ پێویست کردن و، سەربڕین و، پشت پێ بەستن و، ترسان و، هیواو ئومێد پێ بوون و، خۆشویستن و، گەڕانەوە بۆ لای و، ترس و بیم و، ملکەچی بۆ کردن و، جگە لەمانەش لە جۆرەکانی تری عیبادەت و پەرستش، دەبێ خوای گەورە بپەرسترێ بە؛ خۆشویستن و ترس بیم و بە هیواو ئومێد پێ

بوون هەر هەموویان، هەرکەسێك عیبادەتی خوای گەورە بکات بە هەندێ لەوانە جگە لە هەندێکی تریان ئەوە ئەو کەسە گومڕایە.

**پوختەی قسەئەمەیە:(یەکردەوەی بەندەکان دەبێت یەکتاپەرستی پەرستراوێتی بسەلمێنرێت).**

خوای گەورەو شکۆدار دەفەرموێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ سورة الفاتحة: ٥.

واتە: (خوایە) تەنها تۆ دەپەرستین، تەنها لەتۆ داوای یارمەتی دەکەین.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ ﴾ سورة المؤمنون: ١١٧.

واتە: هەر کەس بپەرستێ پەرستراوێکی تر لەگەڵ خـوادا کەهیچ بەڵگەیەکی نەبێ لەسەر ئەو (پەرستنە)، ئەوە بەڕاستی لێپرسینەوەی تەنها لای پەروەردگارێتی، بێگومان کافران ڕزگار نابن.

خوای باڵادەست و پەروەردگار لەپێناوی (توحید)ی عیبادەتدا ئادەمیزادو جنۆکەی دروستکردووە، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ سورة الذاريات: ٥٦.

واتە: من هەر بۆیە جنۆکەو ئادەمیم دروستکردووە بم ناسن و بم پەرستن.

کەواتە یەکتاپەرستی بریتیە لە سەرەتاو کۆتایی و ئاشکراو روکەش و ناخی دین، بریتیە لە سەرەتاو کۆتایی بانگەوازی پێغەمبەران، هەر لەپێناوی یەکتاپەرستی دا پێغەمبەران نێردراون بۆ سەر گەل و نەتەوەکان، پەرتووکە ئاسمانیەکان دابەزیون، شمشێرەکانی جیهاد لەکالان راکێشراون، جیاوازی کراوە لەنێوان باوەڕداران و کافراندا، لەنێوان خەڵکانی بەهەشت و دۆزەخدا، ئەمەش مانای ئەم فەرمودەیەی خوای گەورە دەگەیەنێت: (لا إِلَهَ إلاَّ اللّٰہ). واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله).

هەموو پێغەمبەران بۆ ئەم مەبەستە بانگەوازیان کردووە، ئینکاری کردنی ئەمەش بوو بە هۆی لەناوچونی گەلانی پێشو، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾ سورة الأنبياء، ٢٥.

واتە: ئێمە نەمان ناردووە هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لەمن هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە، کەواتە تەنها من بپەرستن.

یەکتاپەرستی پەروەردگارێتی پابەندە بە یەکتاپەرستی پەرستراوێتیەوە؛ چونکە هەرکەسێ دان بنێ بە پەروەردگارێتی خوای گەورەدا پێویست دەکات لەسەری بە تەنیا خوا بپەرستێ و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدات؛ لەبەرئەوە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران یەك خوایان نەدەپەرست، ئینکاری ئەوەشیان دەکرد کە خوای گەورە شایەنی ئەوە بێت بە تاك و تەنیایی و بێ هاوەڵ بپەرسترێت، بەڵکو چەندەها خوایان دەپەرست، پێیان وابوو لەخوای گەورە نزیکیان دەکاتەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە دانیان پێدا دەنا کە هیچ سودو زیانێ ناگەیەنن، کەچی لەگەڵ هەموو ئەمانەدا خوای گەورە بە باوەڕدار ناوی نەهێناون، بەڵکو خستنیە ریزی کافرانەوە؛ ئەویش بەوەی کە لە پەرستش دا هاوبەشیان بۆ دانا.

هەرکەسێك پەروەردگار و دروستکەر و بەدیهێنەر بێ، ڕۆزی دەر بێ، پاشاو خاوەن دەسەڵات بێ، هەڵسوڕێنەر و پارێزگار بێ، ژێنەر بێ، مرێنەر بێ، وەسف کرابێ بە هەموو سیفەتێکی تەواو، بەدوور گیرا بێ لە هەموو سیفاتێکی کەموکورتی، هەموو شتێ بە دەستی ئەو بێ؛ پێویستە کە یەك خوابێت و بێ هاوەڵ و تەنیا بێ، پەرستش هەر بۆ ئەو بێ.

ئا لێرەدایە کە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە جیاوازە لە بیروباوەڕی کەسانی تر لە یەکتاپەرستی پەرستراوێتی دا؛ ئەهلی سوننەو جەماعە مەبەستیان ئەوە نیە کە وشەی (لا إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ) واتە: هیچ دروستکەر و ڕۆزیدەرێ نیە جگە لە

(الله)و بەس، وەك چۆن هەندێك لە خەڵكانی گومڕاو سەرلێ شێواو دەیڵێن، بەڵكو یەكتاپەرستی پەرستراوێتی – لەلایان واتە لەلای ئەهلی سوننەو جەماعە – نایەتەدی ئیللا بە جێ بەجێ كردنی مانای تەواوی شەهادەتی (لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) نەبێت، واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، مانای ئەمەش ئەوەیە یەكتاپەرستی پەرستراوێتی وا پێویست دەكات كە؛ **بە تاك دانانی خوای گەورە بۆ ئەنجامدانی پەرستشەكان.**

عیبادەت و پەرستشیش بریتیە لەو تاعەت و كردەوە شەرعیانەی كە بەندەی موسوڵمان پێی هەڵئەسێ بۆ نزیك بوونەوە لە خوای گەورە، بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو؛ بە بەجێهێنانی پەرستش دێتەدی؛ بە گوفتاری زمان واتە شایەتومان و باوەڕ پێ بوونی دڵ و، كردەوەی دڵ و ئەندامەكانی جەستە.

**ئەو پەرستشانەی كە ئەنجام دەدرێن بۆ خوای گەورە ڕاست و دروست نین تەنیا بەم دوو مەرجە نەبێت:**

**یەكەم:** (الإخلاص)نیەت پاكی، واتە: دەبێت پەرستش بە پاكی و بە تەنیا لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بێت.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قُلِ اللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُ دِينِي ﴿١٤﴾ فَاعْبُدُوا مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِ ﴾ سورة الزمر: ١٤ – ١٥.

واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) بڵێ من هەر خوا دەپەرستم بە پاكی و تەنیا هەر بۆ ئەو ملكەچم. (بە بێ باوەڕان بڵێ): ئێوەش جگە لە خوا چیتان ویست بی پەرستن.

**دووهەم:**(المتابعة لِلرَّسولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**شوێنكەوتنی ڕاستەقینە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)**، واتە: دەبێ خوا بپەرسترێ بە پێی ئەوەی كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە شەرعی داناوە، گوێڕایەڵی بكرێت لەوەی

کە فەرمان دەکات، بەڕاست بزانرێ لەوەی کە هەواڵی داوە، پێویستە عیبادەت پەسەندو گونجاو بێت لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ کردووە – لە کات و شوێنی خۆیدا – ، دوور کەوینەوە لەو شتانەی کە قەدەغەی کردووە ، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ سورة الحشر: ٧.

واتە: ئەوەی پێغەمبەر پێ ی دان وەریبگرن، ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بێنن، لە خوا بترسن، بێگومان خوای گەورە سزای سەختە.

* یەکخواناسیی خوای گەورە بە عیبادەت و ملکەچی و گوێڕایەڵی و خۆشەویستی بۆی : بریتیە لە بەجێهێنانی شەهادەتی: (أنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ).

* شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و سوننەتەکانی و، ملکەچی بۆ ئەوەی کە فەرمانی پێ کردووەو، ئەوەشی کە قەدەغەی کردووەو، گەردنکەچی رەها بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم): بریتیە لە بەجێهێنانی شەهادەتی: (أنَّ مُحَمَّداً رسولُ اللَّهِ).

**بەجێهێنانی شەهادەتی: (أنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) دوو پایەی گەورەی هەیە:**

**یەکەم:** هەموو جۆرەکانی پەرستش تەنها بۆ خوای تاك و بێ هاوەڵ بێت.

**دووهەم:** هیچ شتێ لەو پەرستشانە بۆ جگە لە خوای گەورە نەکرێت.

ئەمەش مانای ئەوەیە؛ کە هیچ شتێ لە مافەکانی دروستکەر و لە تایبەتمەندیەکانی جگە لە خوای گەورەو شکۆدار کەس توانای بەسەریاندا نیە نەبەخشرێت بە دروستکراوانی، واتە: جگە لە خوای گەورە هیچ شتێ نەپەرسترێ، بۆ جگە لە خوای گەورە نوێژ نەکرێت و سەجدە نەبرێت و، (نذر) شت لەسەرخۆ پێویست نەکرێت و، ئاژەڵ سەرنەبڕرێت، پشت نەبەسترێت بە غەیری خوا، داوای یارمەتی نەکرێت جگە لە خوای گەورە نەبێ، هاوار نەکرێتە

غەیری خوای پەروەردگار، ئەمانەو جگە لەو کارانەش کە تەنها تایبەتن بە خوای پەروەردگار.

کەواتە ڕێگەو ڕێبازی ئەهلی سوننەو جەماعە چی یە؟

ئەهلی سوننەو جەماعە خوای گەورە دەپەرستن و ، هاوەڵی بۆ بڕیار نادەن، جگە لە خوای گەورە داوا لە کەس ناکەن و لەکەس ناپاڕێنەوەو داوای یارمەتی لە کەس ناکەن و پشت بە کەس نابەستن و، هاوار لە کەس ناکەن و لەهیچ شتێك و لەهیچ کەسێ ناترسن، خۆیان نزیك دەکەنەوە لە خوای گەورە بە گوێڕایەڵی کردنی و بە عیبادەت بۆ کردنی و بە ئەنجامدانی کردەوە چاکەکانی خۆیان، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـًٔاۖ ﴾ النساء: ٣٦.

واتە: بەس خوا بپەرستن، هیچ شتێك مەکەن بەهاوبەشی.

**٣- (التوحید الأسماء و صفات)یەکتاپەرستی ناو و ناوەڵناوەکانی؛**

واتە: بریتیە لە بیروباوەڕێ لێوان لێو لە ڕاستی و تەواوێتی کە خوای گەورە کۆمەڵە ناوێکی جوانی هەیە، کۆمەڵە سیفەتێکی بەرزو شکۆداری هەیە، وەسف کراوە بە هەموو سیفەتێکی تەواو، بەپاك گیراوە لە هەموو سیفاتێکی کەموکورتی و ناتەواوی، خوای پەروەردگار تاك و تەنهایە لە ناوە جوانەکان و سیفاتە بەرزەکاندا هەموو بوونەوەران و دروستکراوان خاوەنی ئەو سیفات و ناوانە نین.

ئەهلی سوننەو جەماعە پەروەردگاری خۆیان دەناسن کە بەو سیفاتە بەرزو شکۆدارانەدا کە هاتوون لەقورئان و سوننەدا، وەسفی خوای پەروەردگار دەکەن بەو شێوەیەی کە خۆی وەسفی خۆی کردووە، هەروەها وەسفی خوای پەروەردگار دەکەن بەو شێوەیە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەسفی کردووە،

وتە و فەرموودەی خوا ناگۆڕن لە شوێنی خۆی، (ملحد)[1]بێ باوەڕ نین بەرامبەر بە ناوەکانی و ئایەتەکانی، ئەوە خوای گەورە بۆ خۆی باسی کردووە ئەهلی سوننەو جەماعە جێگیری دەکەن: بەبێ ئەوەی هاوشێوەو هاو وێنەی بۆ دانێن، چۆنیەتی بۆ دانانێن و، سیفەتەکانی خوای گەورە پەکناخەن، نایان گۆڕن لەهەموو ئەمانەدا قاعیدەیان ئەم ئایەتەی خوای گەورەیە:

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾ سورة الشورى: ١١.

واتە: هیچ شتێك هاو شێوەو هاو وێنەی خوای گەورە نی یە، هەر ئەوە بیسەری بینایە.

هەروەها ئەم ئایەتەش: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ سورة الأعراف: ١٨٠،

واتە: هەر بۆ خوایە جوانترین و چاکترینی ناوەکان، جا ئێوەش بەو ناوانە بانگ و هاواری لێ بکەن، واز بهێنن و نرخ دامەنێن بۆ ئەوانەی کەلەناوەکانی (خوا)دا گۆڕان و لادان دەکەن (دەیکەنە ناو بۆ بتەکانیان)، بەزوویی تۆڵەی ئەوەی دەیانکرد لێیان دەسەنرێت.

---

(١) – الإلحاد: هو الميل عن الحق والانحراف عنه؛ ويدخل فيه: (التعطيل، والتحريف والتكييف، والتمثيل).

التعطيل: عدم إثبات الصفات، أو إثبات بعضها ونفي الباقي .

التعطيل: عدم إثبات الصفات، أو إثبات بعضها ونفي الباقي .

التحريف: تغيير النص لفظاً أو معنى، وصرفه عن معناه الظاهر إلى معنى لا يدل عليه اللفظ إلا باحتمال مرجوح؛ فكل تحريف تعطيل، وليس كل تعطيل تحريفاً.

التكييف: بيان الهيئة التي تكون عليها الصفات.

التمثيل: إثبات المثل للشيء؛ مشابهاً له من كل الوجوه.

ئەهلی سوننەو جەماعە،

چۆنیەتی سیفەتەکانی خوای گەورە دیاری ناکەن؛ لەبەر ئەوە خوای گەورە هیچ هەواڵێکی ڕانەگەیاندووە دەربارەی چۆنیەتیەکەی، هەر لەبەر ئەوەیە هیچ کەسێ بە خوا لە خۆی شارەزاتر نیە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ﴾ سوورة البقرة: ١٤٠.

واتە: (ئەی موحەممەد) بڵێ: ئایا ئێوە زاناترن یان خوا؟.

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ سورة النحل: ٧٤.

واتە: کەواتە نموونەکان بۆ خوا مەهێننەوە، بەڕاستی خوا دەزانێ و ئێوە نازانن.

هیچ کەسێ نیە شارەزاتر بێت بە خوا لەدوای خوا لە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم)، خوای گەورە لە هەقی ئەو پێغەمبەرەدا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴾ سورة النجم: ٣ – ٤ .

واتە: لە هەوا و هەوسەوە قسە ناکات (کە قورئان دەخوێنێت). هەرچی دەیڵێ (قورئانەو) سرووش دەکرێ بۆی.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە خوای گەورە (أَوَّل)یەکەمینەو سەرەتای بۆ نیەو هیچ شتێ لەپێش ئەو نەبووە، (آخِر)دواهەمینەو لەدوای ئەو هیچ شتێ نیە لەدوای هەموو مەوجودێ هەردەمێنێ، (ظَّاهِر)دیارە کەس لەسەرویەوە نیە هیچ شتێ باڵادەستی نیە، (بَاطِن)نادیار و شاراوەیە هەموو شتێ لەژێر دەستی خۆیدایە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ سورة الحديد: ٣.

واتە: هەر ئەوە یەکەمین و دواهەمین، دیارو نادیار، ئەو بەهەموو شتێك ئاگایە.

هەروەك چۆن زاتی خوای گەورە لە زاتی هیچ کەسێکی تر ناچێت، سیفاتەکانیشی لە هیچ سیفاتێکی تر ناچێت، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار شێوەی نیە، هاوشێوە و شەریك و هاوبەشی نیە، قیاس ناکرێت لەسەر دروستکراوەکانی، ئەهلی سوننە ئەوە کە خوای گەورە بۆ خۆی جێگیری کردووەو سەلماندویەتی ئەوانیش بۆی جێگیر دەکەن، جێگیرکردنێ بەبێ هاوشێوە بۆ دانان، بە پاکی دەگرن لەو سیفەتانەی کە کەموکورتن بەپاك گرتنێ بەبێ پەکخستن، لەکاتێکدا ئەو سیفەتە جێگیر دەکەن کە خوای گەورە بۆ خۆی جێگیری کردووە هاووێنەو هاوشێوەی بۆ دانانێن، ئەگەر بە پاکیان گرت لەو سیفەتانەی کە کەموکورتن ئەو سیفەتانە پەکناخەن کە خوای گەورە خۆی پێ وەسف کردووە.

ئەهلی سوننە باوەڕیان وایە کە خوای گەورە دەوری هەموو شتێکی داوەو ئاگاداری هەموو شتێکە، دروستکەری هەموو شتێکە، ڕۆزیدەری هەموو زیندویەکە، دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا، خوای بەرز و بڵند دەفەرموێت:

﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ سورة الملك: ١٤.

واتە: ئایا ئەو زاتەی کە مەردومی دروستکردووە ئاگای لە نهێنیان نیە، لەکاتێکدا کە ئەو وردبین و ئاگادارە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴾ سورة الذاريات: ٥٨ .

واتە: بەڕاستی تەنها خوا خۆی ڕۆزی دەرە، کە خاوەن دەسەڵاتی زۆر بەهێزە.

هەروەها ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە خوای گەورە بەرزبۆتەوە لەسەر عەرش بە بەرزبونەوەیە کە شایەنی خۆی بێت لەسەرەوەی حەوت ئاسمانەکانەوەیە[١]، هەروەك وەك چۆن باوەڕیان بە بەرز و بڵندی خوای گەورە هەیە بەسەر دروستکراوەکانیدا، خوای گەورە دیارە لە دروستکراوی خۆی، زانیاری خوای گەورە دەوری هەموو شتێکی داوە، هەروەوەك خۆی هەواڵی داوە چۆن لە قورئانە پیرۆزەکەیدا، لە حەوت ئایەت باسی کردووە[٢]؛ بەبێ چۆنیەتی (تکییف)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴾ سورة طه: ٥ .

واتە: خوای گەورەو میهرەبان بەرزبۆتەوە بۆ سەر عەرشەکەی خۆی.

دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴾ سورة الحديد: ٤ . [٣].

واتە: پاشان بەرزبویەوە سەر عەرشو قەراری گرت (باوەڕمان پێ یەتی بەو شێوەی شیاوی خوابێ).

(١) - والاستواء على العرش والعلو صفتان نثبتهما لله تعالى إثباتاً يليق بجلاله، وتفسير كلمة استوى عند السلف: (استقر، علا، ارتفع، صعد) والسلف يفسرونها بهذه الكلمات لا يتجاوزونها ولا يزيدون عليها، ولم يرد في تفسير السلف تفسيرها بمعنى (استولى، ولا ملك، ولا قهر). والكيف مجهول؛ لا يعلمه إلا الله. والإيمان به واجب؛ لثبوت الأدلة. والسؤال عنه بدعة؛ لأن كيفية الاستواء لا يعلمها إلا الله، ولأن الصحابة أيضاً لم يسأل من الرسول صلى الله عليه وسلم عن الكيفية.

(٢) - وهي على الترتيب: سورة الأعراف: الآية، ٥٤. سورة يونس : الآية، ٣ . وسورة الرعد : الآية، ٢ وسورة طه : الآية، ٥ . وسورة الفرقان : الآية، ٥٩ . وسورة السجدة : الآية، ٤ . وسورة الحديد : الآية، ٤ .

(٣) - قال الإمام الحافظ إسحاق بن راهويه – رحمه الله – عن هذه الآية: (إجماع أهل العلم أنه فوق العرش استوى، ويعلم كل شيء في أسفل الأرض السابعة) رواه الإمام الذهبي في (العلو للعلي الغفار).

دەفەرموێت: ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ ﴾ سورة الملك: ١٦ – ١٧ .

واتە: ئایا دڵنیان لەو خوایەی کە لە ئاسمانە، کە بتانباتە خوارەوە بەناخی زەویدا، لەکاتێکدا کە زەوی (وەك دەریا) گێژ بخوات (بێتە لەرزین). ئایا دڵنیان لەو خوایەی کە لە ئاسمانە، کە بای توندتان بنێرێتە سەر بە وردە زیخەوە، ئەو دەمە تێدەگەن کە هەڕەشەی ئێمە چۆنە؟.

دەفەرموێت: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ﴾ سورة فاطر: ١٠ .

واتە: وتەی پاك و چاك تەنها بۆ لای ئەو (خوا) سەر دەکەوێ، (وتەی پاك) کردەوەی چاك بەرزی دەکاتەوە.

دەفەرموێت: ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ سورة النحل: ٥٠.

واتە: لە پەروەردگاریان دەترسن کەلەلای سەروویانەوەیەو هەر فەرمانێکیان پێ بکرێ دەیکەن.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (أَلاَ تَأْمَنُونِي وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ). (رواه البخاي ومسلم). واتە: ئایا ئێوە من بە ئەمیندار و دەسپاك نازانن، لەکاتێکدا کە من ئەمیندار و دەسپاکم لەلای ئەوەی کە لە ئاسمانە واتە خوای پەروەردگار.

**ئەهلی سوننەو جەماعە:**

باوەڕیان وایە کە عەرش و کورسی حەقن و هیچ گومانێکی تێدا نیە، خوای گەورەو پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ ﴾ سورة البقرة: ٢٥٥ .

واتە: کورسیەکەی خوا هەموو ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە، پارێزگاریکردنی ئاسمانەکان و زەوی بۆ خوا ئاسانە (گران و سەخت نیە)، هەر ئەو بڵندو پایەبەرز و گەورەیە، لە دەسەڵات و تواناادا هاوشانی نیە.

عەرش بەرزترین دروستکراوانی خوایە و گەورەترینیانە و مەزنترینیانە و سەقفی ئەوانەیە، عەرش وەك (قوبّة) گومەزە وایە بەسەر جیهانەوە، جگە لە خوای گەورە هیچ کەسێك ئەندازەی نازانێت ئەوەندە گەورەیە، وەستاوە مەلائیکە هەڵیان گرتووە، کورسی لەبەردەم عەرشدا جێگەی هەردوو پێی خوای گەورەیە، کورسی بەچاو عەرشەوە وەك ئەڵقەیەکی فرێدراو وایە لە دەشتێکی چۆڵەوانی فراواندا ئەو ئەڵقەیە چەندە دیارە ئەویش ئەوەندە دیارە، عەرش هەموو ئاسمانەکان و زەوی داپۆشیوە ، خوای گەورە بێ نیازە لە عەرش و کورسی پێویستی بە هیچ کامیان نیە، خوای گەورە بە پاك راگیراوە لەوەی کە پێویستی بە عەرش و غەیری عەرش بێت، پلەو پایەی زۆر لەوە بەرزتر و مەزن تر و شکۆمەند ترە کە پێویستی بە عەرش بێت؛ بەڵکو عەرش و کورسیش بەهێز و دەسەڵاتی خوای گەورە هەڵگیراون.

ئەهلی سوننەو جەماعە باوەڕیان وایە کە خوای گەورە بەهەردوو دەستی خۆی ئادەمی دروستکردووە، هەردوو دەستی راستە، هەردوو دەستی هەمیشە کراوەن و چۆنی بیەوێت دەیبەخشێت، وەك چۆن خۆی وەسفی کردووە؛ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ سورة ص: ٧٥.

واتە: (خوا) فەرمووی: ئەی ئیبلیس چ شتێك بەرگری کردی (لەوەی) کە سوژدە ببەیت بۆ کەسێ کە بە هەردوو دەستی خۆم دروستم کردووە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ﴾ سورة المائدة: ٦٤.

واتە: جوولەکەکان وتیان: خوا دەستی بەستراوە (پاکی بۆخوا)، یاخوا ئەوان چنگ قوچراوو دەست بەستراوبن، نەفرینیان لێکرا بەهۆی ئەوەی کە وتیان، (نەخێر وانی یە) بەڵکو هەردوو دەستی هەمیشە کراوەیەو چۆن بیەوێت دەیبەخشێت.

**ئەهلی سوننەو جەماعە:**

ئەم کۆمەڵە سیفاتانە بۆ خوای پەروەردگار جێگیر دەکەن: زانیاری، هێز و تواناو دەسەڵات و گەورەیی و شکۆمەندی، قسەکردن، ژیان، خۆشەویستی، بەزەیی، نەفس، توڕەیی، خەشم غەزەب لێ گرتن، پێ ناخۆشبون، رازیبون، پێکەنین، (معیّە) لەگەڵدا بوون، پێ و لاق، دەست، بینین، بیستن، روو، چاو، هەروەها جگە لەم سیفەتانەش کە شایەنی گەورەیی و بەرزی و شکۆمەندی و تەواوی خوای پەروەردگارن بە شێوەیە کە خۆی وەسفی کردووە لە قورئانە پیرۆزەکەیداو، لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بە چۆنیەتیە (کیفیّة) هەر خوای پەروەردگار خۆی دەیزانێ و ئێمە نایزانین؛ چونکە هەواڵی پێ نەداوین بە چۆنیەتیەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ﴾ سورة طه: ٤٦.

واتە: (خوا) فەرمووی: مەترسن بەراستی من لەگەڵتانام دەبیستم و دەبینم.

﴿وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ﴾ سورة التحريم: ٢. واتە: ئەو زانای کاردروستە.

﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾﴾ سورة النساء: ١٦٤.

واتە: خوا قسەی کرد لەگەڵ مووسا بەقسە کردن.

﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ﴾ سورة الرحمن: ٢٧.

واتە: هەر رووی پەروەردگارت دەمێنێ، کەخاوەن شکۆی رێزدارە.

﴿رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ﴾ سورة المائدة: ١١٩.

واتە: خوا رازی بووە لێیان و ئەوانیش لە خوا رازی بوون.

﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾ المائدة: ٥٤ .

واتە: خوا ئەوانی خۆش ئەوێ و ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێ.

﴿فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ﴾ سورة الزخرف: ٥٥.

واتە: جا کاتێ ڕقیان هەڵساندین تۆڵەمان لـێ سەندن.

﴿غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ﴾ سورة الممتحنة: ١٣.

واتە: کەسانێك کەخوا غەزەبی لێ گرتوون مەیکەن بە دۆستی (گیانی)تان.

﴿يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ وَيُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴾ سورة القلم: ٤٢.

واتە: لەڕۆژێکدا خوای گەورە لاقی پیرۆزی دەردەخات (باوەڕمان پێیەتی و چۆنیەتیەکەی نازانین) بانگ دەکرێن بۆ نوێژکردن و سەجدە بردن و ناتوانن سەجدە ببەن.

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ ﴾ سورة البقرة: ٢٥٥ .

واتە: خوا ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نیە بێجگە لەو، هەمیشە زیندووی تەدبیرکەر و ڕاگری بوونەوەرە.

هەروەها جگە لەمانەش ئایەتی تر هەیە کە باسی سیفات دەکەن.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە گەورەترین و چاکترین و خۆشترین و بەپێزترین نازو نیعمەتێ کە ئەهلی بە هەشت بەدەستی دەهێنن لە قیامەتدا بینینی پەروەردگاریانە بە چاوی خۆیان، سەردانی دەکەن، خوای پەروەردگار قسەیان لەگەڵ دەکات و، ئەوانیش قسەی لەگەڵ دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ﴾ سورة القيامة: ٢٢ – ٢٣.

واتە: زۆر روخسار لەو ڕۆژەدا گەشاوەن. تەماشای پەروەردگاریان دەکەن.

ئەهلی سوننەو جەماعە لە قیامەتدا پەروەردگاری خۆیان دەبینن وەك چۆن لەشەوی چواردەدا مانگ دەبینن، لەبینینی دا توشی هیچ زەحمەتێ نابن، هەر وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەم فەرمودەدا هەواڵی داوە دەفەرموێت:

(إنكُمْ سَتَرَوْنَ رَبكُم كَمَا تَرَوْنَ القَمَرَ لَيلةَ البَدرِ، لا تُضامُونَ فِي رُؤيَتِهِ)[١].

واتە: ئێوە لە قیامەتدا پەروەردگاری خۆتان دەبینن وەك چۆن لەشەوی چواردەدا مانگ دەبینن، لەبینینی دا توشی هیچ زەحمەتیێ نابن.

ئەهلی سوننەو جەماعە باوەڕیان وایە کە خوای گەورەو پەروەردگار هەموو شەوێ لەکۆتایی سێیەکی شەودا دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، بەڵام دابەزینێ کە شایەنی گەورەیی شکۆمەندی و کەمالی ئەو بێت، بەبێ چۆنیەتی بۆ دانان ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین بەس خوا خۆی دەیزانێ.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

(يَنزِلُ رَبُّنا كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ وَمَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ وَمَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟)[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: خوای گەورەو پەروەردگار هەموو شەوێ لەکۆتایی سێیەکی شەودا دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، دەفەرموێت: کێ داوام لێ دەکات و دەپاڕێتەوە هەتا وەڵامی بدەمەوە، کێ داوام لێ دەکات هەتا پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆشبونم لێ دەکات تا لێی خۆش ببم.

ئەهلی سوننەو جەماعە باوەڕیان وایە کە خوای گەورەو پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا دێت، هەروەها مەلائیکەکانیش پۆل پۆل دێن بۆ جیاکردنەوەی بەندەکان و لێپێچینەوەیان؛ بە هاتنێ کە شایەنی گەورەیی شکۆمەندی و کەمالی ئەو بێت بەبێ چۆنیەتی بۆ دانان ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین بەس خوا خۆی

(١) - متفقٌ عَلَيْهِ.

(٢) - متفقٌ عَلَيْهِ.

دەیزانێ، وەك چۆن خوا خۆی وەسفی کردووە لە قورئانە بەرزو پیرۆزەکەیدا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴿٢١﴾ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴾ سورة الفجر: ٢١ - ٢٢.

واتە: نابێ وابکەن! کاتێ کەزەوی بەتوندی درا بەیەکداو پارە پارە کرا. پەروەردگارت دێت و مەلائیکەکانیش پۆل پۆل دێن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ﴾ سورة البقرة: ٢١٠.

واتە: ئایا ئەوانە چاوەڕوانن خوایان بۆ بێت لە ناو چەند پارچە هەورێکی سپی دا، هەروەها مەلائیکەکان (یان بۆ بێ)، کارەکە کۆتایی پێ بێت.

ڕێگەو ڕێباز و بەرنامەی ئەهلی سوننەو جەماعە دەربارەی باوەڕهێنان بە خوا کورت دەبێتەوە لەمانەدا: بە باوەڕبونێکی لێوان لێو لەڕاستی، بەدان پێدانانێکی تەواو جێگیر و دامەزراو، بە خۆبەدەستەوەدانێکی تەواو، بەوەی کە خوای گەورە هەواڵی داوە لە قورئانەکەیدا، پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی داوە لە سوننەتەکانیدا، کاریان پێ بکەین لەهەموو رویەکەوە بەبێ ئەوەی لێی لابدەین، یان بیگۆڕین، یا تەئویلی بۆ بکەین و ماناکەی تێك بدەین، ، یان ماناکەی پەکبخەین، بەبێ چواندن و بێ ئەوەی چۆنیەتی بۆ دابنێین، بەبێ گومان و دوودڵی و ڕاڕایی، بەڵکو دەبێ باوەڕت هەبێت، خۆبەدەستەوەدانی تەواوت هەبێ، هەروەها کردەوەی پێ بکەیت؛ هەروەك پێشەوای تابعی شوێنکەوتوی صەحابەو شەرعزان موحەممەدی کوڕی موسلیمی زوهری، ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت:

(پەیام ناردن لەلایەن خواوەیە، گەیاندنی لەسەر پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، لەسەر ئێمەش خۆبەدەستەوەدانی تەواو و کار پێ کردنیەتی[1].

(١) - أخرجه الإمام البغوي في: « شرح السنة.

هەروەك پێشەوا سوفیانی كوڕی عویەینە، ڕەحمەتی خوای لێ بێ - كە فەرمودەی زۆری لەبەر بووەو حوجەی سەردەمی خۆی بووە - دەڵێت: (هەموو ئەو شتانەی كە خوای گەورە وەسفی خۆی پێ كردووە لە قورئاندا، هەر خوێندنەوەكەی خۆی بۆ خۆی تەفسرەكەیەتی و پێویست بە راڤەكردن ناكات، بەڵام بەبێ چۆنیەتی بۆدانان و هاوشێوە بۆدانان)[1].

هەروەها وەك چۆن پێشەوا شافیعی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (باوەڕم هێناوە بە خوای گەورە، بە هەموو ئەو شتانەی كە لەبارەی خواوە هاتووە لەسەر ئەو شێوەیەی كە خوای گەورە خۆی مەبەستی بووە، باوەڕم هێناوە بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و بەوەشی كە لەبارەیەوە هاتووە بەو شێوەیەی كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی مەبەستی بووە)[2].

پێشەوای (دار الهجره) ئەو شوێنەی كە كۆچی بۆ كرا واتە شاری مەدینەی منەووەرە مالیكی كوڕی ئەنەس ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (هۆشیار و ئاگاداری بیدعە بن لە دیندا هەر هەمووی گومرایی یە!! وترا: بیدعە چی یە؟ وتی: ئەهلی بیدعە یان بیدعەچیەكان؛ ئەوانەن كە قسە دەكەن لەبارەی ناوەكانی خوای گەورەو، سیفاتەكانی و، (كلام) قسەكردنی و، زانیاری و، تواناو دەسەڵاتی، بەڵام بێ دەنگ نابن لەو شتانەی كە هاوەڵان و شوێنكەوتوانیان لە چاكەدا لێی بێ دەنگ بوون)[3].

پیاوێ سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ لە پێشەوا مالیكی پرسی وتی: خوای پەروەردگار چۆن بەرزبووەوە بۆ سەر عەرش؟ وتی: بەڕاستی

(١) - رواه الإمام اللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٢) - انظر: « لمعة الاعتقاد الهادي إلى سبيل الرشاد للإمام ابن قدامة المقدسي.

(٣) - أخرجه الإمام البغوي في: « شرح السنة.

(الاستواءُ) بەرزبونەوە شتێکی ئاشکراو دیارەو نەزانراو نیە، چۆنیەتیەکەی عەقڵ پەی پێ نابات و نەزانراوە، باوەڕهێنان بە (الاستواءُ)بەرزبونەوە واجبە، پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە، من وادەبینم کە تۆ پیاوێکی گومڕای، بۆیە فەرمانی کرد کە دەریکەن لەو کۆڕو دانیشتەدا)[١].

پێشەوا ئەبو حەنیفە، رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (بۆ هیچ کەسێك نیە دەربارەی زاتی (الله) بە هیچ شێوەیەك قسە بکات واتە بدوێ لەوبارەوە، بەڵکو پێویستە لەسەری وەسفی (الله) بکات بەو شێوەیەی کە خوا خۆی وەسفی کردووە، بە بیرو بۆچونی خۆی هیچ شتێ لەوبارەوە نەڵێ؛ پاك و پیرۆزی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان)[٢].

هەروەها دەڵێت: (ئەوکەسەی ئینکاری ئەوە بکات کە خوای گەورەو شکۆمەند لە ئاسمانە؛ ئەوە کافرە)[٣].

کاتێ کە پرسیار کرا لە پێشەوا ئەبو حەنیفە سەبارەت بە سیفەتی دابەزینی خوای پەروەردگار بۆ ئاسمانی دونیا، رەحمەتی خوای لێ بێ وتی: (دائەبەزێ بەڵام بەبێ چۆنیەتی بۆدانان).

وەلیدی کوڕی موسلیمی قورەشی دەڵێت: (سەبارەت بەو فەرمودانەی کە هاتون دەربارەی سیفاتی بینینی خوای پەروەردگار پرسیارم کرد لەم پێشەوایانە: ئەوزاعی و سوفیانی کوڕی عویەینە و مالیك؟ هەر هەموویان وتیان: (تێی پەڕێنە وەك چۆن هاتووە؛ بە بێ چۆنیەتی بۆ دانان)[٤].

(١) – أخرجه الإمام البغوي في: « شرح السنة.

(٢) – انظر: (شرح العقيدة الطحاوية).

(٣) – رواه الإمام الذهبي في : (العلو للعلي الغفار).

(٤) – أخرجه الإمام البغوي في: « شرح السنة، واللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد).

پێشەوای (حافظ) نوعەیمی کوڕی حەممادی خوزاعی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (هەرکەسێك وێکچواندن (تشبیه)ی خوای گەورە بکات بە دروستکراوەکانی ئەوە کافرە، هەرکەسێ ئینکاری ئەو وەسفە بکات کە خوای گەورە خۆی وەسفی خۆی پێ کردووە ئەوەش کافرە، ئەوەی کە خوای گەورە وەسفی خۆی پێ کردووە یان پێغەمبەرەکەی وەسفی کردووە ئەوە وێکچواندن(تشبیه) نی یە[١].

هەندێ لە پێشەوایانی سەلەف ڕەحمەتی خوایان لێ بێ دەڵێن: (پێی دینی ئیسلام جێگیر و دامەزراو نابێ ئیللا لەسەر پردی خۆبەدەستەوەدان نەبێت)[٢].

پێشەوای ئیبنو قودامەی مەقدیسی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (لەسەر ئا ئەمە ڕۆیشتون پێشەوایانی سەلەف و خەلەف خوا لێیان ڕەزای بێ هەر هەموویان ڕێکەوتون یەکدەنگ و تەبان لەسەر جێگیرکردن و تێپەڕاندن و چەسپاندنی ئەو شتانەی کە دەربارەی سیفات هاتوون لە قورئان سوننەدا بەبێ بەگژدا چونەوە، بۆ ڕاڤەکردنیان واتە بڵێین ڕاڤەکەی وا نیە وایە، بەدڵنیایی فەرمانمان پێکراوە بەوەی شوێن پێی ئەوانە هەڵگرین واتە شوێن پێی سەلەفی صالح، ئەوانە بکەینە نیشانەی سەرمەشق و هیدایەت ڕێنمویی خۆمان)[٣].

### ئەهلی سوننەو جەماعە:

ئەهلی سوننەو جەماعە بەرین و دوورن لە ڕێچکەکانی ئەوانەی کە سیفەتاکانی خوای گەورە پەکدەخەن، دورن لە ئەوانەی کە دەیچوێنن، لەوانەی کە دەڵێن ئێمە جێگیری دەکەین بەڵام ماناکەی نازانین، سوپاس بۆ خوای پەروەردگار.

---

(١) – رواه الإمام الذهبي في : (العلو للعلي الغفار).

(٢) – أخرجه الإمام البغوي في: « شرح السنة.

(٣) – انظر: « لُمعة الاعتقاد الهادي إلى سبيل الرشاد للإمام ابن قدامة المقدسي .

ئا ئەمەی کە باسمان کرد عەقیدەی سەلەفی صالّح ئەهلی سوننە و جەماعە، ئەوانەش وتەی پێشەواکانیان بوو سەبارەت بە باوەڕبوون بە خوای پەروەردگار؛ هەر کەسێك رێگەو رێبازی ئەوان بگرێت ئەوە خۆی پابەندکردووە بە بەرنامەی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) و بە بەرنامەی هاوەڵە بەڕێزەکانیەوە، رەزاو رەحمەتی خوای پەروەردگار لەهەر هەموویان بێ.

## پایەی دووەم

## باوەڕهێنانە بە مەلائیکەکان

باوەڕهێنان بە مەلائیکەکانی خوای پەروەردگار: بریتیە لە باوەڕهێنان بە بوونیان، بەراست دانانی ئەو کردەوانەی کە پێی هەڵەسن لەم گەردونەدا؛ ئەوانە دروستکراوێکن لە جیهانی (غیب)پەنهان و نادیاردا ئێمە نایانبینین، بەڵام ئێمە باوەڕمان پێیان هەیە باوەڕێکی جێگیر کە بە هیچ جۆرێك گومان و دوودڵی لەدەرگای ئەو باوەڕە نەدات، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ۚ ﴾ سورة البقرة: ٢٨٥.

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بڕوای هێنا بەو نامەیەی کە بۆی نێرراوە لەلایەن پەروەردگاریەوە، لەگەڵ بڕواداراندا هەموو بڕوایان هێناوە بە خوا و مەلائیکەکانی و نامەکانی و پێغەمبەرانی، جیاوازی ناکەین لەنێوان هیچ یەکێك لە پێغەمبەرانی.

هەرکەسێ ئینکاری بوونی مەلائیکەکانی خوای پەروەردگار بکات؛ ئەوە بەدڵنیاییەوە (کافر)بێ باوەڕ بووە، بە بەڵگەی ئەم ئایەتەی خوای گەورە؛

﴿ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾ النساء: ١٣٦.

واتە: هەر کەسێك بێ باوەڕ بێت بەخوا و بە مەلائیکەکانی و بە کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی، ئەوە بەراستی گومڕا بووە بەگومڕاییەکی زۆر دوور (لەڕاستی).

ئەهلی سوننەو جەماعە؛

باوەڕیان بە مەلائیکەکان هەیە بە کورتی و بە درێژی: بە کورتی باوەڕیان هەیە بەوانەیان کە ناویان نەهاتووە، بە دوورو درێژی؛ باوەڕیان هەیە بەوانەیان کە جێگیر بووە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) ناویان هێناون وەك؛ جبریل کە راسپێرراوە بە گەیاندنی وەحی لەلایەن خواوە بە پێغەمبەران، میکائیل کە راسپێرراوە بە باران بارین، ئیسرافیل کە راسپێرراوە بە فوکردن بە کەڕەنادا، مەلائیکەی رۆح کێشان کە راسپێرراوە بە کێشانی رۆحەکان، مالیك کە راسپێرراوە بە خازن دەرگەوانی دۆزەخ.

ئەهلی سوننەو جەماعە؛

باوەڕیان بە بوونی مەلائیکە بەڕێزەکان هەیە، ئەوانە لە ئاسماندا نیشتەجێن، بەندەی دروستکراون خوای گەورەن و لە روناکی(نور) دروستی کردوون، بەڕاستی بوونیان هەیەو، دروستکراوێکی پەنهان نین، لەپێش باوکە ئادەمەوە سەلامی خوای لەسەر بێ دروستکراون.

مەلائیکە رواڵەت و دیمەنیان گەورەیە: هەیانە خاوەنی دوو باڵە، هەیانە خاوەنی باڵە، هەیانە خاوەنی چوار باڵە، هەیانە خاوەنی زیاتریشن، جێگیربووە کە جبریل سەلامی خوای لەسەر بێ شەش سەد باڵی هەیە، هەر باڵێکی پانتایی ئاسمانی داگیرکردووە.

باوەڕیان وایە کە مەلائیکەکان خاوەنی هێز و توانایەکی گەورەن، سەربازن لە سەربازەکانی خوای گەورە؛ بەڵکو گەورەترین سەربازن لە سەربازانی خوای خاوەن دەسەڵات، لە توانایاندا هەیە خۆیان بگۆڕن بە چەندین شێوەی جیاواز، ، لە توانایاندا هەیە خۆیان بگۆڕن بە چەندین شکڵ و شێوەی جسمانی جیاواز جیاواز، بەگوێرەی ئەو بار و دۆخەی کە پێویست دەکات خۆیان دەگۆڕن ئەگەر خوای

گەورە روخسەتیان بدا ویستی لەسەر بێ، مەلائیکەکان دەجولێن و، بەرزدەبنەوەو سەردەکەون و، دێنەخوارەوە و دادەبەزن.

باوەڕیان وایە کە مەلائیکە بەڕێزەکان زۆر زۆر و بێ شومارن ؛ جگە لە خوای گەورە هیچ کەس ژمارەیان نازانێت و ناتوانێت بیان ژمێرێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾ سورة المدثر: ٣١.

واتە: هیچ کەسێك نازانێت ژمارەی سەربازانی خوای خوای گەورە چەندە مەگەر خۆی، ئەم ئایەت و بەڵگانە تەنها پەندو ئامۆژگارین بۆ ئادەمیزاد.

مەلائیکەکان بەندەی لە خواوە نزیکن و رێز گیراون؛ وەسف ناکرێن بە نێر و مێیەتی واتە نێر و مێیان نیە، ژن و ژنخوازی لەنێوانیاندا نیە ژیانی هاوسەرگیری پێك ناهێنن و زاوزێ ناکەن و وەچە ناخەنەوە، ناخۆن و ناخۆنەوە، وەڕس و بێزار و بێ تاقەت و ماندو نابن لە پەرستشی خوای گەورە، وەسف دەکرێن بەم سیفەتانە: جوان و پێکەوتەن، بە شەرم شکۆ و بەحەیان، رێك و پێکن، کاروکردەوەیان ژیرانەو دانایانەیە، خاوەنی سیفەتی سوپاس کراون.

مەلائیکەکان؛ لە خوای گەورە دەترسن، شەو و رۆژ بەردوام زیکر و تەسبیحاتی خوای پەروەردگار دەکەن،،تەواف (بيت المعمور) دەکەن کە لە ئاسمانی حەوتەمدایە.

باوەڕیان وایە کە مەلائیکەکان جیاوازن لە مرۆڤەکان، بەوەی کە راهێنراون لەسەر گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار و سەرپێچی نەکردنی، خوای پەروەردگار دروستی کردون بۆ پەرستنی خۆی و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی، خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَانَهُ ۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ ﴾ سورة الأنبياء: ٢٦ – ٢٨.

واتە: (وەبێ باوەڕان) وتیان: خوای میهرەبان مندالّی بۆ خۆی بڕیارداوە (کە مەلائیکەکانن)، پاکو بێگەردە خوا (لەم شتانە)، بەڵکو ئەوانە (مەلائیکە) بەندەی ڕێز گیراوی (خوا) ن. لە خوا پێش ناکەون بەقسەو وتە، ئەوان بەفەرمانی خوا کار دەکەن. (خوا) دەزانێ، ئاگادارە بە ئەوەی لەدنیا لەبەر دەستیاندایە، بە ئەوەی لەڕۆژی دواییدا بۆیان ئامادەکراوە، (مەلائیکەکان) تکا ناکەن، تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێ (خوا) ڕازی بێ (تکای بۆ بکرێ)، ئەوان (مەلائیکەکان) لەترسو هەیبەتی خوا زۆر دەترسن.

باوەڕیان وایە کە مەلائیکەکان بە هیچ جۆرێ (غیب) نازانن مەگەر شتێ کە خوا خۆی فێریان بکات و ئاگاداریان بکات لێی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا ۖ إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ﴾ سورة البقرة: ٣٢.

واتە: هەموو وتیان: خوا تۆ پاکیت لە هەڵە، ئێمە هیچ نازانین مەگەر ئەوەی کە خۆت فێرت کردبین، بەڕاستی هەرتۆیت زاناو دانا.

مەلائیکەکان ناچنە ماڵێکەوە پەیکەر و وێنە و سەگی تێدا بێت، هاوڕێیەتی کاروانێ ناکەن تیایدا جەرەس هەبێ، ئازار دەچێژن بە هۆی ئەوە کە ئادەمیزادەکان ئازاری پێ دەچێژن.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلَا صُورَةٌ)[١]. واتە: مەلائیکە ناچنە ماڵێکەوە سەگ و وێنەی تێدا بێت — بێگومان ئەمە سەگی پاسەوانی ناگرێتەوە — .

هەروەها دەفەرموێت: (لاَ تَصْحَبُ الْمَلاَئِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا كَلْبٌ وَلاَ جَرَسٌ)[٢]. واتە: مەلائیکەکان هاورێیەتی کاروانێ ناکەن کە سەگ و جەرەسی تێدا بێت.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە خوای گەورە مەلائیکە بەڕێزەکانی پەنهان کردووە لە ئێمەو نادیارن، هەرگیز ناتوانین بیانبینین لەسەر ئەو شێوەیە کە خوای پەروەردگار دروستی کردون، بەڵام دەریخستون بۆ هەندێ لە بەندەکانی خۆی، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دووجار جوبرەئیلی بینیوە لەسەر ئەو شێوەیەی کە خوای گەورە دروستی کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴾ سورة النجم: ١٣ – ١٤.

واتە: سوێند بەخوا بێگومان جارێکی تر جوبرەئیلی بینیوە. لای درەختی (سدرة المنتهى).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴾ سورة التكوير: ٢٢ - ٢٣.

واتە: هاوڕێکەتان (کە موحەممەدە) شێت نیە (وەك ئێوە دەیڵێن). سوێند بە خوا بێگومان (مەلائیکەی سروشی) دیوە لە ئاسۆی روندا.

ئەهلی سوننەو جەماعە؛ باوەڕیان وایە کە مەلائیکەکان لەسەر شکڵ و شێوەی جۆراوجۆری زۆرن و کاروباریان جیاوازە:

(١) – متفقٌ عَلَيْهِ.

(٢) – رواه مسلم.

هەیانە راسپێرراون بە هەڵگرتنی عەرش، هەیانە راسپێرراون بە گەیاندنی وەحی، هەیانە راسپێرراون بە کاروباری کێوەکان، هەیانە راسپێرراون بە خازن دەرگەوانی بەهەشت، هەشیانە خازن دەرگەوانی دۆزەخە.

هەیانە راسپێرراون بە پارێزگاری کردنی کردەوەی چاك یان خراپی بەندەکان، هەیانە راسپێرراوە بە روح کێشانی باوەڕداران، هەیانە راسپێرراوە بە روح کێشانی کافران، هەیانە راسپێرراون بە کاری پرسیارکردن لە بەندەکان لە گۆڕدا.

هەیانە دەپارێنەوە بۆ باوەڕداران و داوای لێ خۆش بونیان بۆ دەکەن بۆیان دەپارێنەوەو درودو سڵاویان بۆ دەنێرن، هەیانە ئامادەی کۆڕ و دانیشتنەکانی زانستی شەرعی و زیکر و یادی خوا دەبن و؛ چواردەوریان دەدەن و دایان دەپۆشن بە باڵەکانیان.

هەیانە دەبنە هاورێی مرۆڤ و لێی جیا نابنەوە، هەیانە رۆژانە بانگی بەندەکان دەکات بۆ ئەنجامدانی کاروکردەوەی چاك، هەیانە کاتێ کە باوەڕدار دەپارێتەوە لەدوای پاڕانەوەکەی دەڵێن (آمین) واتە خوا پاڕانەوەکەت لێ قبوڵ بکات، بەوەش پاڕانەوەکەی نزیکترە بۆ وەڵامدانەوە.

هەیانە راسپێرراون بەوەی کە پارێزگاری لە پیاوچاکان بکەن، لەگەڵ دەرو لێ کردنەوەیان لەکاتی تەنگانەداو بەڵاو ناخۆشیەکانیان لەسەر لادەبات، هەیانە ئامادەی بەخاك سپاردنی مرۆڤە چاکەکان دەبن، هەیانە لەگەڵ باوەڕداراندا دەجەنگن و جێگیر و دامەزراویان دەکەن لەکاتی جیهاد و تێکۆشانەکەیاندا بەرامبەر بە دوژمنانی خوای گەورە.

هەیانە کاریان ئەوەیە نەفرەت لە بێ باوەڕان دەکەن، لەگەڵ دابەزاندنی سزای سەخت بۆیان واتە خوای پەروەردگار بە هۆی فریشەکانەوە سزایان دەدات.

هەیانە راسپێرراون بەوەی کە پارێزگاری بکەن لە مەککە و مەدینەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەتا دەججال نەچێتە ناوی.

مەلائیکەکان هەیانە کاریان ئەوەیە سڵاوات دەدەن لەدیداری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و درود دەنێرن بۆ باوەڕداران و، بۆیان دەپاڕێنەوە و داوای لێ خۆشبونیان بۆ دەکەن، هەشیانە سڵاواتی موسوڵمانان دەگەیەنن بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

## پایەی سێهەم

## باوەڕهێنانە بە کتێبە ئاسمانیەکان

ئەهلی سوننەو جەماعە، باوەڕیان وایە بە باوەڕبونێکی تەواو و جێگیر بەوەی کە خوای گەورە کۆمەڵە کتێبێکی دابەزاندۆتە سەر پێغەمبەرەکانی، ئەم شتانەی تێدایە: فەرمانەکانی، قەدەغەکراوەکانی، بەڵێنەکانی، هەڕەشەکانی، هەروەها ئەوەی کە خوای گەورە ویستویەتی لە دروستکراوەکانی کە بۆی جێ بەجێ بکەن، جگە لەو خوایەی کە دایبەزاندون هیچ کەسێك ژمارەی ئەو کتێبانە نازانێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ ﴾ سورة البقرة: ٢٨٥.

واتە: پێغەمبەر بڕوای هێنا بەو نامەیەی کە بۆی نێرراوە لەلایەن پەروەردگاریەوە، لەگەڵ بڕواداراندا هەموو بڕوایان هێناوە بە خوا و مەلائیکەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی، جیاوازی ناکەین لەنێوان هیچ یەکێك لە پێغەمبەرانی.

بەڕاستی هەموو ئەم کتێبانە تیاندا هەیە هیدایەت و ڕێنومایی و نور و ڕووناکی، شیفان بۆ نەخۆشیەکانی دڵەکان، خوای گەورە کتێبەکانی دابەزاندووەتە سەر پێغەمبەرەکانی بۆ هیدایەت و ڕێ نیشاندەر و ڕێنمایی هەموو گرۆی ئادەمیزاد بە گشتی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴾ سورة إبراهيم: ١.

واتە: بە(ئەلیف لام ڕا) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی، ئەمە کتێبێکە ناردومانەتە خوارەوە بۆ تۆ (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) بۆ ئەوەی خەڵکی ڕزگار بکەیت لەتاریکیەکانەوە بۆ ڕووناکی، بەئیزنی پەروەردگاریان (ڕێنموونیان بکەیت) بۆ ڕێگای (خوای) بەدەسەڵاتو زاڵی سوپاس کراو.

ئا لەو کتێبانەی کە لەدوو وەحیەکەدا جێگیربوون واتە لە قورئان سونئەدا بریتین لە: قورئان – کە بۆ موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) رەوانە کراوە – ، تەورات – کە بۆ موسا رەوانە کراوە – ، ئینجیل – کە بۆ عیسا رەوانە کراوە – ، زەبور – کە بۆ داود رەوانە کراوە – ، (صحف) – کە بۆ ئیبراهیم و موسا رەوانە کراون – ، گەورەترینی ئەم کتێبە ئاسمانیانە بریتین لەم سیانە: قورئان و تەورات و ئینجیل، لەناو ئەو سیانەشدا گەورەترینی ئەم سیانەو (ناسخ)هەڵوەشێنەرەوەیان و چاکترینیشیان بە رەهایی قورئانی گەورە و پیرۆزە.

خوای پەروەردگار دەستەبەری پاراستنی هیچ شتێ لەم کتێبانەی نەخستە ئەستۆی خۆیەوە جگە لە قورئانی پیرۆز کە تاکە پەیامی خواییە بەڵێنی پاراستنی درابێ، بەڵام کتێبەکانی تری دایە دەست زاناکانی جولەکەو خواپەرستەکان بۆ ئەوەی بیپارێزن، بەڵام ئەوان پارێزگارییان لێ نەکرد، بەڕاستی نەیانتوانی بە چاکی چاودێری بکەن و، وتەکەی خوایان گۆڕی بۆ قسەی خۆیان گۆڕانکاریان تێیاندا کرد؛ بنچینەکەیان ونکردو، ئەحکامەکانیان گۆڕی، یەکەم کتێبێ لەوانە کە گۆڕرا بریتی بوو لە تەورات.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە باوەڕهێنان بە کتێبە پێشووەکان باوەڕهێنانێکی گشتی یە ئەوەندەیە کە لەلایەن خواوە هاتوون و بۆ کات و سەردەمێکی تایبەت بوون، پێویستە بەدڵ و بە زمان دانیان پێدا بنرێت، بەڵام باوەڕهێنان بە قورئان باوەڕهێنانێکی تایبەتە دەبێت بە دوورودرێژی باوەڕمان پێی هەبێ کە لەلایەن خواوە هاتووە بۆ هەموو کات و سەردەمێکە، بەدڵ و بە زمان دانی پێدا بنێین و کردەوەی پێ بکەین، شوێنی ئەوە بکەوین کە تێیدا هاتووە، پێویستە لەسەرمان بیکەینە بەرنامەی ژیان لە هەموو شتێکی گەورەو بچوکێکداو حوکمی پێ بکەین.

**قورئانی گەورەو پیرۆز:**

بریتیە لە وتەو کەلامی خوای گەورەی جیهانیان، بریتیە لە کتێبە روون و ئاشکراکەی، لە پەتە بەهێزەکەی واتە بریتیە لە شەریعەت و بەرنامە پتەوەکەی، خوێندنەوەی پەرستشە، خوای گەورە دایبەزاندۆتە سەر موحەممەدی کوڕی (عبدالله) (صلی الله علیه وسلم) هەتا هەموو کتێبەکانی پێش خۆی پێ تەواو بکات واتە دواهەمین پەیام بێت بۆ هەموو بەشەریەت؛ هەر وەك چۆن موحەممەد کوڕی (عبدالله) (صلی الله علیه وسلم) دواهەمین پێغەمبەرانەو لەدوای ئەو پێغەمبەری تر نایەت، بۆ ئەوەی قورئان ببێتە بەرنامەو پرۆگرام بۆ هەموو ئوممەت، هەتا ببێتە هۆکارێك خەڵك دەرباز بکات لەتاریکییەکانەوە بۆ ڕووناکی، هۆکاری هیدایەتە بۆ ڕێنمایی خەڵك و بۆ خستنیانە سەر ڕێگەی ڕاست.

بەڕاستی خوای گەورە تێیدا رونکردۆتەوە هەواڵی پێشینان و پاشینان، لەگەڵ ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەران و پیاوچاکان و، دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی لە تیایاندایە، بە درێژی باسی حەڵاڵ و حەرامی تێدا کردووە، باسی بنچینەکانی ئاداب و ئاکار و ڕەوشتە بەرزەکانی تێدا رونکردۆتەوە، باسی یاسا و ئەحکامەکانی پەرستشەکان و مامەڵەکان کڕین و فرۆشتنی تێدا رونکردۆتەوە، باسی پاداشتی باوەڕداران و سزاو تۆڵەی بێ باوەڕانی تێدا رونکردۆتەوە، خوای گەورە لە قورئاندا وەسفی خۆشیەکانی بەهەشتی کردووە کە خانەو لانەی باوەڕدارانە، هەروەها وەسفی ناخۆشیەکانی دۆزەخی کردووە کە خانەو لانەی بێ باوەڕانە، قورئان شیفایە بۆ دڵ و دەروونی باوەڕداران، رونکەرەوەی هەموو شتێکە، هیدایەت و ڕێنمایی و ڕەحمەت و میهرەبانیە بۆ موسوڵمانان، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾ النحل: ٨٩.

واتە: ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆت کە رونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێ، رێنموونیو میهرەبانیو مژدەیە بۆ موسولمانان.

پێویستە لەسەر هەموو ئوممەت کە شوێنی بکەون و حوکمی پێ بکەن و، بگەرێنەوە بۆ یاساو ئەحکام و بڕیارەکانی، لەگەڵ ئەوەی کە لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتووە بەڕاست و دروست؛ لەبەرئەوە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ناردووە بۆ سەر ئادەمیزاد و جنۆکە؛ هەتا بۆیان ڕوون بکاتەوە ئەوەی لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆیان دابەزێنراوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ سورة النحل: ٤٤.

واتە: لەگەڵ چەندین بەڵگەو پەڕاوی ئاسمانی و قورئانیشمان بۆ تۆ نارد بۆ ئەوەی ڕوونی بکەیتەوە بۆ خەڵکی ئەوەی بۆیان نێردراوەتە خوارەوە، بەڵکو بیربکەنەوە و تێ بگەن.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە قورئان بەڕاستی وتەو کەلامی خوای گەورەیە – پیتەکانی و ماناکەی – لەلایەن خۆیەوە دەستی پێکردووەو هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێتەوە، لەلایەن خواوە دابەزێنراوەو دروستکراو نیە، خوای گەورە بەدەنگێکی راستەقینەی بیستراو قسەی پێ کردووە بە شێوەیە کە شایەن و شایستەی گەورەیی و شکۆمەندی و تەواوی خۆیەتی، جبریل سەلامی خوای لەسەر بێ لەخوای گەورەی وەرگرتووەو لێی بیستوەو گەیاندویەتی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە جبریلی وەرگرتووە و لێی بیستوەو و لەبەری کردووەو گەیاندویەتی بە هاوەڵە بەڕێزەکانی، لەپاشدا بە ئوممەتەکەی، نەتەوەو گەلانی تری پێ ئاگادار کراوەتەوە، لەلایەن زاناو دروستکاری وردبینەوە

بەزمانێکی عەرەبی روونو رەوان دابەزێنراوە، بە تەواتوری بۆمان گوێزراوەتەوە – (تواتر) واتە بۆمان گوێزراوەتەوە لەچەند رێگەیەکی جیاوازەوە کە هەموویان صەحیحن – کە بە هیچ جۆرێك گومان و دوودڵی خۆی نادات لە قەرەی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴾ سورة الشعراء: ١٩٢ – ١٩٥.

واتە: بەڕاستی ئەم (قورئان)ە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە. جوبریلی ئەمین هێنایە خوارەوە. بۆ سەردڵی تۆ بۆ ئەوەی لەترسێنەران بی. بەزمانێکی عەرەبی روونو رەوان.

**قورئانی گەورەو پیرۆز:**

وەك تەورات بە نوسراوی دانەبەزێنراوە، هەروەها بە یەکجار دانەبەزێنراوە بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)؛ بەڵکو بە شێوەی جیا جیا لەماوەی بیست و سێ ساڵدا هاتەخوارەوە بۆ ئەوەی لەبەر بکرێت و بیشپارێزرێت، واتە: بە شێوەی جیا جیا بەپێی پێویستی بارودۆخ و حاڵەتەکان، یان وەك وەڵامدانەوەیە هاتۆتەخوارەوە بۆ وڵامی پرسیارێ.

**قورئانی گەورەو بەرێز:**

پارێزراوە لە (لوح المحفوظ)دا، (لوح المحفوظ)هەموو شتێکی تێدا نوسراوە قورئان پارێزراوە لە دڵ و سنگی ئەو کەسانەدا کە زانیارییان پێ دراوە، زمانەکان دەیخوێننەوە، دڵەکان لەبەری دەکەن، نوسراوەتەوە لە (صحف)پەڕەکاندا، قورئان پێکهاتووە لە کۆمەڵە سورەتێکی جوان و ورد سورەتەکانی لەیەکدی جودان و هەر سورەتێك بۆ خۆی جیاکراوەتەوە لە سورەتەکەی تر، ئایەتەکانی روون و ئاشکران، هەروەها لە پیتەکان و وشەکان پێکهاتووە؛ لە قورئاندا (محکم) و (متشابه) هەیە،

(محكم) ئەوەیە واتاكەی روون و ئاشكرایە، (متشابه) ئەوەیە واتاكەی روون و ئاشكرا نیەو شاراوەیە، (ناسخ) هەڵوەشێنەر و (منسوخ) هەڵوەشاوەیە (ناسخ) واتە ئەوەی پێشوی رەتكردۆتەوە، بریتیە لە كۆمەڵە ئایەتێكی تایبەت(خاص) و كۆمەڵە ئایەتێكی گشتی(عام)، بریتیە لەفەرمانكردن(أمر) و قەدەغەكردن(نهي)، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ٧٧ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ٧٩ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ سورة الواقعة: ٧٧ – ٨٠.

واتە: بێگومان ئەمە قورئانێكی گەورە و بەڕێزە. لەناو كتێبێكی شاراوەدایە كە (لوح المحفوظ)ە. جگە لە پاكان (مەلائیكە) كەس دەستی لێ نادات. نێردراوەتە خوارەوە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ ﴾ سورة العنكبوت: ٤٩.

واتە: (نەخێر وا نییە كە گومان دەبەن)، بەڵكو قورئان نیشانەكانی ئاشكران لە دڵ و دەرونی كەسانێكدایە كە زانستیان پێ دراوە (لە لایەن خواوە).

ئەهلی سوننەو جەماعە:

ڕێكەوتون و تەبان لەسەر ژمارەی سورەتەكانی قورئان و پیتەكانی و وشەكانی، هەركەسێ ئینكاری سورەتێ یان ئایەتێ یا وشەیە یان پیتێكی بكات ئەوە كافرە، یان لێی زیاد بكات یان لێی كەم بكات، یا پێی وابێ ئایەتەكانی قورئان دژی یەكترن، یان پێی وابێ هەندێ شتی پڕو پوچ (خورافات)ی گرتۆتەخۆ، ئەهلی سوننەو جەماعە باوەڕیان هەیە بە باوەڕێكی جێگیر و تەواو بەوەی كە هەموو ئایەتێ لە ئایەتەكانی قورئان لەلایەن خوای گەورەوە دابەزێنراوە، بە دڵنیاییەوە

بۆمان گوازراوەتەوە بە ڕێگەیەکی تەواتوری بڕاوە (قطعي) کە هەرگیزاو هەرگیز گومان و دوودڵی خۆی نادات لە قەرەی.

قورئانی گەورەو بەڕێز:

گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) موحەممەدی کوڕی (عبدالله) بریتیە لە قورئان موعجیزەیەکی هەتا هەتایی یە، موعجیزەیە لە شێوازیدا، لە داڕشتنی دا، لە زانست و زانیارییەکانی ناوی دا، لە حوکم و بڕیاردانەکانی دا، لە تەشریع و یاساداناني دا، لە هەواڵەکانی دا، لە کاریگەری دا، لە بەڵێن و هەڕەشەکانی دا،،بریتیە لە کۆتاهەمین کتێب و پەیامی ئاسمانی، نەسخ نابێتەوەو واتە هەڵناوەشێنرێتەوەو گۆرانکاری تێدا ناکرێت، خوای گەورە بۆ خۆی دەیپارێزێ لە هەموو گۆڕان و شێواندنێ، لە گۆڕینی شتێ بە شتێکی تر، لە زیادەو هەموو کەموکورتیەك هەتا ئەو ڕۆژەی کە خوای پەروەردگار بەرزی دەکاتەوە واتە دەیباتەوە بۆ لای خۆی، ئەمەش لەپێش ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدات، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴾ سورة الحجر: ٩.

واتە: بێ گومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوەو، بەڕاستی هەر ئێمەش دەی پارێزین.

قورئانی گەورەو بەڕێز:

لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) نوسراوەتەوە بە سەرپەرشتی و خۆی؛ دەنوسرایەوە لەلایەن چاکترین کەس لە هاوەڵە بەڕێزەکانەوە، هەرگیز لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) جیانەدەبوونەوە هەر ئایەتێ یان هەر سورەتێ لە قورئان دابەزێنرایە یەکسەر دەیانوسیەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی جێگەی هەموو ئایەتێکی نیشان دەدان لەسورەتەکەی خۆیدا – دەیفەرموو ئەو

ئایەتە لەو سورەتەدایە، ئەو ئایەتە لەو سورەتەدایە – ؛ پاشان کۆکراوەتەوە لەسەردەمی پێشەوا ئەبو بەکری صدیق دا لە نێوان ئەو دوو بەرگە(مصحف)دا، لەسەردەمی پێشەوا (عثمان)ی (ذي النورين)دا لەسەر یەك جۆر خوێندنەوە کۆکراوەتەوە، بە سەرپەرشتی هاوەڵە خاوەن زانست و زانیارییەکان و ئەوانەی کە نووسەری وەحی بوون؛ رەزاو رەحمەتی خوا لەهەر هەموویان بێ.

قورئانی گەورەو بەڕێز:

ژمارەی سورەتەکانی بریتیە لە (١١٤) سورەت، (٨٦) یان لەشاری مەککە دابەزیون، و (٢٨)ەکەی تریشیان لەشاری مەدینە دابەزیون، ئەو سورەتانەی کە لەپێش کۆچکردندا بۆ مەدینە دابەزیون پێیان دەوترێت سورەتە مەککیەکان، ئەو سورەتانەش کە لەدوای کۆچکردن دابەزیون پێیان دەوترێت سورەتە مەدەنییەکان، (٢٩) سورەتیان بە پیتە پچڕ پچڕەکان دەست پێ دەکەن – وەك: الم، يس، كهيعص، طه – .

ئەهلی سوننەو جەماعە:

گرنگی زۆر دەدەن بە فێربوون و لەبەرکردن و خوێندنەوەی قورئان بەڕەوانی و بەدەنگی خۆش، هەروەها گرنگی زۆر دەدەن بە گوێ گرتن لێی و، بێ دەنگ بوون لەکاتی خوێندنەوەی دا، تەفسیرکردنی لەسەر بەرنامەو رێبازی سەلەفی ئوممەت، کاروکردەوە دەکەن بە ئەحکامەکانی لەهەموو گەورەو بچوکێکدا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ سورة ص: ٢٩.

واتە: (ئەم قورئانە) کتێبێکی پیرۆزە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ تۆ بۆ ئەوەی بیربکەنەوە لەئایەتەکانی، خاوەنانی بیر و ژیری پەندی لێ وەربگرن.

ئەهلی سوننەو جەماعە پەرستش دەکەن بە خوێندنەوەی قورئان؛ لەبەر ئەوە خوێندنەوەی هەر پیتێکی دە چاکەیە، چاکەش یەك بە دەیە، هەروەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەم فەرمودەدا هەواڵی ئەوەی داوە، دەفەرموێت:

(مَنْ قَرَأ حَرْفاً مِنْ كِتَابِ اللهِ فَلَهُ حَسَنَةٌ، وَالحَسَنَةُ بِعَشْرِ أمْثَالِهَا، لاَ أقول: الم حَرفٌ، وَلَكِنْ: اِلِفٌ حَرْفٌ، وَلاَمٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ)(١).

واتە: هەر کەسێ پیتێ لە قورئان بخوێنێتەوە چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت، چاکەش یەك بە دەیە، ناڵێم: (الم) پیتێکە، بەڵکو دەڵێم: (الف) پیتێکە، (لام) پیتێکە، (میم)یش پیتێکە.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

تەفسیرکردنی قورئانیان بە بیروبۆچونی رووت لەلا دروست نیە، چونکە قسەکردنە بە ناوی خوای گەورەوە لەسەر خوا بەبێ زانیاری، ئەمەش لەکردەوەی شەیتانە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ١٦٨ إِنَّمَا يَأۡمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلۡفَحۡشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ البقرة: ١٦٨ ـ ١٦٩.

واتە: ئەی خەڵکینە بخۆن لەوەی کە لە زەویدایە بەحەڵاڵی و پاکی، دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکراتانە. بەڕاستی شەیتان فەرمانتان پێ دەدات بەتاوان و خراپە لەگەڵ هەڵبەستنی شتی وا دەربارەی خوا کە نازانن.

بەڵکو ئەهلی سوننەو جەماعە تەفسیری قورئان دەکەن بە قورئان؛ ئەوانەی کە کورت (مُجْمَل)ن لەسەر ئەوانە ڕاڤەی دەکەن کە رون و ئاشکران(مُبَيَّن)، ئەوانەی کە

(١) ـ صحيح سنن الترمذي للألباني.

رەها(مُطلَق)ن لەسەر ئەوانە ڕاڤەی دەکەن کە (مُقَیَّد)ن، ئەوانەی کە گشتیەکان(عام) لەسەر تایبەتیەکان(خاص) ڕاڤەی دەکەن،(مُتَشَابِه)کان لەسەر (مُحکم)ەکان، هەروەها تەفسیری قورئان دەکەن بە سوننەتەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەوانەی کە جێگیرن، لەپاشدا تەفسیری قورئان دەکەن بە وتەی هاوەڵە بەڕێزەکان، ئینجا بە وتەی شوێنکەوتووە پایە بەرزەکانی صەحابە، ئینجا بە زمانی عەرەبی چونکە خوای گەورە قورئانی گەورەو شکۆمەندی بە زمانی عەرەبی دابەزاندووە، دوای ئەمانە هەوڵ دەدەن و کۆشش دەکەن لەبەر ڕۆشنایی ئەو سەرچاوانەی کە باسکران تەفسیری قورئان دەکەن، خۆیان پابەند دەکەن بە (ضوابِط)ە شەرعیەکانەوە، هەرگیز لە بنەماکانی تەفسیر دەرناچن؛ ئەوانە بەو کارەیان کە دەیکەن نێوانی ئەم دوانە کۆدەکەنەوە (أثر) ئەوەی بۆیان بە جێماوە و قورئان و سوننەو ... و (نظر) تێ ڕامانی خۆیان – هەڵئەسن بە تەفسیرێکی جوان وەك تەفسیری ابن کثیر و تەفسیری سەعدی و تەفسیری بەغەوی و ... – .

# پایەی چوارەم
## باوەڕهێنان بە پێغەمبەران

ئەهلی سوننەو جەماعە: باوەڕیان وایە بە باوەڕبونێکی تەواو و جێگیر بەوەی کە خوای گەورە پێغەمبەرانی هەڵبژاردووە لە پاکترین و چاکترینی بەندەکانی و خۆی و رەوانەی کردوون بۆ لای بەندەکانی بە موژدەدەر و ترسێنەر، کردونی بە بانگخوازانێ کە بانگی گرۆی ئادەمیزاد بکەن بۆ سەر دینی هەق و رێنماییان بکەن و دەرهێنانی بەندەکان لە تاریکیەکانەوە بۆ تاکە رووناکی ئیسلام، چونکە بەردەوام بانگەوازی پێغەمبەران بۆ رزگارکردنی گەلان بووە لە هاوبەش بۆ خوا دانان و بت پەرستی، بۆ پاککردنەوەی کۆمەڵگاکان بووە لە هەڵوەشانەوەی ئاکار و رەوشتە بەرزەکان و تاوان و خراپەکاری، ئەوانە بەڕاستی پەیامی خوایان گەیاند، ئەو ئەمانەتەی لەسەرشانیان بوو جێبەجێیان کرد، ئامۆژگاری گەلانی خۆیانیان کرد، بەڕاستی لەپێناوی خوادا تێکۆشان و جیهادیان کرد، ئەوانە لەکاتی گەیاندنی پەیامەکانیاندا پاك و بێ خەوش بوون، هەر هەموویان بە کۆمەڵێ بەڵگەی درەوشاوەوەو ئاشکراوە هاتوون کە بەڵگە بووە لەسەر راستگۆییان.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

هیچ جیاوازی ناکەن لەنێوان هیچ یەکێ لە پێغەمبەرانی خوا، هەرکەسێ بێ باوەڕ بێ بە یەکێ لە پێغەمبەرانی خوا؛ ئەوە بەڕاستی بێ باوەڕبووە بە خوای گەورەو بە هەموو پێغەمبەرانی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ

ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّاۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمْ يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ أُو۟لَٰٓئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ النساء: ١٥٠ - ١٥٢.

واتە: بەڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕن بەخواو پێغەمبەرەکانی، وەدەیانەوێ جیاوازی بخەنە نێوان خوا و پێغەمبەرەکانی، دەڵێن باوەڕ بەهەندێك (لەپێغەمبەران) دەهێنین، باوەر ناهێنن بەهەندێکی تریان و دەیانەوێ لەو نێوانەدا ڕێگەیەك بدەنەبەر. ئا ئەوانە بەڕاستی بێ باوەڕی تەواون، ئامادەمان کردووە بۆ بێ باوەڕان سزایەکی ڕسواکەر. ئەوانەی بڕوایان هێناوە بەخواو پێغەمبەرەکانی و هیچ جیاوازییەکیان نەخستە نێوان هیچ کام لەو پێغەمبەرانە، ئا ئەوانە لە داهاتوودا خوا پاداشتیان دەداتەوە، خوا هەمیشە لێ بووردەی میهرەبانە.

خوای گەورە لە قورئانەکەیدا رونیکردۆتەوە حیکمەت لە ناردنی پێغەمبەرە بەرێزەکانی سەلامی خوایان لەسەر بێ، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ سورة النساء: ١٦٥.

واتە: پێغەمبەران (مان ناردووە) کە موژدەدەرن و ترسێنەرن، بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی نەبێت بەڵگە بەسەر خواوە دوای (ناردنی) پێغەمبەران، خوا هەمیشە زاڵێ کار دروستە.

ئەهلی سوننەو جەماعە، باوەڕیان وایە کە هەموو پێغەمبەران بۆ تاکە بنچینەیە بانگەوازیان کردووە کە یەکتاپەرستیە لە عیبادەتدا، هەروەها باوەڕیان وایە ڕێگرییان کردووە لە هاوبەش بۆ خوا دانان؛ ئیسلام دینی هەموو پێغەمبەرانە – هەرچەندە شەریعەتەکانیان جۆراو جۆرە بەپێی بارو دۆخ و پێویستی – خوای

گەورە لەبەندەکانی قبولّ ناکات کە جگە لەدینەکەی خۆی هیچ دینێکی تر هەڵبژێرن، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾ سورة النحل: ٣٦

. واتە: سوێند بەخوا لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە، بەمەی تەنها خوا بپەرستن و دوورکەونەوە لە(پەرستنی) هەرپەرستراوێکی تر.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ ﴾ سورة الأنبياء: ٢٥ .

واتە: وەئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لەمن هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە، کەواتە تەنها من بپەرستن.

بەڕاستی خوای گەورە ژمارەیەکی زۆر نێردراو هەڵبژێرراوی ناردووە هەیانە بەسەرهاتەکەی بۆ باس کردوین لە کتێبەکەیدا، یان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم)، هەشیانە هیچ هەواڵێکی پێ نەداوین لەبارەیەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ ﴾ سورة غافر: ٧٨.

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی بەر لەتۆ پێغەمبەرانێکمان ناردووە بەسەرهاتی هەندێکیانمان بۆ باس کردوی و هەندێکیانمان بۆ باس نەکردوی، هیچ پێغەمبەرێ ناتوانێ موعجیزەیەك بێنێ مەگەر بەئیزنی خوا.

تەنها بیست و پێنج پێغەمبەریان لە قورئاندا ناویان هاتووە کە ئەمانەن: ئادەم باوکی ئادەمیزاد، ئیدریس، نوح، هود، صالح، ئیبراهیم، (لوط)، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقوب، یوسوف، شوعەیب، ئەیوب، (ذُو الكِفل)، موسا، هارون، داود،

سولەیمان، ئیلیاس، یەسەع، یونوس، زەکەرییا، یەحیا، عیسا، موحەممەد کە کۆتاهەمینی هەموویانە سەلات و سەلامی خوا لەسەر هەر هەموویان بێت.

ئەهلی سوننەو جەماعە، باوەڕیان وایە کە خوای گەورە فەزڵی هەندێکیانی داوە بەسەرهەندێکی تریاندا، هەموو ئوممەت یەکدەنگ و تەبان لەسەر ئەوەی کە نێرراوەکان(رسول) چاکترن لە هەڵبژێرراوەکان(أنبیاء) [١]، نێردراوەکانیش لەنێوان خۆیاندا هەندێکیان چاکترن لەهەندێکی تریان، چاکترینی نێرراوەکان و هەڵبژێرراوەکان نێرراوە خۆڕاگرەکانن(أولو العزم) کە بریتین لەم پێنجە: پێغەمبەرمان موحەممەدو، نوح و، ئیبراهیم و، موساو، عیسا سەلات و سەلامی خوا لەسەر هەر هەموویان بێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾ سورة الأحزاب: ٧.

واتە: (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) بیریان بخەرەوە) کاتێ کە پەیمانمان وەرگرت لە پێغەمبەران، هەروەها لە تۆ و نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسای کوڕی مەریەم، لە هەموویان پەیمانی بەهێزو بتەومان وەرگرت.

چاکترینی نێرراوە خۆڕاگرەکان(أولو العزم)یش پێغەمبەری ئیسلامە، کۆتاهەمینی نێرراوەکان(رسول) و هەڵبژێرراوەکان(انبیاء)ە، پێغەمبەری پەروەردگاری جیهانیانە، گەورەی نەوەکانی ئادەمە؛ کە موحەممەدی کوڕی (عبد الله)یە.

---

• نێرراو(رسول) ئەو کەسەیە کە خوای گەورە سروشی بۆ دەکات و پەیام و شەریعەتی بۆ دەنێرێت و فەرمانی پێ دەکات بە خەڵکی رابگەیەنێت.

* هەڵبژێرراو(نبی) ئەو کەسەیە کە خوای گەورە سروشی بۆ دەکات بەڵام فەرمانی پێ ناکات بە خەڵکی رابگەیەنێت، بەڵکو لەسەر شەریعەتی پێغەمبەرەکەی پێشوی دەڕوات، بەم پێیە هەموو (رسول)نێرراوێك پێغەمبەرە بەڵام هەموو هەڵبژێرراو(نبی) یەك (رسول)نێرراو نیە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ سورة الأحزاب: ٤٠ .
واتە: بەڵکو ئەو نێرداروی خواو کۆتا هەمینی پێغەمبەرانە.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان بەهەر هەموویان هەیە ئەوانەی کە ناویان هاتووە و ئەوانەشیان کە ناویان نەهاتووە، لە یەکەمیانیانەوە کە ئادەمە هەتا کۆتاهەمینیان و گەورەترینیان کە پێغەمبەرمانە و پێشەواو پێشەنگمانەو رابەر و سەرکردەو رێنیشاندەرمانە موحەممەدی پێغەمبەری ئیسلامە؛ سەلات و سەلامی خوا لەسەر هەر هەموویان بێت.

باوەڕهێنان بە پێغەمبەران بریتیە لە باوەڕهێنانێکی گشتی(مجمل)ە؛ باوەڕهێنان بە وتەو بە کردەوە واتە بە وتەو بەکردەوە بیسەلمێنین کە باوەڕمان پێیان هەیە، باوەڕهێنان بە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بریتیە لە باوەڕهێنانێکی (تفصیل)ی واتە بە بەرفراوانی ئەمەش بە بیروباوەڕو بە وتەو بە کردەوە دەبێت ئەمەش وا دەخوازێت کە موسوڵمانان شوێنی ئەوە بکەون لەخواوە هێناویەتی (صلى الله عليه وسلم) بەشێوەیەکی بەرفراوان.

## موحەممەد پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم

ناوی تەواوی: باوکی قاسم موحەممەدی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی (عبد المطلب) کوڕی هاشم کوڕی (عبد مناف) کوڕی (قصي) کوڕی (کلاب) کوڕی (مُرَّة) کوڕی کەعب کوڕی (لؤي) کوڕی غالیب کوڕی فیهر کوڕی مالیك کوڕی (نضر) کوڕی کینانە کوڕی خوزەیمە کوڕی مەدریك کوڕی ئیلیاس کوڕی (مُضر) کوڕی نزار کوڕی مەعد کوڕی عەدنانە، عەدنانیش لەنەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی خەلیلە سەلات و سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەوانیش بێت.

کۆتاهەمینی نێرراوەکان(رسول) و هەڵبژێرراوەکان(انبیاء)ە، پێغەمبەری خوایە بۆسەر هەموو خەڵك بەگشتی، خوای گەورە بە هەق و هیدایەت و ڕێنمایی ڕەوانەی کردووە بۆسەر ئادەمیزاد و جنۆکە؛ نێردراوە بۆ ئەوەی کە ڕەحمەت بێت بۆ جیهانیان، بەندەیەی خوایەوناپەرسترێت، پێغەمبەری خوایە و بە درۆ ناخرێتەوە، چاکترین و باشترین دروستکراوەکانی خوای پەروەردگارە، گەورەترین و بەڕێزترینیانە، بەرزترین پلەو پایە پلەو پایەی پێغەمبەری خوایە، نزیکترینیانە کە بکرێتە وەسیلە بۆ نزیك بوونەوە لە خوای گەورە، شەریعەتەکەی زاڵە بەسەر هەموو شەریعەتەکانی تردا؛ شیاوەو چاکسازی یە بۆ هەموو شوێن و ئان و زەمانێ، هەتا ڕۆژی قیامەت بە شکۆمەندی هەر دەمێنێ بە کوێرایی چاوی دوژمنانی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ سورة الأنبياء: ١٠٧ .

واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە کە ڕەحمەت بیت بۆ جیهانیان.

خوای گەورە قورئانی بۆ دابەزاندووە، کردویەتی بە ئەمیندارو سەرکردەی دینەکەی، رایسپاردووە بە گەیاندنی پەیامەکەی، پاراستویەتی لە پێ هەڵخلیسکان و گوناهو تاوان لە گەیاندنی ئەم پەیامەدا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴾ النجم: ٣- ٤.

واتە: لە هەواو هەوسەوە قسە ناکات (کە قورئان دەخوێنێت). هەرچی دەیڵێ (قورئانەو) سرووش دەکرێ بۆی.

باوەڕهێنانی بەندە دانامەزرێ و راست و دروست نیە هەتا باوەڕ نەهێنێ بە پەیامەکەی و، شایەتی نەدات بە پێغەمبەرایەتی، ئەوەی گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بکات ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە، ئەو کەسەش گوێ نەدات بە فەرمانەکانی ئەوە دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ سورة النساء: ٦٥.

واتە:نەخێر (وانی یە کەخۆیان بە باوەڕدار نیشیان دەدەن)، سوێند بەپەروەردگارت بروا دارنین تاتۆ نەکەنە دادوەر لەهەر ئاژاوە و دووبەرەکی یەکی نێوانیان دا، لە پاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بەهیچ بێزاری یەك لەو بڕیارەی تۆ داوتەو مل کەچ نەکەن بەملکەچی یەکی تەواو.

هەموو پێغەمبەرێك نێردراوە بۆ سەر گەلەکەی خۆی بە تایبەتی، بەڵام موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) نێردراوە بۆ سەر هەموو خەڵك بە گشتی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾ سورة سبأ: ٢٨.

واتە: ئێمە تۆمان نەناردووە مەگەر بۆ هەموو ئادەمی بەمژدەدەر و ترسێنەر.

ئەهلی سوننەو جەماعە: باوەڕیان وایە کە خوای گەورە پشتگیری پێغەمبەرەکەی خۆی کردووە بە چەندین موعجیزەی روون و ئاشکراو، بە کۆمەڵێ بەڵگەو نیشانەی درەوشاوە[1]:

* لەو موعجیزانە؛ بەڵکو گەورەترینیان و درەوشاوەترینیان بریتیە لە قورئانی گەورەو شکۆمەندە، عەرەبەکان لەو سەردەمەدا زمان پاراوترین و رەوانبێژترین گەل بوون لەناو گەلاندا، بەتواناترین گەل بوون لە ژیربێژی(منطق)دا، خوای گەورە روو بەروویان بوویەوەو تەحەدای کردن کە هاوشێوەی ئەو قورئانە بێنن؛ نەك هەر نەیانتوانی هاوشێوەی ئەو قورئانە بێنن بەڵکو نەشیانتوانی تەنها یەك سورەت بێنن، حیکمەت و دانایی خوای گەورە وای خواستوە کە قورئان ببێتە یەکێك لە گەورەترین موعجیزەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، چونکە ئەگەر موعجیزەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەنها هەست پێکراو(حسی) بوایە ئەوا کۆتایی دەهات بە کۆتایی هاتنی سەردەمەکەی؛ وەك چۆن موعجیزەکانی پێغەمبەرانی پێشو کۆتاییان هات.

* لە گەورەترینی موعجیزاتەکانی – لەدوای قورئان – بریتیە لە موعجیزەی شەوڕەوی و بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان (الإسراء والمعراج).

(١) – المعجزة: هي أمر خارق للعادة لا يقدر عليه البشر، يظهره الله على يد النبي وفق دعواه تصديقاً له، وإن وقوع المعجزة أمر ممكن؛ ذلك أن الله الذي خلق الأسباب والمسببات قادر على أن يغير نظامها، فلا تخضع لما كانت له من قبل! ولا عجب في ذلك ولا غرابة بالنسبة لقدرة الله التي لا تحد بحدود فهو يفعل ما يريد بأسرع من لمح البصر، قال تعالى: (إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ) سورة يس: ٨٢.

**ئەهلی سوننەو جەماعە:**

باوەڕیان وایە کە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) لەشەوی شەوڕەوی و بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان (الإسراء والمعراج)دا بە روح و بە جەستە بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان لەوکاتەدا بەخەبەر بووە، بەدەقی قورئان لەشەوێکدا لە مزگەوتی (حَرَام)ەوە بۆ مزگەوتی ( أقصى) شەوڕەوی پێ کرا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴾ سورة الإسراء: ١.

واتە: پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە شەوڕەوی کرد بە بەندەی خۆی لە شەوێکدا لە مزگەوتی بەرێز و پیرۆزەوە (مەککە) بۆ مزگەوتی (الأقصى) لە (بیت المقدس)، کە دەورو بەریمان پیرۆز و فەڕدار کردووە بۆ ئەوەی هێندێ لە بەڵگەو نیشانە ڕوونەکانی خۆمانی نیشان بدەین، بەڕاستی هەر ئەو بیسەری بینایە.

لەپاشدا لە مزگەوتی ئەقصاوە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان، هەتا گەیشتە ئاسمانی حەوتەم، ئینجا لەوێش زیاتر بەرزکرایەوە ئەوەندەی کە خوا ویستی لە بەرزێتی دا، گەیشت بە (سدرة المنتهى) کە بەهەشتی نیشتەجێ بوون لای ئەوەوەیە، خوای گەورە ئەوەندەی خۆی ویستی ڕێزی لێ گرت و سرووش(وحی) کرد بۆی ئەوەی کە بۆی کرد، قسەی لەگەڵ کرد – پاك و بێگەردی بۆ خوا – ، لەشەو ڕۆژێکدا پێنج نوێژی فەرز کرد لەسەر خۆی و ئوممەتەکەی، چووە ناو بەهەشتەوە و بەهەشتی بینی و ئاگاداری بەهەشت بوو، هەروەها ئاگری دۆزەخی بینی و ئاگاداری ئاگری دۆزەخ بوو، مەلائیکەی بینی، جا جبریلی بینی لەسەر ئەو شێوە هەقیقەتەی کە خوای گەورەو کردگار دروستی کردووە، ئەوەی کە بەچاو بینی دڵەکەی بڕوای پێکردو بە درۆی نەخستەوە، بەڵکو هەموو ئەوەی کە بینی بە ڕاستی بە هەردوو چاوی سەری بینی؛ ئەمەش وەك گەورەدانانێك ئەمانەی هەموو نیشاندا هەروەها وەك ڕێزلێنانێ بەسەر پێغەمبەرانی تردا، دەرخستنی بەرزی پلەو پایەی بوو

بەسەر هەمووواندا ؛ لەپاشدا دابەزێنرا بۆ (بيت المقدس) بەرنوێژی کرد بۆ هەموو پێغەمبەران سەلات و سەلامی خوا لەسەر هەر هەموویان بێت، ئینجا لەپێش بەرەبەیاندا گەڕایەوە بۆ شاری مەککەی پیرۆز.

خوای گەورە لەوبارەوە دەفەرموێت:

﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٖ فَٱسۡتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ أَوۡ أَدۡنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ ٱلۡفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذۡ يَغۡشَى ٱلسِّدۡرَةَ مَا يَغۡشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ﴾ سورة النجم: ١ – ١٨.

واتە: سوێند بە ئەستێرە کاتێ کە ئاوا دەبێ. هاوڕێکەتان (موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) گومڕا نەبووە. لە ڕاستی لای نەداوە. لە هەواو هەوسەوە قسە ناکات (کە قورئان دەخوێنێت). هەرچی دەیڵێ (قورئانەو) سرووش دەکرێ بۆی. (جبریلی) زۆر بەتوانا فێری کردووە. خاوەنی بیرو هۆشی بەهێزە. جا لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی ڕاوەستاوە. کە بە ئاسۆی هەرە بەرزی ئاسمانەوە بوو. پاشان نزیك بوویەوە (لە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) ئەنجا هاتەخوارەوە. تا بە ئەندازەی دوو کەوان یان کەمتر(ی ماوە بوو لەگەڵ موحەممەددا (صلى الله عليه وسلم)). ئینجا (خوا) سرووشی کرد بۆ بەندەی خۆی ئەوەی کە بۆی کرد. ئەوەی (موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) بەچاو بینی دڵی (بڕوای پێ کرد و) بە درۆی نەزانی. جا ئایا (بێ باوەڕان) ئێوە دەمەقاڵێی لەگەڵ دەکەن دەربارەی ئەوەی کە بە چاوی خۆی دەی بینێ. سوێند بەخوا بێگومان جارێکی تر جوبریلی بینیوە. لای درەختی(سیدرەتو لمونتەها). کە لای ئەوەوەیە بەهەشتی نیشتەجێ بوون. کاتێ کە سیدرەی داپۆشی ئەوی کە داپۆشی. چاوی ئەو (موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) بەم لاو لادا

نەیدەنواڕی (لە مەبەست تێ نەدەپەڕی). سوێند بەخوا بێگومان بینی گەورەترین بەڵگەو نیشانەی پەروەردگاری.

**هەروەها هەندێکی تر لە موعجیزەکانی، صلی الله علیه وسلم:**

* لەتبوونی مانگ: بەڵگەو نیشانەیەکی زۆر گەورەیە خوای پەروەردگار بەخشیویەتی بە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتی، ئەمەش لەسەرەتای بوونی بە پێغەمبەر لە شاری مەککەی پیرۆز رویدا لەکاتێکدا کە هاوەبەش بۆ خوا دانەرەکان داوای بەڵگەیان لێ کرد.

* زۆربوونی خواردنی کەم، کە ئەمەش چەندان جار لێی رویداوە.

* زۆربوونی ئاو و هەڵقوڵانی لە نێوان پەنجە پیرۆزەکانی دەستی دا، هەروەها زیکر و تەسبیحات کردنی ئەو خواردنەی لەکاتێکدا کە ئەو دەیویست بیخوات، زۆر شتی وەها رویداوە لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم).

* چاکردنەوەی نەخۆش و چاکردنەوەیان، چاکردنەوەی هەندێ لە هاوەڵان لەسەردەستی (صلی الله علیه وسلم) بەبێ بەکارهێنانی هیچ دەرمانێکی هەست پێکراو(حسی)ی.

* نواندنی ئەدەبی جوان بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەلایەن ئاژەڵانەوە، ملکەچکرن و گوێڕایەڵی دارودرەخت بۆی، سەلام کردنی بەردەکان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر.

* بینیی ئەو کەسانەی لەدوایەوە نوێژیان دەکرد هەروەك چۆن ئەوانەی کە لەبەردەمیدا بوون دەیبینین.

* قسەکردنی باڵی ئەو مەڕەی کە پێشکەشیان کرد بۆ ئەوەی بیخوات؛ بەوەی کە ژەهراوی کراوە.

* هەواڵدانی دەربارەی هەندێ شتی نادیار(غەیب)، هەروەها هەواڵی چەند شتانێکی دووری داوە لەپاشدا روویانداوە هەروەك چۆن هەواڵی داوە، هەواڵی چەند کاروبارێکی نادیار(غەیب)ی داوە لەپێش روودانیاندا؛ لەدوایدا وەك چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی داوە بەو شێوەیە روویانداوە.

* وەڵامدانەوەی سەرجەم پاڕانەوەکانی لەلایەن خوای گەورەوە بەگشتی دوعاکانی گیرا کردووە.

* تۆڵەسەندنەوەی خێرا لەهەندێ لەو کەسانەی کە خیانەتیان لێ کردووە یان دوژمانیەتیان کردووە لەلایەن خوای گەورەوە.

* سزادانی ئەو کەسانەی کە ڕێزیان لێ نەگرتووە، یان ڕێزیان فەرمایشت و وتەکەی نەگرتووە،، یا ڕێزیان لەفەرمانەکەی و لە قەدەکراوەکەی نەگرتووە.

* پارێزگاری لێ کردنی لەلایەن خوای گەورەوە و پاراستنی لەدەست دوژمنانی لەکاتێکدا کە ویستویانە زیانی پێ بگەیەنن.

لە ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەبو جەهل وتی: ئایا موحەممەد لەبەرچاوی ئێوە ئەتوانێ روخساری بخاتە سەر زەوی؟ ئەبو هورەیرە وتی: پێی وترا: بەڵێ! ئەبو جەهل وتی: سوێند بە لات و عوززا – کە دوو بت بوون کافرەکانی قورەیش دەیانپەرستن – ئەگەر ببینم ئەو کارە بکات ئەوا پێ دەخەمە سەر گەردنی یان روخساری لەناو خۆڵا دەگەوزێنم.

ئەبو هورەیرە وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هات نوێژی دەکرد، ئەبو جەهل وای ئەزانی ئەتوانێ پێ بخاتە سەر گەردنی، ئەبو هورەیرە وتی: ئەوەی کە کتوپڕ رویدا لێی گەڕایەوە بۆدواوە و بە هەردو دەستەکانی خۆی دەپاراست وەك کەسێ کە شتێ شتاڵاوی بۆ هێنابێ بە هەردوو دەستی پاسی خۆی دەکرد، ئەبو هورەیرە وتی: پێی وترا: ئەوە چیتە بۆ وا دەکەیت؟ ئەبو جەهل وتی: نیوان من و ئەودا خەندەقێك چاڵێ بوو پڕ لەئاگر و شتانێکی زۆر سامناك و کۆمەڵێ باڵ پەیدا بوون روو بەڕووی دەهات؛ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (لَوْ دَنَا مِنِّي لاَخْتَطَفَتْهُ الْمَلاَئِكَةُ؛ عُضْوًا عُضْوًا)[1]. واتە: ئەگەر زیاتر لێم نزیك بوایەتەوە ئەوا مەلائیکەکان دەیانفڕاندو پارچە پارچەیان دەکرد.

---

(١) – رواه مسلم.

## پایەی پێنجەم
## باوەڕهێنانە بە ڕۆژی دوایی

ئەهلی سوننەو جەماعە، ئیمان و بیروباوەڕیان وایە کە ڕۆژی دوایی: بریتیە لەو ڕۆژەی کە خوای گەورە دروستکراوەکانی تێدا زیندو دەکاتەوە لەپاش مردنیان، لەگۆڕەکانیان دەیانهێنێتەدەرەوە، لەپاشدا لەسەر کردەوەکانیان لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات. واتە بریتیە: لەبیروباوەڕێکی جێگیر و تەواو، بەراست خستنەوەی تەواو بە ڕۆژی دوایی، باوەڕبونە بەسەرجەم ئەو هەواڵانەی کە خوای گەورە ڕایگەیاندووە لە قورئانەکەی خۆیدا، بە هەموو ئەو هەواڵانەی کە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمودە صەحیحەکانیدا ڕایگەیاندون سەبارەت بەو شتانەی کە ڕودەدات لەدوای مردن: لە ڕوداوەکان و بارودۆخەکان و کارەسات و مەترسی و ناخۆشیانەی کە ڕودەدەن لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، باوەڕی تەواویان هەیە بە بەڵاو نەهامەتی سزای گۆڕ، بەخۆشی و شادیەکانی، بە فوکردن بە کەڕەنادا، بە حەشرو گردبونەوەو زیندوبونەوە و بڵاوکردنەوەی نامەی کردەوەکان و دابەشکردنی و لێپێچینەوە و تەرازو و حەوز و (صیراط) پردێکە بەسەر دۆزەخەوە موسوڵمانان لێیەوە دەپەڕنەوە بۆ بە هەشت، باوەڕی تەواویان هەیە بە شەفاعەت و پاداشدانەوە؛ هەتا خەڵکی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوەو، خەڵکی دۆزەخیش دەچنە دۆزەخەوە.

بەڕاستی خوای گەورە باسی ڕۆژی دوایی کردووە لەزۆر ئایەتی قورئانە شکۆمەندەکەیدا، باوەڕبون بە ڕۆژی دوایی گرێداوە بە باوەڕبون بە خوای پەروەردگارەوە، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴾ سورة البقرة: ٤ . واتە: ئەوانەی بڕوادەهێنن بەو قورئانەی

کە بۆ تۆ (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) نێرراوە، بەو کتێبانەی کە بۆ نێراوانی پێش تۆ نێرراونەتە خوارەوە، بڕوایان هەیە بە ڕۆژی دوایی.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە بەراستی زانیاری کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی تەنها لای خوایە؛ جگە لەخوای پەروەردگار هیچ کەسێك نایزانێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾ سورة القمان: ٣٤.

واتە: بەراستی تەنها لای خوایە زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی.

لەکاتێکدا کە خوای پەروەردگار کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی پەنهان کردووە لەبەندەکانی؛ بەڵام چەند بەڵگەو نیشانەیەکی بۆ داناون؛ کە بەڵگەن لەسەر نزیکبونەوەی هاتنی ئەو ڕۆژە.

باوەڕیان هەیە بە هەموو ئەو شتانەی کە ڕویانداوە و ڕویش دەدەن لە بەڵگەو نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئیتر بچوك بن یان گەورە کە ئەوانەیش نیشانەو بەڵگەن لەسەر هەستانی قیامەت؛ لەبەرئەوە باوەڕبوون بەو نیشانانە دەچنە ناو خولگەی باوەڕبون بە ڕۆژی دوایی.

نیشانە بچوکەکانی رۆژی دوایی:

بریتین لەو بەڵگەو نیشانانەی کە لەپێش هەستانی قیامەتدا ڕوودەدەن لە چەند کات و سەردەمێکی جیا جیاو دورو درێژدا بەدوای یەکتردا دێن، لەلای خەڵك دەبنە شتێکی ئاسایی(مُعتاد) — وەك زۆربونی بازاڕەکان و ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان و زۆربونی ئافرەتانی ڕوتی بە ناو داپۆشراو ... — ، دەگونجێ هەندێکیان بە هاوڕێیەتی نیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی ڕوبدەن، نیشانە بچوکەکانی ڕۆژی دوایی زۆر زۆرن؛ لێرەدا باسی هەندێك لەوانە دەکەین کە بەڕاست و دروستی لەسوننەتدا هاتوون لەوانە:

هاتنی پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) کە بە هاتنی ئەو ناردنی پێغەمبەران کۆتایی هات ئیتر لەدوای ئەو پێغەمبەر و پەیامی تر نایەت، هەروەها مردنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

رزگارکردنی قودس(بَيْتُ المُقَدَّس)، سەرهەڵدانی ئاژاوەو بەڵاو کارەسات لە رۆژهەڵاتەوە، شوێنکەوتنی رەفتارو رێبازی گەلانی پێشوو لەگاور و جولەکەکان، دەرچونی دەجالە درۆزنەکان، هەروەها دەرکەوتنی ئەوانەی کە بەدرۆ بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بۆ خۆیان دەکەن.

دانانی چەندان قسەی درۆ و هەڵبەستراو بەدەم پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم)، رەتکردنەوەی سوننەتەکانی، زۆربوونی درۆکردن، نەسەلماندنی راستی لەکاتی راگەیاندن و گواستنەوەی هەواڵەکاندا، هەڵگرتنی زانست و زانیاری شەرعی و وەرگرتنی لەو کەسانەی کە بچوکن، سەرهەڵدانی نەزانی و تاوان و خراپەکاری، رۆیشتنی پیاوچاکان و بۆ خوا سوڵحاوان، هەڵوەشانەوەی دینی ئیسلام بەش بەش، هێرش کردنی گەلان بۆ سەر ئوممەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، لەپاشدا غەریب نامۆبونی ئیسلام و خەڵکەکەی.

زۆربوونی کوشتن، ئاوات خواستن بە مردن، ئیرەیی بردن بە خەڵکانی ناو گۆرستان لەئەنجامی زۆربوونی ئاژەوەو مەینەتی و ناخۆشی و کارەساتەکاندا پیاو ئاوات دەخوازێت لەجێی مردوو بوایەو زیندو نەبوایە، زۆربوونی مردنی کتوپڕ و لەناکاو، مردن بەهۆی بوومەلەرزەو نەخۆشیەکانەوە، کەمبونەوەی ژمارەی پیاوان، زۆربوونی ئافرەتان و دەرکەوتنیان بە رووتی و بەرەڵایی- بەوەی کە پۆشاکی تەنك و تەسك و کورت لەبەر دەکەن - و بڵاوبونەوەی زینا لە رێگاو بانەکاندا، دەرکەوتن و سەرهەڵدانی ئامێرەکانی مۆسیقا، زۆربوونی مەی خواردنەوەو مادە هۆشبەرو سەرخۆشکەرەکان و، زیناکردن و، سود(ربا)، لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشم و

حەلاڵ کردنی، دەرکەوتنی رۆچوون و داتەپینی زەوی، گۆڕینی دیمەن و روخسار بۆ شێوەیەکی ناشیرین و خراپ، بەردباران کردنیان یان ئابڕووبردنی خەڵك و تاوانبار کردنیان بە ئەنجامدانی داوێن پیسی.

فەوتاندنی ئەمانەت، کاروبار دەدرێتە دەستی کەسانی ناشایستە کە ئەهلی ئەو مەیدانە نین، سوك و رسواو رەجاڵ و هیچ لەبارانەبووان دەبنە خاوەن دەسەڵات و پۆرت لێ دەدەن، بەرزبوونەوەی پلەوپایەی بێ ئەقڵ و نەزانەکان بەسەر هۆشمەند و ئاقڵەکانیاندا، منداڵەکان ئازاری دایك و باوك دەدەن یان لەدایك بوونی کەسانێ کە دەبن بە گەورەی دایکی خۆیان واتە دایکەکە کۆیلەیە شودەکات بە کەسێ ئازادە لەو پیاوە ئازادە منداڵی دەبێ بە منداڵەکەی دەڵێ گەورەم، دەرکەوتنی داردەست و یارمەتی دەرانی ستەمکاران کە دار و قامچیان پێ یە لەخەڵکی دەدەن پێی، روداني ئاژاوەو بەڵاو کارەسات وەك شەوەزەنگ دنیا تاریك دەکەن و خەڵك دادەگرن.

پێشبڕکێ لە بەرزکردنەوەی کۆشك و تەلارەکاندا، گرنگیدان و خۆهەڵکێشانی خەڵك بەڕازاندنەوەی مزگەوتەکانەوە، زۆربوونی بازرگانی، نزیکبونەوەی بازاڕەکان – وەك ئەم سەردەمەی خۆمان کە ئەوەی لە بازاڕەکانی ئەوروپادا هەیە لێرە بە ئاسانی دەست دەکەوێت – ، ماڵ و سامانی زۆر دەکەوێتە دەستی خەڵك و سوپاسی خوا ناکەن لەسەری، زۆربوونی پیسکەیی و چروکی، زۆربوونی شایەتیدانی درۆ، شاردنەوەی شایەتی هەق، سەرهەڵدانی بێ ئابڕوویی و فاحیشەگەری و ناکۆکی و دووبەرەکی و رق و کینە بەرامبەر بە یەکتر، پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، خراپی دراوسێی لەگەڵ دراوسێ، سەلام کردن تەنها لە ناسیاوەکان دەکرێ، روداني یەکتر نەناسین و خۆگێل کردن لەنێوان خەڵکدا، چواندنی بەتەمەن و پیرەکان بە گەنج و لاوەکان، بە کەمدانانی ئەو سوننەتانەی کە ئیسلام حەزی لێیانە خەڵك پەیرەویان بکەن.

کات و سەردەم و زەمان دەگۆڕێ کات و ساتەکان زوو تێپەڕ دەبن، هەتا وای لێ دێ بتی هەمەجۆر دەپرستڕێن، هاوبەش بۆ خوا دانان سەرهەڵدەدات لەناو ئوممەتدا، زۆربوونی باران و کەمبونەوەی رووەك، نزیکبونەوەی کات و سەردەم و زەمان، نەمانی بەرەکەت لە کاتەکاندا، مانگ بە گەورە دەدەکەوێت، قسەکردنی درندەو بێ گیان لەگەڵ ئادەمیزاد، خەونی باوەڕدار دێتەدی و بەڕاست دەردەچێت.

گرتنەوەی ئاوی فورات و دەرکەوتنی کێوێ لە ئاڵتوون، ئەوەی کە لەمەدینەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) روودەدات کە پیسی لەخۆی دووردەخاتەوە؛ جگە لە خوا ترس و پیاوچاکەکان نەبێت کەسی تێدا نامێنێ، نیوە دورگەی عەرەبی دەبێتەوە بە رووبار و باخ و باخات و سەوزایی، پەیدابوونی پیاوێ لەهۆزی (قحطان) خەڵکی دوای دەکەون.

زۆربونی رۆمەکان، لەگەڵ موسوڵماناندا دەجەنگن، موسوڵمانان لەگەڵ جولەکەکاندا دەجەنگن هەتا دارو درەخت و بەرد دەڵێن: (يَا مُسْلِمُ هَذَا يَهُودِيٌّ؛ فَتَعَالَ فَاقْتُلْهُ)[1]. واتە: ئەی موسوڵمان ئەمە جولەکەیە وەرە بیکوژە.

رزگار کردنی شاری رۆما، وەك چۆن پێشتر شاری (قسطنطينية) رزگار کرا، ئەمانەو چەندەها نیشانەی تریش لەنیشانە بچوکەکانی رۆژی دوایی کە جێگیر بووە لە فەرمودە راست و دروستەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم).

(١) - رواه البخاري.

**نیشانە گەورەکانی رۆژی دوایی:**

بریتیە لە چەندان نیشانەی گەورەو مەزن دەردەکەون لەکاتی نزیکبونەوەی رۆژی دوایی، رودانیان بەلای خەڵکەوە ئاسایی نین لەجۆری (غیر مُعتاد)ن، ئەگەر یەکەم نیشانە دەرکەوت ئەوا نیشانەکانی تریش بەدوایدا دەردەکەون وەك چۆن دانەکانی مورووی هۆنراوە ئەگەر هەڵوەشایەوە یەك بەدوای یەکدا هەڵدەوەرێن، جا کاتێ کە دەرکەوتن ئیتر رۆژی دوایی بەدوای ئەواندا دێت، ئەهلی سوننەو جەماعە؛ باوەڕیان وایە کە ئەم بەڵگەو نیشانانە جێگیرن لە قورئان و سوونەتدا، باوەڕیان پێی هەیە بەو شێوەیەی کە هاتوون، لەوانە:

★ **دەرکەوتنی مەهدی:** مەهدی پیاوێکی خواناسە ناوی موحەممەدی کوڕی (عبدالله)یە لەبنەماڵەی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، لەلای رۆژهەڵاتەوە دەردەکەوێت، موسوڵمانان لە کەعبە پەیمان و بەڵێنی دەدەنێ، بەپێی سوننەت و بەرنامەی پێغەمبەرایەتی حوکمڕانی دەکات، حەوت ساڵ حوکمڕانی دەکات، سەرزەوی پڕ دەکات لە عەدالەت و دادگەری دوای ئەوەی کە پڕ کرابو لە زوڵم و ستەم و ناعەدالەتی، ماڵ و سامان دەبەخشێ بە بێ ژماردن؛ لەسەردەمی ئەودا خۆشی و بەهرەو نیعمەتی زۆر بەسەر خەڵکیدا دەڕژێت کە هەرگیز بەخۆیانەوە نەیاندیوە ؛ بەشێوەیە لە ئاسمانەوە بارانی زۆر دەبارێ و رووەك و شینایی زەوی دادەپۆشن.

★ **دەرچونی مەسیحی دەججالی کوێری ساختەچی و درۆزن**[1]؛ لەلای رۆژهەڵاتەوە لەشاری خۆراسان دەردەچێ کە حەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵدایە، لە نیو چاوانی نوسراوە کافر، سەرەتا لەنێوان شام و عێراقدا کاری خۆی دەردەخات

* فتنة ظهور المسيح الدجال من أعظم الفتن؛ لأن الدجال هو منبع الكفر والضلال والفتن، ومن أجل ذلك فقد حذر منه الأنبياء أقوامهم، وكان النبي صلى الله عليه وسلم يستعيذ من فتنة الدجال دبر كل صلاة، وحذر منه أمته.

موسوڵمانان دەزانن کە ئەوە، لەپاشدا دەڕوات و دەچێتە هەموو وڵات و شار و ناوچەیەکەوە جگە لە شاری مەککەو مەدینە کە ناتوانێ بچێتە ناویانەوە، چونکە مەلائیکەکان پاسەوانیان دەکەن، لەزەوی دا چل ڕۆژە دەمێنێتەوە، ڕۆژێکیان وەك ساڵێکە، ڕۆژێکیان وەك مانگێکە، ڕۆژێکیان وەك هەفتەیەکە، سەرجەم ڕۆژەکانی تریش وەك ئەم ڕۆژانەی ئێمەیە – واتە ساڵێك و دوو مانگ لە زەویدا دەمێنێتەوە .

* دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم سەلامی خوای لەسەر بێ بۆ سەر زەوی:

لەلای مەنارەی سپی(منارة البیضاء) لە ڕۆژهەڵاتی دیمەشق لەشام، دابەزینەکەی بۆ سەر ئەو تاقمەیە لە ئیمانداران کە سەرخراون، لەسەر حەق دەجەنگن و کۆبونەوەیان بۆ جەنگ کردنە لەگەڵ دەججال، مەهدیان کردووە بە فەرماندەو پێشەوای خۆیان، لەکاتێکدا دادەبەزێت لەوکاتەدا قامەت دەکرێت بۆ نوێژ و لەدوای فەرماندەی ئەو کۆمەڵەوە نوێژ دەکات کە مەهدیە، عیسا بە نێزەکەی دەججال دەکوژێت لەلای دەروازەی (لد) لە ڕۆژهەڵاتی (بَیتَ المَقدِس)، حوکم و فەرمانڕەوایی دەکات بە شەریعەتی ئیسلام لەسەر زەوی دا، خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت، باج و سەرانە هەڵدەگرێت، جگە لە ئیسلام هیچ دینێکی تر قبوڵ ناکات، خۆشگوزەرانی و کامەرانی و ئاشتی و ئارامی سەر زەوی دادەگرێت، پیسکەیی و چروکی و ڕق و کینە بەرامبەر بە یەکتر و ئیرەیی بە یەکتر بردن لەناو ئوممەتدا نامێنێ، بەرەکەت ڕوودەکاتە خەڵك و خێر و خێرات زۆر دەبێت، ئەوەندە ماڵ سامان زۆر دەبێت کەس حەز لەماڵ و سامانی کەس ناکات، ئاشتی و ئارامی باڵ دەکێشێ بەسەر هەموو لایەکدا، جەنگ و هەرا نامێنێ.

* دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج ئەوانە لەهەموو بەرزایی و کون و کەلەبەرێکەوە بەلێشاو پەیدا دەبن و زۆردەبن، کشتوکاڵ و وەچە لەناو دەبەن، لەسەر زەویدا تاوان و خراپەی زۆر گەورە ئەنجام دەدەن، خوای گەورە کرمێکی بچوکیان بۆ دەنێرێ دەچێتە دەماغیانەوەو زاڵی دەکات بەسەریاندا وەك چۆن کولە

بە کۆمەڵ دەمرن ئەوانیش بەو شێوەیە بەکۆمەڵ دەمرن، زەوی پڕ دەبێت لەکەلاك و بۆن و بەرامەی بۆگەنیان؛ جا خوای گەورە جۆرە جۆرە باڵندەیەکان بۆ دەنێرێ هەڵیان دەگرێت لەهەر شوێنێ خوا خۆی بیەوێت فڕێیان دەدەن، لەپاشدا خوای گەورە بارانێکی زۆر دەبارێنێ و زەویان لێ پاك دەکاتەوە.

* رودانی سێ رۆچونە گەورەکان کە زۆربەی شوێنی زەوی دەگرێتەوە: رۆچونێك لە رۆژهەڵات، رۆچونێك لە رۆژئاوا، رۆچونێك لە نیوە دورگەی عەرەب رودەدات.

* دەرچوونی دوکەڵێکی چڕ و پڕە نێوانی ئاسمان و زەوی و رۆژهەڵات و رۆژئاوا پڕ دەبێت لەو دوکەڵەو دونیا دەگرێتەوە، بۆ باوەڕداران وەك نەخۆشی هەڵامەت وەهایە، بەڵام بۆ بێ باوەڕان و دووڕوەکان دەوریان دەدات و لەدەم و لوت هەموو کون و کەلەبەرێکەوە دەچێتە جەستەیانەوەو هەڵیان دەئاوسێنێ هەتا لەهەردوو گوێیانەوە دەچێتەدەرەوە.

* هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، هیچ کەسێ نیە کە ببینێ و باوەڕ نەهێنێ، بەڵام باوەڕهێنانەکەیان هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێت ئەگەر لەپێشتردا باوەڕیان نەهێنابێت، تەوبەو پەشیمانی لە یاخی و تاوانبار وەرناگیرێت، تەوبەو پەشیمانی دادی ئەو کەسانەش نادات کە پێشتر بێ باوەڕ بوون.

* دەرچوونی ئاژەڵێکی سەیر و سەمەرە لەزەویەوە؛ ئاژەڵێکی گەورەیە لەڕووی شکڵ و شێوە و رەفتارەوە لەگیاندارەکانی تر جیاوازە ئادەمیزاد هەرگیز گیانداری لەو شێوەی نەدیوە، لەگەڵ خەڵك گفتوگۆو قسە دەکات، باوەڕدار لە بێ باوەڕ جیادەکاتەوە، باوەڕدار بەشێوەیە نیشانە دەکات کە روخساری دەدرەوشێتەوە ئەمەش دەبێتە نیشانەی باوەڕەکەی، لوتی بێ باوەڕ دەسمێ و نیشانەی دەکات کە ئەمەش دەبێتە نیشانەی بێ باوەڕیەکەی.

★ دەرچوونی ئاگر کە لە تەختی عەدەن، لەناو دەریای (حضرموت)، خەڵك لەدواوە دادەگرێ و، لەهەموو لایەکەوە خەڵك بەرەو شوێنی کۆبونەوەیان ڕاپێچ دەکات کە بریتیە لە وڵاتی شام.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان هەیە بە هەموو ئەو شتە (غەیب)نادیارانەی کە لەدوای مردن ڕودەدەن، ئەوانەی کە خواو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) هەواڵیان داوە لە: ئازارو ژانی ڕۆح کێشان، ئامادەبوونی مەلائیکەکانی ڕۆح کێشان، خۆشی و شادی باوەڕدار بە گەیشتن بەدیداری خوای پەروەردگاری شکۆمەندی، هەروەها باوەڕیان هەیە بە ئامادەبوونی شەیتانەکان لەکاتی سەرەمەرگدا، باوەڕیان وایە بێ باوەڕ باوەڕهێنانی لێ وەرناگیرێ لەکاتی سەرەمەرگدا، باوەڕیان هەیە بە جیهانی بەرزەخ لەکاتی مردنەوە دەست پێ دەکات هەتا ئەو کاتەی کە قیامەتی گەورە هەڵئەسێ - ، باوەڕیان هەیە بە خۆشی و شادیەکانی ناو گۆڕ و سزاکانی ناو گۆڕ و، بەڵاو مەینەتی و ناخۆشیەکانی بۆ ڕوح و بۆ جەستە، پرسیارەکانی هەردوو مەلائیکەکە لەناو گۆڕدا، باوەڕیان وایە شەهیدانی ڕێگەی خوا زیندون و لەلایەن خوای گەورەوە بەردەوام ڕۆزیان هەیە، ڕۆحی خەڵکانی بەختیار و کامەران خۆشبەختن و خۆشگوزەرانن، ڕۆحی خەڵکانی بەدبەخت و نەگبەت سزادراون و لەناخۆشیدان.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان هەیە بە ڕۆژی قیامەتی گەورە کە خوای پەروەردگار مردووەکانی تێدا زیندو دەکاتەوە، بەندەکان لەناو گۆڕەکانیان دەردێنێ و زیندویان دەکاتەوە لەپاشدا لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات.

ئەهلی سوننەو جەماعە، باوەڕیان هەیە بە فوكردن بە كەڕەنادا، ئیسرافیل سەلامی خوای لەسەر بێ كەڕەناكەی لەدەم ناوەو چاوەڕێی فەرمانی خوای پەروەردگار هەتا فووی پێدا بكات، بە پێی فەرمودەی راست و دروست دووجارە، بەڵام وتراوە: سێ جارە:

فوكردنی یەكەم: بریتیە لە فوكردنی تۆقاندن، دووهەم: بریتیە لە فوكردنی شریخەو ناڵەی بەهێز كە سەرجەم یاساو رێسای بوونەوەر و جیهانی بینراو تێك دەچێت و دەگۆڕێت، ئەوەی كە خوا بڕیاری دابێت لەناوبچێت لەناودەچێت، سێهەم: بریتیە لە فوكردنی زیندوبونەوە و گەڕانەوەو، وەستان لەبەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیان بۆ لێ پرسینەوە.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان هەیە بە زیندوبونەوە و، كۆبونەوەو گەڕانەوە، باوەڕیان وایە كە خوای پەروەردگار مردووەكان زیندو دەكاتەوە، خەڵك بەپێی پەتی و بەرووتی و بە خەتەنە نەكراوی بەرەو بارەگای پەروەردگاری جیهانیان وەڕێ دەكەون و لەبەر بارەگای رادەوەستن، خۆر لەخەڵك نزیك دەبێتەوە؛ بە ئەندازەی كردەوەكانیان ئارەق دەكەنەوە مەردوم لەناو ئارەقی خۆیاندا دەبن، هەیانە ئارەق هەتا لەغاوەی دەمی دێت، یەكەم كەسێ كە زەوی بۆ شەق دەبێت پێغەمبەرمان موحەممەدە (صلی الله علیه وسلم)، لەو رۆژە گەورەدا خەڵك لەگۆڕەكانیان دێنەدەرەوە دەڵێی كوللەی پەرش و بڵاون، زۆر بەپەلە دەچن بۆلای ئەو بانگ كەرەی كە بانگیان دەكات، هەموو جوڵەیان نامێنێ و ترس و بیم دایاندەگرێت، نامەی كردەوەكان بڵاودەكرێنەوە، پەنهان و شاراوەو نادیارەكان ئاشكرا دەبن و دەردەكەون، ئەوەی لەدڵ و دەرونەكاندا شاردراونەتەوە دەردەكەون، خوای گەورە لەرۆژی دوایی دا

لەگەڵ بەندەکانی دەدوێ بەبێ ئەوەی لەنێوان خوای گەورەو ئەواندا وەرگێڕێ تەرجومانێ هەبێت، خەڵك بەناوی خۆیان و باب و باپیریانەوە بانگ دەکرێن.

ئەهلی سوننەو جەماعە، باوەڕیان هەیە بە کێشانە تەرازو کە دوو تای هەیەو ئیشی ئەو ترازوانە ئەوەیە کاروکردەوەی بەندەکانی پێ دەکێشرێت.

باوەڕیان هەیە بە بڵابوونەوەی نامەی تۆماری کردەوەکان، جا هەیە نامەی کردەوەکانی بەدەستی راستی وەردەگرێت، هەشە بەدەستی چەپی وەریدەگرێت، هەشیانە بەدەستی چەپی لەپشتیەوە وەریدەگرێت.

باوەڕیان وایە کە پردی (صراط) لەشمشێر تیژ ترەو لەموو باریك ترە؛ پردێکە بەدرێژایی دۆزەخ بەسەریەوە رایەڵ کراوە، مرۆڤە چاکەکان لێیەوە دەپەڕنەوەو، خراپکارانیش لەسەری دەکەونەخوارەوە[١].

باوەڕیان وایە کە بەهەشت و ئاگر دوو دروستکراوی خوای گەورەن، ئێستا هەن و، هەتا هەتایین و لەناو ناچن.

بەهەشت: ماڵی هەمیشەیی پاداشت و نازو نیعمەتە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ باوەڕداران و یەکتاپەرستان و خواناسان و تیکۆشەران و پیاوچاکان.

ئاگری دۆزەخ: ماڵی سزاو تۆڵەیە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ تاوانباران و کافرەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەران و جولەکەو گاور و دووڕووەکان و بێ باوەڕان و بت پەرستان و یاخی بووە زیان گەیەنەرەکان.

---

* وهو الجسر الذي يمرون عليه إلى الجنة، ويمر الناس على الصراط بقدر أعمالهم فمنهم من يمر كلمح البصر، ومنهم من يمر كالبرق، ومنهم من يمر كالريح المرسلة ومنهم من يمر كالفرس الجواد، ومنهم من يمر كركاب الإبل، ومنهم من يعدو عدوا، ومنهم من يمشي مشيا، ومنهم من يزحف زحفا، ومنهم من يخطف ويلقى في جهنم؛ كل بحسب عمله، حتى يطهر من ذنوبه وآثامه ومن اجتاز الصراط تهيأ لدخول الجنة؛ فإذا عبروا الصراط وقفوا على قنطرة بين الجنة والنار؛ فيقتص لبعضهم من بعض فإذا هذبوا ونقوا أذن لهم في دخول الجنة.

ئەهلی سوننەو جەماعە، باوەڕیان وایە کە یەکتاپەرستە یاخی و گوناهبارەکان بە هەمیشەیی لە ئاگردا نامێننەوە، بەڵکو بە ئەندازەی گوناهەکانیان سزادەدرێن و تۆڵەیان لێ دەسەنرێت، لەپاشدا سەرەنجامیان بەهەشتە، ئەمانە ئەو کەسانەن یەکاتاپەرستن و هاوبەشیان بۆ خوا دانەناوە بەڵام لەسەر ئەو گوناهانەی کە کردویانە دەخرێنە ئاگرەوە؛ چونکە هاوبەش بۆ خوا دانەران هەرگیز لەناو ئاگردا نایەنەدەرەوە، پەنا بەخوا.

باوەڕیان وایە کە لە رۆژی دوایی دا ئوممەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) لەپێش هەموو گەلانەوە لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت، لەپێش هەموو گەلانەوە دەچنە بەهەشتەوە، سێیەکی خەڵکانی بەهەشتن، حەفتا هەزاریان بەبێ لێپێچینەوە دەچنە بەهەشتەوە.

باوەڕیان وایە حەوزەکەی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە گۆڕەپانی قیامەتدا یەکەمینە کە دروستکراوان بەرەو رووی وەڕێ دەکەون لەدوای زیندوبونەوە، ئاوەکەی لەشیر سپی ترە، لەهەنگوین شیرین ترە، بۆن و بەرامەکەی لەبۆنی میسك خۆشترە، ژمارەی ئەو دەفرو پەرداخانەی کە ئاوەکەی پێ دەخۆنەوە ئەوەندەی ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانن، درێژیەکەی بەئەندازەی مانگە رێیەکە، پانیەکەی بەئەندازەی مانگە رێیەکە، هەرکەسێ لێی بخواتەوە هەرگیزاو هەرگیز تینوی نابێت، خەڵکانێ لە ئوممەتەکەی پەلامار دەدەن و بەرەو حەوزەکە دێن بەڵام مەلائیکەکان دەیانگێڕنەوە چونکە لەدوای خۆی گۆڕاون و شوێن رێبازی تر کەوتون، هەروەك لەفەرمودەی راست و دروستدا هاتووە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ، مَاؤُهُ أَبِيضُ مِنَ اللَّبَنِ، وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهَا فَلاَ يَظْمأُ أَبَداً)[1].

---

(١) - رواه البخاري.

واتە: پانتایی حەوزەکەم بەئەندازەی مانگە ڕێیەکە، ئاوەکەی لەشیر سپی ترە، بۆن و بەرامەکەی لە بۆنی میسك خۆشترە، ژمارەی ئەو دەفرو پەرداخانەی کە ئاوەکەی پێ دەخۆنەوە ئەوەندەی ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانن، هەرکەسێ لێی بخواتەوە هەرگیزاو هەرگیز تینوی نابێت.

هەروەها دەفەرموێت: (إِنِّي فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ، مَنْ مَرَّ عَلَيَّ شَرِبَ وَمَنْ شَرِبَ لَمْ يَظْمَأْ أَبَدًا، لَيَرِدَنَّ عَلَيَّ أَقْوَامٌ أَعْرِفُهُمْ وَيَعْرِفُونِي، ثُمَّ يُحَالُ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ). وفي رواية: (فَأَقُولُ: إِنَّهُمْ مِنِّي، فَيُقَالُ: إِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ، فَأَقُولُ: سُحْقًا سُحْقًا لِمَنْ غَيَّرَ بَعْدِي)[1].

واتە: من پێشڕەوتانم بۆ سەر حەوزەکە، ئەوەی بەلای من دا تێ پەڕێت لێی دەخواتەوە ئەوەشی لێی بخواتەوە هەرگیزاو هەرگیز تینوی نابێت؛ خەڵکانێ دەگێڕنەوە نایەڵن بێن بۆلام بۆ سەر حەوزەکە من دەیانناسم و ئەوانیش من دەناسن، لەپاشدا، پەردە دەکەوێتە نیوانمان من و ئەوان جیادەکەنەوەو دوردەخرێنەوە. لەریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: دەڵێم: ئەوانە لە ئوممەتی منن؛ مەلائیکەکان دەڵێن: تۆ نازانی ئەوانە لەدوای تۆ چییان کردووە لە دینەکەی تۆ پاشگەز بوونەوە و شوێن بەرنامەو ڕێبازی غەیری تۆ کەوتن، منیش دەڵێم: دوورە دوورە پەرێزی لەوانە کە لەدوای من گۆڕانکاریان لەدینی مندا کردووە و شوێن ڕێبازی تر کەوتون.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕی تەواویان هەیە بە شەفاعەت کردن، باوەڕیان هەیە بە (مقام المحمود) ئەو پلە بەرزەی کە دانراوە بۆ یەکێ لە بەندەکانی خوا، بۆ پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) جێگیری دەکەن:

---

(١) - رواه البخاري.

* شەفاعەت کردنی بۆ خەڵکانی راوەستاوی گۆڕەپانی مەحشەر هەتا خوای گەورە بڕیاری جیاکردنەوەی بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان دەدات؛ ئەمەش بریتیە لە (مقام المحمود).

* شەفاعەت کردنی بۆ خەڵکانی بەهەشت بۆ ئەوەی بچنەناویەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆشی یەکەم کەس دەچێتە ناو بەهەشتەوە.

* شەفاعەت کردنی بۆ مامەی ئەبو (طالب)، کە سزای لەسەر سوك بکرێت.

ئەم سێ شەفاعەتە تایبەتن بە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، بۆ هیچ کەسێکی تر نیە.

شەفاعەت کردنی (صلى الله عليه وسلم) بۆ بەرزکردنەوەی پلەی هەندێ لەئوممەتی لەوانەی کە چونەتە بەهەشتەوە بۆ ئەوەی پلەیان بەرزتر بکرێتەوە، شەفاعەت کردنی بۆ کۆمەڵێ لە ئوممەتەکەی کە دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێپێچینەوە.

شەفاعەت کردنی بۆ ئەوانەی کردەوە چاکەکان و کردەوە خراپەکانیان وەك یەك وایە؛ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شەفاعەتیان بۆ دەکات هەتا بچنە بەهەشتەوە، شەفاعەت دەکات بۆ خەڵکانێ کە فەرمانیان پێ کراوە بچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە شەفاعەتیان بۆ دەکات بۆئەوەی نەچنە دۆزەخەوە.

شەفاعەت کردنی بۆ هێنانەدەرەوەی ئەو یەکتاپەرستانەی کە تاوانبارن لە ئاگری دۆزەخ و شەفاعەت بۆ دەکات بۆ ئەوەی بچنە بەهەشتەوە و دەچنە بەهەشتەوە.

مەلائیکەکان و پێغەمبەران و شەهیدەکان و راستگۆیان و پیاوچاکان و باوەڕداران لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشداری دەکەن لەم شەفاعەت کردنەدا[1].

لەپاشدا خوای گەورە کۆمەڵانێ لەئاگر دەردەهێنێت بەبێ شەفاعەت، بەڵکو بە فەزڵ گەورەیی و منەت و بەخشین و سۆز و بەزەیی خوای پەروەدگار خۆی.

هەروەها باوەڕیان وایە کە کردەوەی چاکە لە قیامەتدا شەفاعەت دەکات بۆ خاوەنەکەی هەروەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی داوە لەو بارەوە دەفەرموێت:

(الصِّيَامُ وَالْقُرْآنُ يَشْفَعَانِ لِلْعَبْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[2].

واتە: لە قیامەتدا رۆژوو قورئان شەفاعەت دەکەن بۆ بەندە.

کافر و هاوبەش بۆ خوا دانەران؛ شەفاعەتیان بۆ ناکرێ بە پێی ئەم ئایەتە:

﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْـَٔازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَـٰظِمِينَ ۚ مَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴾ سورة غافر: ١٨.

واتە: ئەوان لەڕۆژە نزیکەکە (قیامەت) بترسێنە، لەو کاتەی دڵەکان (لەترسا) گەشتوونەتە گەروو هەموو پیش دەخۆنەوە، ستەمکاران نەهیچ دۆستێکیان هەیە و نە تکاکارێك بەگوێی بکرێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَـٰعَةُ ٱلشَّـٰفِعِينَ ﴾ سورة المدثر: ٤٨.

واتە: ئیتر تکای تکاکاران هیچ قازانجێکتان پێ ناگەیەنێت.

---

(١) – ويشترط لهذه الشفاعة شرطان: الأول: إذن الله تعالى في الشفاعة، لقوله:{مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِه} سورة البقرة: ٢٥٥. الثاني: رضا الله تعالى عن الشافع والمشفوع له، لقوله: { وَلا يَشْفَعُونَ إِلاَّ لِمَنِ ارْتَضَى} سورة الأنبياء : الآية، ٢٨. وقد جمع الله تعالى شروط الشفاعة في قوله سبحانه: {وَكَمْ مِنْ مَلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلا مِنْ بَعْدِ أَنْ يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَرْضَى} سورة النجم: الآية، ٢٦.

(٢) – انظر: (صحيح الجامع الصغير) للألباني، برقم: (٣٨٨٢).

لەرۆژی دوایی دا مردن دەهێنرێت؛ سەردەبڕێت هەروەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی داوە لە فەرمودەی راست و دروستدا.

گەورەترین ناز و نیعمەتێ کە خوای گەورە دەیبەخشێ بە خەڵکی بەهەشت، ئەوەی کە زیاتر خەڵکانی ئاگر پێی سەغڵەت دەبن و خەفەتی پێ دەخۆن مانەوەی هەمیشەیی و نەبڕانەوەی ژیانی دوارۆژە، مردن فەرمانێکی نادیار مەعنەویەو هەستی پێ ناکرێت بە بیننین، بەڵام خوای گەورە دەیکاتە شتێکی بەرجەستە و بینراو لەنێوان بەهەشت و ئاگردا سەردەبڕێت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(إِذَا صَارَ أَهْلُ الْجَنَّةِ إِلَى الْجَنَّةِ، وَصَارَ أَهْلُ النَّارِ إِلَى النَّارِ، أُتِيَ بِالْمَوْتِ حَتَّى يُجْعَلَ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، ثُمَّ يُذْبَحُ ثُمَّ يُنَادِي مُنَادٍ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ! لا مَوْتَ. وَيَا أَهْلَ النَّارِ! لا مَوْتَ؛ فَيَزْدَادُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَرَحًا إِلَى فَرَحِهِمْ، وَيَزْدَادُ أَهْلُ النَّارِ حُزْنًا إِلَى حُزْنِهِمْ)[1].

واتە: کاتێ کە خەڵکی بەهەشت چوونە بەهەشتەوە، خەڵکی ئاگریش چوونە ئاگرەوە، مردن دەهێنرێت لەنێوان بەهەشت و ئاگردا دادەنرێت؛ لەپاشدا بە بەرچاوی خەڵکەوە سەردەبڕێت، ئینجا جارڕدەرێك جاڕ دەدات و دەڵێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! ئیتر مردن نەما، ئەی خەڵکی ئاگر! ئیتر مردن نەما؛ ئیتر خەڵکی بەهەشت زیاتر هەست بە خۆشی و شادی دەکەن شادی لەدوای شادی، خەڵکی ئاگریش زیاتر دڵتەنگ و خەفەتبار دەبن خەفەتباری لەدوای خەفەتباری.

(١) – رواه مسلم.

## پایەی شەشەم

## باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەر[1].

ئەهلی سوننەو جەماعە: بیروباوەڕیان وایە بەبیروباوەڕێکی جێگیر و تەواو کە هیچ گومان و دوودڵیەکی تێدا نیە کە هەموو چاکەو خراپەیە لەم بوونەوەرەدا بە قەزاو قەدەری خوای پەروەردگارە، خوای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هەر شتێ ویستی لەسەری بێ دەیکات و کەس ناتوانێ رێگری لێ بکات، ئەوەی بیەوێ دەیکات؛ هەموو شتێ بە ویست و خواست و بڕیار و پلان و بەڕێوەبردن و توانای ئەوە؛ هیچ شتێ لە خواست و فەرمان و تواناو ئەندازە بۆدانانی ئەو دەرناچێت پاك و بێگەردی بۆ خوا.

خوای گەورە زانیاری دەربارەی هەموو شتێك هەیە کە بووە، هەرشتێك کە دەبێ لە شتەکان پێش ئەوەی ئەو شتە ببێت هەر لە کۆنەوە واتە لە ئەزەلەوە، هەر شتێك کە رودەدات خوای پەروەردگار زانیاری دەربارەی هەیە کاتەکانیشیان زانراوە لای ئەزانێ چ کاتێك رودەدەن، لەسەر چی سیفەت و شێوەیەکی دیاریکراو و تایبەتە خوای گەورە زانیاری دەربارەی هەیە، ئەو شتە رودەدات بە گوێرەی ئەوەی خوای پەروەردگار ئەندازەی بۆ داناوە.

خوای پەروەردگار بۆ هەرچی (مقادیر) ئەندازەدانانێك ئەندازەو بڕێکی بۆ داناوە بۆ هەموو شتێك لە بوونەوەردا کە بوونە بە گوێرەی ئەوەی کە خوای پەروەردگارزانیاری لەسەری هەیە پێشوەخت، بەو شێوەیەی کە حیکمەت و دانایی پەروەردگار پێویستی کردووە بەو شێوەیە دەبێت، زانیاری هەیە دەربارەی ئەحواڵ و بارودۆخی بەندەکانی پێش ئەوەی کە دروستیان بکات، زانیاری هەیە دەربارەی

---

(١) – قضاء والقدر: واتە بڕیاردان و ئەندازە بۆ دانان.

ڕۆزییان و کاتی مردن و ئاکامیان و کردەوەکانیان، زانیاری هەیە دەربارەی ئەوەی کە توشیان دەبێت و دێتە ڕێیان لە کامەرانی خۆشبەختی و نەگبەتی و نەهامەتی، جگە لەمانەش لە کاروبارەکانی بەندەکاان، سەرجەم ئەو زانیارییانەی کە هەیەتی نوسیوە؛ هەموو شتێکی نوێ و داهێنراو لە زانیاری و تواناو ویست و خواست و بڕیاری ئەوەوە دەردەچێت پاك و بێگەردی بۆ خوا.

پوختەی قسە ئەمەیە: (قەدەر)ئەندازە بۆدانان زانستی خوا پێشی کەوتووە واتە پێش ئەوەی کە ڕوبدات خوای گەورە شارەزایی لەبارەیەوە هەیە، لەسەر ئەو شارەزاییە قەڵەم نوسیویەتیەوە، لەوەی کە هەیە لە بوون هەتا ئەوکاتەی کە پەروەدگار ویستی لێیەتی کە ببێ هەتا هەتایی، بۆیە پێویستە لەسەر باوەڕدار خۆبەدەستەوەدانێکی تەواو و ملکەچیەکی ڕەهای هەبێت بۆ خوا دەبارەی مەسئەلەی قەدەر؛ لەبەرئەوە قەدەر نادیار(غیب)ە، بناغەی نادیار(غیب)یش لەسەر خۆبەدەستەوەدانە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴾ سورة الأحزاب: ٣٨.

واتە: باوو ڕێگای (دانراوی) خوایە لەناو پێغەمبەرانی لەمەوپێشدا، فەرمانی خواش بڕیارێکی بڕیار دراوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴾ سورة الفرقان: ٢.

واتە: هەموو شتێکی لەنەبوونەوە بەدیهێناو ئەندازەگیری تەواویشی بۆ کرد.

دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴾ سورة القمر: ٤٩.

واتە: ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە بەدیهێناوە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (لَا يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، وَحَتَّى يَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ)[1].

---

(١) – (صحيح سنن الترمذي) للألباني.

واتە: بەندە ئیمانی نیە هەتا باوەڕی تەواو بە قەدەری خوای گەورە دێنێت بە خێر و شەڕیەوە، هەتا بە تەواوی دەزانێت کە ئەوەی توشی بووە و بەریکەوتووە بۆ ئەوە نەبووە توشی نەبێت، ئەوەشی توشی نەبووە بۆ ئەوە نەبووە کە توشی نەبێت.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە باوەڕهێنان بە قەدەر نایەتەجیٚ و تەواو نابێت بەم چوارە نەبێت، کە ناسراوە بە: پلەکانی قەدەر، یان پایەو کۆڵەکانی قەدەر، ئەم چوار پایە دەروازەیەکی راست و دروستن بۆ تێگەیشتن لە باسەکانی قەدەر، باوەڕهێنان بە قەدەر نایەتەجیٚ و تەواو نابێت تەنها بە بەجێهێنانی هەموو پایەکانی نەبێت و بەو شێوە راست و دروستە نەبێت کە خوای گەورە پێی رازی یە؛ لەبەرئەوە ئەو چوار پایە تەواوکەری یەکترن و هەندێکیان وابەستەی هەندێکیانن؛ ئەوەی دانی نا بە سەرجەمیاندا ئەوە باوەڕی بە قەدەر تەواوە، هەر کەسیٚ یەکێکیانی لیٚ کەم بکات، یان ئینکاری یەکێکیان بکات، ئەوە بەڕاستی شیرازەی باوەڕی بە قەدەر تێکچوەو باوەڕی بە قەدەر ناتەواوە.

پلەی یەکەم: زانیاریی خوای پەروەردگار: بریتیە لە باوەڕهێنان بەوەی کە خوای گەورە شارەزاو زانایە بە هەموو شتێك؛ زانینیشی دەوری هەموو شتێکی داوە کە هەیە، ئەوەشی کە دەبێت، ئەوەشی کە نابێت، ئەگەر ببوایە چۆن دەبوو؛ بە کورتی و بە فراوانی، لەخوا گوم نابیٚ قورسایی تۆزقاڵە گەردیلەیەك لەئاسمانەکان و زەویدا، خوای گەورە زانویەتی دروستکراوەکان چی دەکەن لەپێش دروستکردنیاندا، زانایەو شارەزایی هەیە دەربارەی رۆزییان و کاتی مردنیان و وتەکانیان و کردەوەکانیان و جوڵانەوەیان و هەڵسوکەوتیان، زانایەو شارەزایی هەیە بەوەی لە بەندەکانی کامەیان بەختەوەرەو ئەهلی بەهەشتە و کامەیان

بەدبەختەو ئەهلی دۆزەخە، ئەمانەش هەر هەموو بە زانایی کۆن و لەپێشتری خۆی دەیانزانێ کە هەر لە ئەزەلەوە هەیبووەو هەتا هەتاییەو بەوەش ناسراوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ سورة التوبة: ١١٥.

واتە: بێگومان خوا زاناو ئاگادارە بەهەموو شتێك.

پلەی دووەم: نوسینی خوای پەروەردگار: بریتیە باوەڕهێنانێكی تەواو بەوەی کە خوای گەورە سەرجەم زانیارییەکانی کە پێش وەخت هەیبووە دەربارەی ئەندازە بۆ دانانی دروستکراوەکان هەتا رۆژی قیامەت نوسیویەتی لە (لوح المحفوظ)داو تۆماری کردون، (لوح المحفوظ)یش بریتیە لە کتێبێ هەموو شتێکی تێدایە هیچی بەجێ نەهێشتووە لەوەی کە ریداوەو و لەوەشی کە رودەدات بەبێ زیادو کەم هەتا رۆژی قیامەت هەمووی تۆمار کردووە لە (أُمّ الْكِتَابِ)دا، هەروەها ناسراوە بە: (الذِّكْرَ)، (وَالإِمَامُ)، (وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ)، ئەمانە هەر هەموویان ناوی (لوح المحفوظ)ن، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ﴾ سورة يس: ١٢.

واتە: هەموو شـتێکمان لـە کتێب و نامەیەکی ئاشکرادا ئامادەو تۆمار کردووە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمَ، فَقَالَ: اكْتُبْ؟ قَالَ: مَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: اكْتُبِ الْقَدَرَ مَا كَانَ وَمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى الأَبَدِ)[1].

واتە: بە دڵنیاییەوە یەکەم شتێ کە خوای گەورە دروستی کرد بریتی بوو لە قەڵەم پێنوس، پێی فەرموو: بنوسە، وتی: چی بنوسم؟ فەرمووی: قەزاو قەدەری من بنوسە ئەوەی بووەو ئەوەی کە دەبێت هەتا هەتایە.

---

(١) – (صحيح سنن الترمذي) للألباني.

پلەی سێیەم: خواست ویستی خوای پەروەردگار، واتە: هەموو شتێ کە لەم بوونەوەرەدا رودەدات بە خواست و ویستی خوای گەورە رودەدات لەنێوان سۆز و بەزەیی و کاربەجێی و حیکمەتی خۆی، ئەوەی بیەوێ رێنمایی دەکات بە سۆز و بەزەیی خۆی، ئەوەی بیەوێ گومڕای دەکات بە کاربەجێی و حیکمەتی خۆی، لەسەر ئەوەی کە دەیکات پرسیاری لێ ناکرێ لەبەر تەواویی و کاربەجێی و حیکمەتی و دەسەڵاتی، بەڵکو سەرجەم بەندەکان پرسیاریان لێ دەکرێت لەسەر ئەوەی کە دەیکەن، بێگومان ئەمەش رێك و تەبایە لەگەڵ ئەو زانیارییە پێشوەختەی کە خوای گەورە هەیەتی و نواسراوە لە (لوح المحفوظ)داو تۆمار کراوە، ویستی خوای گەورە جێبەجێ بووە، دەسەڵاتی گشتگیرە، ئەوەی خوای گەورە خواست و ویستی لەسەری بووە، ئەوەی خواست و ویستی لەسەری نەبووە نابێت، هیچ شتێ ناتوانێ لە خواست و ویستی خوای گەورە دەرچێت، هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ سورة التكوير: ٢٩.

واتە: ئێوە ئارەزووی ئیسیقامە ناکەن، مەگەر کاتێ کە پەروەردگاری جیهانەکان ئارەزووی بکات.

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (إِنَّ قُلُوبَ بَنِي آدَمَ كُلَّهَا بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ، كَقَلْبٍ وَاحِدٍ، يُصَرِّفُهُ حَيْثُ يَشَاءُ)[١].

واتە: بێگومان دڵەکانی هەموو نەوەکانی ئادەم وەك یەك دڵ وان لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی پەروەردگاردا، چۆن بیەوێ هەڵیان دەسوڕێنێ.

---

(١) - رواه مسلم.

پلەی چوارەم: دروستکردن: بریتیە باوەڕهێنانی تەواو بەوەی کە هەرچی لەم بوونەوەرەدایە بە خۆی و جوڵەو سیفەتیەوە لەلایەن خوای گەورەوە دروستکراوە، هیچ پەروەردگارێك و بەدیهێنەرێکی تری بە هەق نیە جگە لە (الله)، جگە لە (الله) هەموو شتێ لەنەبوونەوە بەدیهێنراوە، بەهیچ شێوەیە پێشتر بوونی نەبووە، هەر خوای گەورەیە بەدیهێنەری هەموو کارێك و بەدیهێنەری بکەرەکەشیەتی، هەروەها بەدیهێنەری هەموو جوڵانەوەیەك و ئەو جوڵەیەیەش کە کردویەتی، هەر شتێ کە لەم بوون و بوونەوەرەدا روئادات ئیللا خوای گەورە دروستکاریەتی؛ پاك و بێگەردی بۆ خوای بەرز و بڵند.

خوای پاك و بێگەرد دەفەرموێت:﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴾ سورة الفرقان: ٢.

واتە: خوا هەموو شتێکی دروستکردووەو بە مەزەندە مەزەندەی کردووە.

بەڕاستی خوای گەورە دروستکەری تاك و تەنیای هەموو بوون و بەدیهێنراوێکە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە بەبێ ئەوەی بڵێی بێجگە لەوە، جگە لە (الله) هیچ بەدیهێنراوێك و پەروەدگارێکی تری بە هەق نیە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴾ سوره الزمر: ٦٢.

واتە: خوا دروستکاری هەموو شتێکەو خۆی بەسەر هەموو شتێکدا چاودێر و سەرکارە.

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴾ سورة غافر: ٦٢.

واتە: ئەمەیە خوای پەروەردگاری ئێوە دروستکاری هەموو شتێکە.

دەفەرموێت:

﴿ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُم ﴾ سورة فاطر: ٣.

واتە: ئایا جگە لەخوا دروستکارێکی تر هەیە کەڕۆزیتان بدات.

خوای پاك و بێگەرد؛ دروستکاری بەندەکان و کاروکردەوەکانیشیانە، هەر شتێك کە ڕوودەدات لەم بونەوەرەدا لە چاکەو خراپە، لە باوەڕهێنان و بێ باوەڕی، لە گوێڕایەڵی کردن و سەرپێچی کردن هەر هەمووی بە ویستی خوای گەورە بووەو، ئەو خۆی ئەندازەی بۆ داناوەو دروستیشی کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَاكَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ سورة يونس: ١٠٠.

واتە: بۆ هیچ کەسێك نی یە کەبڕوا بێنێ مەگەر بە ویستی خوا.

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا ﴾ سورة التوبة: ٥١.

واتە: (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) بڵێ هیچمان تووش نابێت بێجگە لەوەی کەخوا نوسیویەتی بۆمان.

دەفەرموێت: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ سورة الصافات: ٩٦.

واتە: لە کاتێکدا خوا بەدیهێنەری خۆتان و ئەو بتانەشە دروستتان کردون.

ئەهلی سوننەو جەماعە: باوەڕیان هەیە بەوەی کە خوای گەورە گوێڕایەڵی پێ خۆشەو فەرمانیشی پێ دەکات، پاداشتی ئەو کەسانەش دەداتەوە کە پێی هەڵئەسن، سەرپێچی کردنیشی پێ ناخۆشەو ڕێگریشی لێ دەکات، تۆڵە دەسێنێ لەو کەسانەی کە پێی هەڵئەسن، ڕێنمایی هەرکەسێ دەکات بە فەزڵ و منەتی خۆی، هەرکەسێکیشی بوێ گومڕای دەکات بە دادپەروەری و کاربەجێی و حیکمەتی خۆی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾ سورة الزمر: ٧.

واتە: ئەگەر ئێوە بێ باوەڕبن ئەوە بێگومان خوا بێ نیازە لەئێوە و رازی نیە بە بێ باوەڕی بۆ بەندەكانی، ئەگەر سوپاسی خوا بكەن (گەردن كەچ بن) بەوە لێتان رازی دەبێت، هیچ گوناهبارێ گوناهی كەسێكی تر هەڵناگرێت.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ﴾ سورة الحجرات: ٧

واتە: زۆر چاك بزانن كە بێگومان پێغەمبەری خوا لە ناوتاندایە، ئەگەر بەگوێی ئێوەی بكردایە لەزۆرێك لەكارەكاندا تووشی ناڕەحەتی دەبوون، بەڵام خوا ئیمانی لاتان خۆشەویست كردووە و لەدڵتاندا (شیرین و) ڕازاوەی كردووە، بێزراو و ناشرینی كردووە لەلاتان بێ باوەڕیی و تاوان و سەرپێچی فەرمانی خوا، هەر ئەوانەن شارەزاو لەسەر ڕێبازی ڕاستن.

ئەو كەسەی كە خوای گەورە گومڕای بكات هیچ بیانو بەڵگەو بەهانەیەكی نیە، چونكە خوای گەورە بۆیە پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی كەس بەڵگەی نەمێنێ و بیانویان ببڕێت، خوا گەورە كردەوەی بەندە دەداتە پاڵ بەندە خۆی و بەدەستهێنانی لەلایەن بەندە خۆیەوەیەتی، داوای شتێكی لێ ناكا مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی، هەروەك لەم چەند ئایەتەدا دەفەرموێت:

﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۚ لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ ۚ﴾ سورة غافر: ١٧.

واتە: ئەمڕۆ هەموو كەس پاداشت یاسزا دەدرێتەوە بەگوێرەی ئەوەی كردوویەتی، ئەمڕۆ ستەم كردن نیە (لە كەس).

﴿إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ سورة الإنسان: ٣.

واتە: واتە: بیگومان ئێمە ڕێنمونیمان كرد بۆ ڕاستەڕێ، سایا سوپاس گوزارە، وەیا ناسوپاس و سپڵە.

﴿ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ﴾ سورة النساء: ١٦٥ .

واتە: تا هیچ بەڵگەو بیانویەك بۆ ئەو خەڵكە نەمێنێ لەلای خوا.

﴿ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ سورة البقرة: ٢٨٦.

واتە: خوا داوا لە هیچ کەسێك ناکات مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی.

﴿ فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ سورة الكهف: ٢٩.

واتە: جا هەرکەسێ دەیەوێت با باوەڕبێنێ و، هەرکەس دەیەوێت با کافر بێت.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە لە هیچ رویەکەوە کاری شەڕ و خراپەو ناشایستە نادرێتە پاڵ خوای گەورە، نە زاتی، نە سیفاتی، نە کرداری، ئەمەش لەبەر کەماڵی و تەواویی و سیفاتی و سۆزو بەزیی و دادپەروەری؛ چونکە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە رێنمایی و خێر و چاکە و چاکەکاری، رێگری و نەهی کردووە لە شەڕو خراپەو کوفر و گومڕایی و سەرپێچی کردن، بێگومان کاروکردەوەی خراپە بە کاربەجێی و حیکمەتی بێ کۆتایی و، ویست و خواستی خۆی دەبێ کە جێبەجێ بووە، بەڵام پێشی رازی نیە، بەڵکو لەلایەن بەندەکان خۆیانەوەیە؛ پاك و بێگەردی بۆ خوا.

﴿ مَّا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ﴾ سورة النساء: ٧٩.

واتە: هەر چاکەیەکت تووش بوو ئەوە لەخواوەیە، هەر خراپەیەکت تووش بوو ئەوە لە خۆتەوەیە.

خوای گەورە پاك و بێ گەردە لەهەموو ستەم کردنێك، بەدادپەروەری رەها ناسراوە؛ بە ئەندازەی تۆزقاڵە گەردیلەیە ستەم لە دروستکراوەکانی ناکات، سەرجەم کارەکانی رەحمەت و راست و دادپەروەرانەن.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلۡعَبِيدِ ﴾ سورة ق: ٢٩.

واتە: من هیچ جۆرە ستەمێك لە بەندەكانم ناكەم.

هەروەها دەفەرموێت:﴿ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴾ سورة الكهف: ٤٩.

واتە: پەروەردگارت ستەم لە كەس ناكات.

دەفەرموێت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ ﴾ سورة النساء: ٤٠.

واتە: بەڕاستی خوا بە ئەندازەی گەردیلەیەك ستەم ناكات.

خوای گەورە پرسیاری لیٚ ناكرێت لەهەر كارێك كەدەیكات؛ بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: ﴿ لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ﴾ سورة الأنبياء: ٢٣ .

واتە: (پرسیاری لیٚ ناكرێت (رەخنەی لیٚ ناگیریٚ) لەهەر كارێك كەدەیكات، بەڵام ئەوان (ئادەمیزاد) پرسیاریان لیٚ دەكریٚ.

**ئەهلی سوننەو جەماعە:**

باوەڕیان وایە كە خوای گەورە بەدیهێنەری ئادەمیزاد خۆی و كردەوەكانیەتی، بەڵام حەز و ئارەزوو ویست و خواست و تواناو هەڵبژاردنی پیٚ بەخشیوە بۆ ئەوەی كاروكردەوەكانی لەخۆیەوە سەرچاوە بگرن بەشێوەیەكی هەقیقی نەك بەشێوەیەكی مەجازی، لەپاشدا عەقڵ و هۆشی پیٚ بەخشیوە بۆ ئەوەی چاكەو خراپەی پیٚ لێك جیابكاتەوە، لێپیچینەوەی لەگەڵ ناكریٚ مەگەر لەسەر ئەو كاروكردەوانەی كە بە ویست و ئارەزوو ئیختیاری خۆی ئەنجامی داون، مرۆڤ زۆر لێكراو نیە واتە بەزۆر كاروكردەوەی پیٚ ناكرێت، بەڵكو خاوەنی حەز و ئارەزوو ویست و ئیختیار و هەڵبژاردنی خۆیەتی؛ خۆی بیروباوەڕ و كاروكردەوەكانی هەڵدەبژێریٚ، ئەوەندە هەیە كە حەز و ئارەزوو ویستی ئەو شوێنكەوتەی ویستی خوای گەورەیە، سەرجەم ئەو شتانەی كە خوای گەورە دەیەوێت ئەنجامیان بدات دەیانكات ئەوەی كە ویستی لێی بێت دەبێت، ئەوانەش كە نەیەوێت ئەنجامیان

بدات نایانکات ئەوەی کە ویستی لێی نەبێت نابێت، خوای گەورە دروستکاری کردەوەی بەندەکانە، هەرچەندە بە هەقیقەت خۆیان ئەنجامدەری خێر و چاکەو خراپەن؛ چونکە کردەوەکانیان لەڕووی دروستکردن و بڕیار و ئەندازە بۆدانانەکەی لەلایەن خواوەیە، ئەنجامدان و بەدەستهێنانیان لەلایەن بەندەوەیە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ سورة التكوير: ٢٨ – ٢٩.

واتە: بۆ ئەو کەسانەی کە بیانەوێ بەڕێی ڕاست دا بڕۆن لە ئێوە. ئێوە ئارەزوو (ی ڕێی ڕاست) ناکەن مەگەر کاتێك کە پەروەردگاری جیهانەکان بیەوێت.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ سورة القصص: ٦٨.

واتە: پەروەردگارت (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) ئەوەی بیەوێ دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێ، (خەڵکی) هەڵبژاردنیان بۆ نیە (لەکاری خوادا)، خوا پاك و بێگەرد و بەرز و بڵندە لـەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! أَفَلَا نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا، وَنَدَعُ الْعَمَلَ؟ قَالَ: (اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ، أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ)[1]. ثُمَّ قَرَأَ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾﴾ سورة الليل: ٥ – ٧ .

واتە: هیچ کەسێك لە ئێوە نیە ئیللا شوێنی لای خوای گەورە نوسراوە لەبەهەشتدا یان لەدۆزەخدا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)!

---

(١) - رواه البخاي ومسلم.

ئیتر بۆ کاربکەین، ئایا بۆ پاڵی لێ نەدەینەوە و خۆمان نەدەینە دەست قەدەر؟ فەرمووی: (کاربکەن، چونکە هەرکەسێك خوای گەورە کاری بۆ ئاسان دەکات بۆ ئەو شوێنەی کە بۆی دروستکراوە، بەختەوەران کاریان بۆ ئاسان دەکات بۆ کاری بەختەوەران و، بەدبەختان کاریان بۆ ئاسان دەکات بۆ کاری بەدبەختان) لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ۝٧ ﴾ سورة الليل: ٥ – ٧ .

واتە: هەرکەسێك ببەخشێت و خاوەن تەقوا بێت و ئیمان بە ڕێبازی پاکی ئیسلام بهێنێ، کارئاسانی دەکەین بۆ ڕێگەی ئاسان و حەوانەوە، هەرکەسێکیش چروکی بکات و هەوڵی دەوڵەمەندی بدات و ڕێگەی چاکی ئیسلام بەدرۆ بزانێت، ڕێگەی سەخت و مەینەتی بۆ دەکەینەوە.

خوای گەورە بەرپەرچی هاوبەش بۆ خوا دانەرانی دایەوە لەکاتێکدا کە کارەکانیان بەڵگەیان بە قەدەر دەهێنایەوە، بەم ئایەتە:

﴿ سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا بَأْسَنَا ۗ ﴾ سورة الأنعام: ١٤٨ .

واتە: ئەوانەی کەهاوبەشیان بۆ خوا دانا بوو لەمەو دوا دەڵێن: ئەگەر خوا بیویستایە ئێمەو باوو باپیرانمان هاوبەشمان (بۆخوا) دانەدەنا، هیچ شتێکمان حەرام نەدەکرد، هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەمانیش درۆیان کرد هەتا سزاو تۆڵەی ئێمەیان چەشت.

خوای گەورە بەرپەرچی درۆکانیانی دایەوە، بەم ئایەتە:

﴿ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا ۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴾ سورة الأنعام: ١٤٨.

واتە (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) بڵێ ئایا هیچ زانیارییەکتان لایە تا دەری بخەن بۆمانو دەری ببڕن، ئێوە شوێنی هیچ شتێك ناکەون بێجگە لەگومان و ئێوە هەر لەخۆتانەوە بەگوتره شت دەڵێن.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە قەدەری خوای گەورە نهێنیەکە لە نهێنیەکانی لەناو دروستکراوەکانیدا، کەسی لێ ئاگادار نەکردۆتەوە نە مەلائیکەیە لە مەلائیکە نزیکەکان، نە پەیامبەرێکی نێردراو، هیچ کەسێ نایزانێ و پەی پێ نابات مەگەر لەدوای روودانی، زۆر قوڵبوونەوەو رۆچون و تێڕوانینی زۆر تێیدا گومڕاییە؛ لەبەئەوەی خوای گەورە زانستی قەدەری لە بەندەکانی خۆی شاردۆتەوە، رێگری کردووە کە لەمەبەستی بگەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴾ سورة الأنبياء: ٢٣.

واتە: (خوا) پرسیاری لێ ناکرێت (رەخنەی لێ ناگیرێ) لەهەر کارێك کەدەیکات، بەڵام ئەوان (ئادەمیزاد) پرسیاریان لێ دەکرێ.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

بەتەواوی خۆیان داوە بەدەستەوە، بەدەستەوەدانێکی رەها بۆ ئەم فەرمودەی خوای گەورە: ﴿ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴾ النساء: ٧٨.

واتە: (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) بڵێ: هەمووی لەلایەن خواوەیە، ئەوە ئەو خەڵکە چی یانە؟ وەکو لە هیچ قسەیەك تێ نەگەن وایە.

هەروەها ئەم ئایەتەی سەرەوە دەکەنە بەڵگە بۆ ئەوانەی کە لەوەدا پێچەوانەیانن.

هەرکەس باوەڕی راست و دروستی هەبوو بە قەدەر وەك چۆن سەلەفی صالح باوەڕیان پێی هەبووە لە هاوەڵان و شوێنکەوتوان و شوێنکەوتوانیان لە چاکەدا،

ئەو کاتە بەندە دەبێتە خواپەرستێکی راستەقینە؛ جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خوا بەهرەی ڕشتووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان، ئەوەندەیان بەسە لە بەختەوەری کە هاوڕێ و هاوەڵی ئەوانەن.

## بنچینەی دووەم

## ناوبراوەکانی باوەڕهێنان لەلای ئەهلی سوننەو جەماعە

لە بنچینەکانی عەقیدەی سەلەفی صاڵح، ئەهلی سوننە و جەماعە؛ ئەمەیە کە باوەڕهێنان بریتیە لە: وتەو کردەوە، زیاد دەکات و کەمیش دەکات. واتە بریتیە لە: (باوەڕ پێ بوون بەدڵ و، وتن بەزمان و کردەوە بە ئەندامەکانی جەستە؛ بە گوێڕایەڵی و چاکەکردن زیاد دەکات، بە تاوان و سەرپێچی و بێ گوێی کەم دەکات)[1].

یان بریتیە لە:

* وتەو گوفتاری دڵ و وتەو گوفتاری زمان.

* کردەوەی دڵ و ئەندامەکانی جەستە.

* کردوەی دڵ: بریتیە لە باوەڕ پێ کردنی و بەڕاست خستنەوەی و ددان پێدانانی و، دڵنیایی.

وە وتەو گوفتاری زمان بریتیە لە: شایەتومان هێنان بە زمان و دان پێدانان بە پێویستیەکانیاندا.

---

(١) – الإيمان: لغة التصديق وإظهار الخضوع والإقرار. وشرعاً: جميع الطاعات الباطنة والظاهرة؛ فالباطنة؛ كأعمال القلب وهو تصديق القلب، والظاهرة؛ هي أفعال البدن من الواجبات والمندوبات. وملخصه: هو ما وقر في القلب وصدقه العمل، وبدت ثمراته واضحة في امتثال أوامر الله والابتعاد عن نواهيه؛ فإذا تجرد العلم عن العمل؛ فلا فائدة فيه، ولو كان العلم المجرد عن العمل ينفع أحداً لنفع إبليس – لعنه الله – فقد كان يعرف ان الله واحد لا شريك له، وأن مصيره لا شك إليه؛ لكن حين صدر إليه الأمر من الله تعالى: أن اسجد لآدم، أبى واستكبر وكان من الكافرين، ولم يشفع له علمه بالوحدانية والربوبية؛ لأنه لم يحقق توحيد العبادة الذي من أجلها خلق الله الخلق؛ إذن فالتصديق المجرّدُ عن العمل لا قيمة له عند رب العالمين! فهذا هو فهم أئمة السلف لحقيقة الإيمان. وأعلم أن االإيمان لم يأت في القرآن مجرداً عن العمل؛ بل عطف عليه العمل الصالح في كثير من الآيات والأحاديث. وهذا من باب العطف الخاص على عام، أو بعض على الكل، وذلك للتأكيد على الأعمال الصالحة.

* کردەوەی دڵ بریتیە لە: نیەت و خۆبەدەستەوەدان و تەسلیم بوون و، ئیخلاص و ملکەچ کردن و هیواو ئومێدو، ملدان و گەردن کەچی و پابەندبوون و خۆشەویستی کردەوە چاکەکان و خواست و ویست و ئیرادە.

کردەوەکانی ئەندامەکانی جەستە بریتیە لە: بەجێهێنانی فەرمانەکان و، وازهێنان و دورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان.

کەواتە باوەڕهێنان بریتیە لە: باوەڕ پێ بوون و وتە و کردەوە؛ بە گوێڕایەڵی و چاکەکردن زیاد دەکات، بە تاوان و سەرپێچی و بێ گوێی کەم دەکات، جا هەرکەسێك سەرجەم ئەمانە بەڕێکوپێکی جێبەجێ بکات؛ ئەوە باوەڕهێنانەکەی تەواو کردووە، ئەوەی دوان لەوانە جێبەجێ بکات بەبێ سێهەم ئەوە باوەڕی راست و دروست نیە، چونکە کردەوە لەلای ئەهلی سوننەو جەماعە بەشێکە لە باوەڕهێنان، دەچێتەناو بازنەی ناوبراوەکانی باوەڕهێنانەوە، باوەڕهێنانی بێ کردەوە راست و دروست نیە و تەواو نیە پاداشتی نیە، پێشەوایانی ئەهلی سوننەو جەماعە لەسەر ئەم وتە تەباو کۆکن و دەڵێن:

**(باوەڕهێنان دروست نیە مەگەر بە کردەوە، وتەو کردەوەیش دروست نیە مەگەر بە نیەت پاکی، وتەو کردەوە و نیەت پاکیش دروست نیە مەگەر رێك و تەبا بێت لەگەڵ سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم))**[1].

خوای گەورە سیفەتی بڕواادارانی راستەقینەی لە قورئاندا ناوە لەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو و کردەوە دەکەن بەوەی کە باوەڕیان پێی هێناوە لە بنچینەکانی دین و لقەکانی و روکەش و ئاشکراو ناخ شاراوەکانی، شوێنەواری ئەو

---

(١) – هذه القاعدة مشهورة عن أئمة السلف الصالح – رحمهم الله – مثل: الإمام الأوزاعي، وسفيان الثوري، والحميدي، وغيرهم، كما رواه الإمامان اللالكائي وابن بطة، وغيرهما.

باوەڕهێنانەش ڕەنگی داوەتەوە لە بیروباوەڕیان و، گوفتارەکانیان و، کردەوە ئاشکراو نهێنیەکانیاندا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ سورة الأنفال: ٢ – ٤.

واتە: بێگومان باوەڕدارانی ڕاستەقینە کەسانێکن کە کاتێك باسی خوا کراو ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت و دەهەژێت، ئەگەر ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بڕوایان زیاد دەکات و هەر پشت بەپەروەردگاری خۆیان دەبەستن. ئەوانەن کە بەڕاستی نوێژەکانیان بەجێ دەهێنن و لەو ڕسق و ڕۆزیەی پێمان داوون (لە پێناوی خوادا) دەیبەخشن. هەر ئەوانەن بڕوادارانی ڕاستەقینە پلەی بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان و لێ خۆش بوونی (تاوانەکانیان) و ڕۆزی پەسەندو چاکیان بۆ هەیە.

خوای گەورە لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئانە بەرز و پیرۆزەکەیدا ئیمانهێنانی لەگەڵ کردەوەکەی چاکەدا نزیك کردۆتەوەو گرێداوە، هەروەك لەم چەند ئایەتەدا لەوبارەوە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴾ سورة الكهف: ١٠٧.

واتە: بەڕاستی ئەوانە کەئیمان و باوڕیان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە بەهەشتەکانی فیردەوس جێگای (میوانداری) ئەوانە.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ ﴾ سورة فصلت: ٣٠.

واتە: بەڕاستی ئەوانەی وتیان: خوا پەروەردگارمانەو لەپاشان ڕاست (لەسەر ئایین) بەردەوام بوون، مەلائیکەکان پۆل پۆل دێنە لایان (کاتی مردن یان زیندوو بوونەوە) (پێیان دەڵێن) کەمەترسن و خەفەت مەخۆن.

﴿ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ سورة الزخرف: ٧٢.

ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە بۆ ئێوە ماوەتەوە (پێتان دراوە) بەهۆی ئەو کردەوانەوەی کە دەتانکرد.

﴿وَٱلْعَصْرِ ۞١ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ ۞٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ﴾ سورة العصر: ١ – ٣.

واتە: سوێند بە کات، مرۆڤ گشتی زیانبارە، مەگەر ئەوانەی کە بوونەتە خاوەن باوەڕو کارچاك بوون و یەکتریشیان بۆ کاری ڕاست دنەداوەو بۆ خۆگری ڕاسپاردووە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (قُل آمنت باللهِ، ثُمَّ استَقِيم)[١].

واتە: بڵێ باوەڕم هێناوە بە خوای گەورە، پاشان بەردەوام بە لەسەری.

هەروەها دەفەرموێت: (الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً؛ أَعْلاهَا شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلا اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ)[٢].

واتە: ئیمانهێنان حەفتاو ئەوەندە لقە چاکترینیان وتنی: (لاَ إِلَهَ إِلا اللَّهُ)یە، خوارترینی لادانی زیان و ئازارێکە لەسەر ڕێگا، شەرمیش لقێکە لە ئیمانهێنان.

**باوەڕهێنان و کردەوە هاوپێویستی یەکن و تەواوکەری یەکترن و لێك هەڵناوێرێن جیانابنەوە، کردەوە وێنەو کرۆك و جەوهەری باوەڕهێنانە، بریتیە لە داخوازی و پێویستیەکانی، نیوەی مانای کردەوەیە.**

---

(١) - رواه مسلم .

(٢) - رواه البخاري .

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە باوەڕهێنان بریتیە لە وتەو لە کردەوە، پلەو لقی زۆریان هەیە، بە گوێڕایەڵی و چاکەکردن زیاد دەکات هەتا بە ئەندازەی کێوێکی لێ دێت، بە تاوان و سەرپێچی و بێ گوێی کەم دەکات هەتا هیچی نامێنێت، ئەو کەسانەی کە خاوەن ئیمانن لە باوەڕەکەیاندا وەك یەك نین بەڵکو باوەڕەکەیان بەگوێرەی ئەو زانستەیە کە هەیانە و بەگوێرەی ئەو کردەوانەیانە کە دەیکەن، بۆیە هەندێکیان باوەڕەکەیان تەواوترە لەهەندێکی تریان. لە ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەدا چەندین بەڵگە هاتووە لەبارەی باوەڕهێنان کە زیاد دەکات و کەم دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ سورة التوبة: ١٢٤.

واتە: کاتێ کە بنێردرێتەوە خوارەوە سورەتێك (لەقورئان)، (دوو ڕووەکان) هی وایان هەیە دەڵێ: کام لە ئێوە زیادی کرد بەم (سورەتە) باوەڕی، جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ئەمە ئیمانیان زیاد دەکات (و بەهێزتر دەبێ) و ئەوان مژدە بەخشن و خۆش حاڵن.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا ۙ﴾ سورة المدثر: ٣١.

واتە: بڕوادارەکان بڕواکەیان زیاد بکات.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ سورة الأنفال: ٢ .

واتە: کاتێ کە ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بڕوایان زیاد دەبێت و هەر پشت بەپەروەردگاری خۆیان دەبەستن.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ﴾ سورة الفتح: ٤.

واتە: ئەو خوا زاتێکە ئارامی دابەزاندۆتە ناو دڵی ئیمانداران تا ئیمانیان زیاد بکات لەگەڵ ئەو ئیمانەی کە هەیانە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴾ سورة آل عمران: ١٧٣.

واتە: ئەوانەی کەخەڵکی پێیان دەووتن بە ڕاستی خەڵکی (بێ باوەڕ) لەشکر و کۆمەڵی زۆریان کۆکردۆتەوە لە دژتان کەواتە بترسن لێ یان، کەچی ئەوان (ئیمانداران) بەمە باوەڕیان زیاد بوو، وتیان: هەر خوامان بەسە چەند پشت پێ بەستراوێکی چاکە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ، وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ)(١). واتە: هەرکەسێك خۆشەویستیی لەبەر ڕەزامەندی خودا بێت، ڕق و کینەشی هەر لەبەر خودا بێت، ببەخشێت لە پێناوی خواو، دەست بگرێتەوە لەبەر خودا، ئەوە ئیمانی تەواوە.

هەروەها دەفەرموێت:

(مَنْ رَأَى مِنكُمْ مُنكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ؛ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ)(٢).

واتە: هەرکەسێ لە ئێوە شتێکی ناڕەوای دی با بەزەبری دەست و هێزی بازووی بیگۆڕێت، جا ئەگەر بەدەست نەیتوانی بەزمان و بە ئامۆژگاری بیگۆڕێ، ئەگەر بەزمانیش نەیتوانی بەدڵ پێی ناخۆش بێ، ئەمەش لاوازترینی ئیمانە.

---

(١) – صحيح سنن أبي داود: للألباني.

(٢) – رواه مسلم.

هاوەڵە بەڕێزەکان ڕەزای خوایان لێ بێ هەر بەم شێوەیە فێری باوەڕهێنان بوون، بەو شێوەیە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تێگەیشتن کە باوەڕهێنان بریتیە لە: بیروباوەڕ و وتەو کردەوە، بە کردەوەکانی دڵ و ئەندامەکانی جەستەو وتەی زمان زیاد دەکات؛ وەك گوێڕایەڵی کردن و ئەنجامدانی پەرستشەکان، هەروەها بە کردەوەکانی دڵ و ئەندامەکانی جەستەو وتەی زمان کەم دەکات؛ وەك ئەنجامدانی کردەوە حەرامەکان و خراپەکان و سەرپێچی کردن، خاوەنەکانیان وەك یەك نین؛ هەندێکیان بەفەرمانی خوا پێشکەوتوون بەهۆی چاکەکانیانەوە، هەندێکیان مام ناوەندین، هەندێکیشیان ستەمکارن لەخودی خۆیان، هەندێکیان چاکەکارن، هەندێکیان باوەڕدارن، هەندێکیان موسوڵمانن، لەلای خوای گەورە یەکسان نین؛ بەڵکو خوا فەزڵی هەندێکیانی داوە بەسەر هەندێکیاندا، هەندێکیانی چەند پلە بەرزکردۆتەوە بەسەر هەندێکی تریاندا.

ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی (أبو طالب) ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (الصَّبْرُ مِنَ الإِيْمَانِ بِمَنْزِلَةِ الرَّأْسِ مِنَ الجَسَدِ، مَنْ لا صَبْرَ لَهُ لا إِيْمَانَ لَهُ)[1]. واتە: شوێنی ئارامگرتن لە باوەڕهێناندا وەك شوێنی سەرە لە جەستەدا وەك سەر وایە بۆ جەستە، ئەوەی ئارامی نەبێت باوەڕی نیە.

هەروەها هاوەڵی پایەبەرز (عبدالله)ی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (اللَّهُمَّ زِدْنا إِيْمانا، ويَقِينا، وفِقْها)[2]. واتە: خودایە ئیمان و دڵنیایی و شارەزاییمان زیاد بکە.

(عبدالله)ی کوڕی عەباس و ئەبو هورەیرەو ئەبو (درداء) ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێن: (الإِيْمانُ يَزِيدُ ويَنْقُص)[1]. واتە: ئیمان زیاد دەکات و کەم دەکات.

---

(١) – أخرجه الإمام اللالكائي بإسناد صحيح في كتابه: «شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة».

(٢) – أخرجه الإمام اللالكائي بإسناد صحيح في كتابه: «شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة».

وەکیعی کوڕی جەڕراح ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (أَهْلُ السُّنَة يقولون: الإِيمانُ قولٌ وعمل)[٢]. واتە: ئەهلی سوننە دەڵێن: ئیمانهێنان وتەو کردەوەیە.

پێشەوای ئەهلی سوننە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (الإِيمانُ يَزِيدُ وَيَنْقُص، فَزِيادَتُهُ بالعَمَلِ، ونُقْصَانُهُ بِتَرْكِ العَمَل)[٣]. واتە: باوەڕهێنان زیاد دەکات و کەم دەکات، بە کرداری چاك زیاد دەکات و، بە وازهێنان و دورکەوتنەوە لە کرداری چاك کەم دەکات.

حەسەنی بەصری ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (لَيْسَ الإِيمانُ بالتَحلي وَلا بالتَمَنّي، وَلَكِنْ مَا وَقَرَ فِي القُلوب وَصدقَتْهُ الأَعْمالُ)[٤]. واتە: باوەڕهێنان بە خۆڕازندنەوەو خۆزگە نیە، بەڵکو ئەوەیە لەدڵاندا جێگیر بووەو کاروکردەوەکانیش بەڕستی بخاتەوە.

پێشەوا شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت:

(الإِيمَانُ: قَوْلٌ وَعَمَلٌ، يَزِيدُ ويَنْقُصُ، يَزِيد بِالطَّاعَةِ، وَيَنْقُص بِالْمَعْصِيَةِ)[٥].

واتە: باوەڕهێنان بریتیە: لە وتەو کردەوە، زیاد دەکات و کەم دەکات، بە کرداری چاك زیاد دەکات و، بە وازهێنان و دورکەوتنەوە لە کردەوەی چاك کەم دەکات. لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنًا﴾ سورة المدثر: ٣١.

واتە: بڕوادارەکان بڕواکەیان زیاد بکات.

پێشەوا (حافظ عبد الله الحميدي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (الإِيمَانُ: قَوْلٌ وَعَمَلٌ، يَزِيدُ ويَنْقُصُ، لاَ يَنفَعُ قولٌ إلاَّ بِعَمَلٍ، ولاَ عَمَلٌ وَقَولٌ إلاَّ بنيَّةٍ ، ولاَ عَمَلٌ وَقَولٌ ونيَّةٌ إلاَّ

(١) – أخرجه الإمام اللالكائي بإسناد صحيح في كتابه: «شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة».

(٢) – أخرجه الإمام اللالكائي بإسناد صحيح في كتابه: «شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة».

(٣) – أخرجه الإمام اللالكائي بإسناد صحيح في كتابه: «شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة».

(٤) – (اقتضاء العلم العمل) الخطيب البغدادى.

(٥) – انظر: «فتح الباري» ج١ ، ص ٦٢ ؛ كتاب الإيمان .

بِسُنَّةٍ)[1]. واته: باوەڕهێنان بریتیه: له وتەو کردەوە، زیاد دەکات و کەم دەکات، هیچ وتەیە سودی نیە مەگەر بەکردەوە، هیچ وتەو کردەوەیە سودی نیە مەگەر بە نیەتی پاکەوە بکرێت، وتەو کردەوەو نیەتی پاکیش سودیان نیە مەگەر لەسەر سوننەتی پێغەمبەری خوا بێ (صلى الله عليه وسلم).

(حافظ أبو عمر بن عبد البر) له کتێبی (التمهيد)دا دەڵێت:

(أَجْمَعَ أَهْلُ الفِقهِ وَالحَدِيثِ عَلَى أَن الإِيمانَ قَولٌ وَعَمَل، وَلا عَمَلَ إلا بِنيَّة، والإِيمانُ عِنْدَهُمْ يَزِيدُ بالطاعَة، ويَنْقُص بالمَعْصيَة، وَالطَّاعَاتُ كلها عِنْدَهُمْ إِيمان)[2].

واته: زانایانی فیقه و فەرمودە تەباو یەکڕان لەسەر ئەوەی کە باوەڕهێنان بریتیه له وتەو کردەوە، کردەوەیش نابێت بەنیەتی پاك نەبێ؛ باوەڕهێنان لەلای ئەوان بەگوێڕایەڵی کردن زیاد دەکات، بە ئەنجامدانی تاوان و خراپە کەم دەکات، سەرجەم گوێڕایەڵی کردنەکانیش لەلای ئەوان بریتین له باوەڕهێنان.

هاوەڵ (صحابه) بەڕێزەکان و شوێنەکەوتوان (تابعين)و شوێنکەوتوانیان له چاکەدا؛ هەروەها فەرمودەناسان و زانایانی فیقه و پێشەوایانی دین و شوێنکەوتوانیان لەسەر ئەم عەقیدەو بیروباوەڕە بوون کە باوەڕهێنان زیاد دەکات و کەم دەکات، هیچ کەسێ لە زانایانی (سلف)پێشین و (خلف)پاشین پێچەوانەی ئەمە ناجوڵێنەوە مەگەر لەحەق لایان دابێت لەم روەوە.

---

(١) – (أصول السنة) للإمام الحميدى: مطبوعة الآخر (مسنده) ج٢ ص٥٤٦.

(٢) – (التمهيد) ج٩ ص ٢٣٨.

**پوختەی قسە سەبارەت بە ناوبراوەکانی باوەڕهێنان لەلای ئەهلی سوننەو جەماعە ئەمەیە:**

بریتیە لەوەی کە جێگیر بووە لەدڵی بەندەدا، زمان و کردەوەکانی بەڕاستی داناوە، بەرهەم و شوێنەوارەکەی لە ئەندامەکانی جەستەیدا بەئاشکرا دەرکەوتووەو؛ بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوای گەورەو، دورکەوتنەوە لەقەدەغەکراوەکانی؛ لەبەرئەوە ناوی ئیمان بەڕاستی لە کەسێك دەنرێت کە هەر هەموو ئەوەی کە پێغەمبەری ئەمین و دەستپاك (صلی الله علیه وسلم) لەلایەن خوای گەورە و پەروەردگاریەوە هێناویەتی بەراستی دابنێ، بیروباوەڕی پێی هەبێ و دان پێدابنێ و رەفتاری پێ بکات. بێگومان بەندەکان لەڕووی ئیمانەوە جیاوازن هەرگیز یەکسان و چون یەك نین؛ لەبەرئەوە هەرکەس بەدڵ بەڕاستی دابنێ، بە زمانی دانی پێدابنێ، بەڵام بە ئەندامەکانی جەستەی هەڵنەسێ بە ئەنجامدانی کردەوچاکەکان و واجباتەکان کە فەرمانی پێکراوە هەرگیز شایەن و شایستەی ئەوە نیە ناوی ئیمانی لێ بنرێت واتە بە ئیماندار ناوزەد ناکرێت. هەروەها ئەو کەسەی بە زمانی دانی پێدابنێ و، بە ئەندامەکانی جەستەی کردەوەو رەفتاری پێ بکات، بەڵام دڵەکەی ئەمە بەڕاست دانەنێ ئەوەش شایەن و شایستەی ئەوە نیە ناوی ئیمانی لێ بنرێت واتە بە ئیماندار ناوزەد ناکرێت. هەرکەسێ کردەوە لە ئیمانهێنان دەربکات؛ واتە بڵێ بەس ئیمانهێنان بە زمان بەسەو کردەوە بەشێك نیە لەئیمانهێنان ئەوە (مرجئ)ەو بیدعەچی و گومڕایە.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

وەسفی ئیمان لە هیچ بەندەیە داناڕنن واتە هەر بە ئیمانداری دادەنێن ئەگەر کردەوەیە لە کردەوە قەدەغەکراوەکانی ئەنجامدا بەمەرجێ پێی کافر نەبێت، یان تەرکی یەکێ لە واجباتەکان بکات ئەگەر پێی کافر نەبێت بە تەرك کردنی، لە باوەڕهێنان دەری ناکەن مەگەر بە ئەنجامدانی کارێکی هەڵوەشێنەرەوە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی باوەڕهێنان.

ئەو کەسەی کە ئەهلی قیبلەیە تاوانی گەورە بکات لە ئیمان دەرناچێت، ئەگەر تاوانەکەی بە حەڵاڵ نەزانێت؛ ئەوکەسە لەدنیادا باوەڕدارە بەڵام باوەڕەکەی ناتەواوە، باوەڕدارە چونکە باوەڕی هەیە، بەڵام (فاسق)لەسنور دەرچوە چونکە تاوانی گەورەی ئەنجامداوە، لە دوارۆژدا لەژێر ویستی خوای گەورەدایە ئەگەر ویستی بە رەحمەت و فەزڵ و منەتی خۆی لێی خۆش دەبێت، ئەگەر ویستیشی بەدادپەروەری و حیکمەت و کاربەجێی خۆی سزای دەدات و تۆڵەی لێ دەسێنێت؛ لەبەرئەوە باوەڕهێنان لەلای ئەهلی سوننەو جەماعە قابیلی قبوڵ کردنی بەش بەش و پارچە پارچە بونە لەڕووی کار پێ کردنی و هەستان بە ئەنجامدانی واجباتەکانی، بە بوونی کەمێ لەو ئیمانە خوای گەورە بە فەزڵ و رەحمەت و منەت و بەخشندەیی خۆی ئەوەی بچێتە ناو ئاگرەوە دەهێنێتە دەرەوە لە ئاگر ئەگەر موشریك نەبێ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (لا يَدْخُلُ النَّارَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ)(١).

واتە: ناچێتە ناو ئاگری جەهەنەمەوە ئەوکەسەی بە ئەندازەی تۆوە خەرتەلەیەك ئیمان لەدڵ و دەرونیدا هەبێت.

(١) – رواه البخاري .

لەم رووە شەرعیەوە؛ ئەهلی سوننەو جەماعە هیچ کەسێ لە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەن بەهۆی ئەنجامدانی هەر تاوانێکەوە بێت؛ مەگەر بە ئەنجامدانی تاوانێك کە بنچینەکانی باوەڕهێنانی پێ لابچێت، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ سورة النساء: ٤٨.

واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگە لەوە خۆش ئەبێت لەهەر گوناهێکی تر بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

(أَتَانِي جِبْرِيل عليه السَّلام فَبَشرنِي أَنَهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أمَّتِك لا يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئا دَخَلَ الجَنَة، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَق؛ قَالَ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سرَقَ)[١].

واتە: جبریل سەلامی خوای لەسەر بێ هات بۆلام موژدەی پێدام بەوەی کە هەرکەس لە ئومەتەکەت بمرێت هیچ هاوبەشێك بۆ خوای گەورە بڕیار نەدات دەچێتە بەهەشتەوە، وتم: ئەگەر زیناکار و دزیش بێت؟ وتی: ئەگەر زیناکار و دزیش بێت.

هاوەڵی گەورەو پایەبەرز ئەبو هورەیرە دەڵێت: (الإِيمَانُ نَزِهٌ؛ فَمَنْ زَنَا فَارَقَهُ الإِيمَانُ، فَإِنْ لامَ نَفْسَهُ وَرَاجَعَ ؛ راجعَه الإِيمان)[٢]. واتە: ئیمان بریتیە لە دورەپەرێزی لە تاوان کردن ؛ ئەگەر کەسێ زینا بکات باوەڕەکەی لێ جیادەبێتەوە، ئەگەر سەرزەنشتی خۆی کردو پەشیمان بۆوەو گەڕایەوە، ئەوە باوەڕەکەی بۆ دەگەڕێتەوە.

هاوەڵی گەورەو پایەبەرز ئەبو (درداء) دەڵێت: (مَا الإِيمَانُ ؛ إِلّا كَقَمِيصِ أَحَدكُمْ يَخْلَعُهُ مرة وَيَلْبَسُهُ أخرى، وَاللهِ مَا أَمِنَ عَبد عَلَى إِيمانهِ إِلّا سُلِبَهُ فَوجدَ فَقْدَه)[٣].

---

(١) – رواه البخاري ومسلم.

(٢) – أخرجها الإمام اللالكائي في كتابه القيم: (شرح اصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٣) – أخرجها الإمام اللالكائي في كتابه القيم: « شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

واتە: باوەڕهێنان وەك پۆشاکی هەر یەکێ لەئێوە وایە جارێ لەبەری دادەکەنێت و، جارێکی تر لەبەری دەکاتەوە، سوێند بە خوا هەر بەندەیە ئەمین و دڵنیابوو لە ئیمانەکەی ئەوا کاتێك دەزانێ ئیمانی نامێنێ.

لەزانای گەورەو پایەبەرزی ئوممەتەوە جێگیر بووە؛ واتە (عبدالله)ی کوڕی عەباس رەزای خوایان لێ بێ، کە غوڵامەکانی یەك بە بەیەك بانگ دەکرد پێی دەوتن:

(أَلَا أُزَوِّجُكَ؟ مَا مِنْ عَبْدٍ يَزْنِي؛ إِلَّا نَزَعَ اللهُ مِنْهُ نُور الْإِيمَان)[١].

واتە: ئەرێ ژنت بۆ نەهێنم؟ چونکە هیچ بەندەیە نیە کە زینا بکات؛ ئیللا خوای گەورە نوری ئیمان لەدڵیدا دادەڕنێت و لێی دەردەکات.

عیکریمە رەزای خوای لێ بێ پێی وت: خوای گەورە چۆن نوری ئیمان لەدڵیدا دادەڕنێت؟ (عبدالله)ی کوڕی عەباس وتی: (بەم شێوەیە پەنجەکانی دەستی خۆی کرد بەناو یەکدا لەپاشدا دەریهێنان – جا ئەگەر پەشیمان بویەوەو گەڕایەوە بەم شێوەیە دەگەڕێتەوە بۆی دیسان پەنجەکانی کردەوە بەناو یەکدا)[٢] *.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

پێیان وایە (الاستثناء) لە ئیمانهێناندا دروستە؛ پێیان وایە رەوایە بەڵام لایان واجب نیە، وەك ئەوەی کە دەڵێن: (من ئیماندارم (إن شاء الله) واتە: ئەگەر خوای

---

(١) – انظر: « فتح الباري » ج١٢ ، ص ٥٩ .

(٢) – رواه البخاري .

*يقول الإمام البخاري رحمه الله: ( لقيت اكثر من الف رجل من أهل العلم، أهل الحجاز ومكة والمدينة والكوفة والبصرة وواسط وبغداد والشام ومصر : لقيتهم كرات قرنا بعد قرن ثم قرنا بعد قرن، أدركتهم وهم متوافرون منذ أكثر من ست وأربعين سنة– ويذكر أسماء العلماء وهم أكثر من خمسين عالما ثم يقول: – واكتفينا بتسمية هؤلاء كي يكون مختصرا وأن لا يطول ذلك ، فما رأيت واحدا منهم يختلف في هذه الأشياء : أن الدين قول وعمل ، لقول الله: [وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ] سورة البينة : ٥ . . . ثم يسرد بقية اعتقادهم). انظر: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة « للالكائي.

گەورە ویستی لەسەر بێت، (الاستثناء) لەلایان لەپێشترە لەنەبوونی، لەبەرئەوە بڕیاری باوەڕهێنانی تەواو نادەن بۆ خۆیان، ئەوەش لەبەر زۆر خۆپاریزی و لەخوا ترسانیانە، لەگەڵ جێگیرکردنی قەدەری خواو، بە چاك و پاك دانەنانی دڵ و دەرونیان، نەك وەك گومانێ لەوەی كە پێویستە لەسەریان باوەڕیان پێی هەبێت، دەترسن هەڵنەسابن بە ئەنجامدانی حەقیقەتەكانی باوەڕهێنان، بەهیوای ئەوەن هەستن بە واجباتەكانی و تەواویەكانی، چونكە باوەڕهێنانی رەها ئەنجامدانی هەموو كردارە چاكەكان و دورکەوتنەوە لەهەموو قەدەغەكراوەكان دەگرێتەوە.

(الاستثناء) قەدەغەدەکەن ئەگەر لەڕووی گومان کردنەوە بێت لە باوەڕهێنانەکەیان، چونکە گومان کردنی بەندە لە باوەڕهێنانەکەی کوفرە؛ بەڵکو مەبەستیان لەمە: لەڕوویەکەوە نەهێشتنی گومان کردنە لە باوەڕهێنانەکەیاندا، لەڕوویەکی ترەوە بڕیاری نەدانی باوەڕهێنانی تەواوە بۆ خۆیان، بەم دەربڕین و دەستەواژەیە پرسیارکردنیان دەربارەی باوەڕهێنان پێ ناخۆشە، پێیان وایە بیدعەیە، بەڵگە زۆرە لەسەر دروستی وتەکەیان لە ئایەتەکانی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)، لەگەڵ شوێنەوار(آثار)ی سەلەف و، وتەی پێشەوایان و زانایاندا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىٍْٔ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾ سورة الكهف: الآيتان: ٢٣-٢٤.

واتە: بۆ هیچ شتێك و هیچ کارێك مەڵێ من بەڕاستی بەیانی ئەنجامدەری ئەو کارەم، مەگەر لەگەڵیدا بڵێی ئەگەر خوای گەورە ویستی لێی بێ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴾ سورة النجم: ٣٢.

واتە: کەواتە خۆتان بەچاك و پاك دامەنێن، خوا زاناترە بەو کەسەی پارێزکارە.

لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەچووە ناو گۆڕستان دەیفەرموو: (السلامُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الديارِ مِنَ المؤْمِنينَ وَالمُسْلِمين وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاَحِقُون، أَسْأَلُ اللهَ لَنَا وَلَكُمُ العافِيةَ)[١].

واتە: سەلامی خواتان لەسەر ئەی خەڵکی ئەم ماڵانە لە باوەڕداران و موسوڵمانان، ئێمەش ئەگەر خوا ویستی لێ بێت پێتان دەگەینەوە، داوام وایە لەخوای گەورە کە ئێمەو ئێوەش لەخۆشی و شادیدا بین.

هاوەڵی گەورەو پایەبەرز (عبد الله)ی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (مَنْ شَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أنهُ مُؤمن؛ فَلْيَشْهَد أَنَّهُ في الجَنةِ)[٢].

واتە: هەرکەسێ شایەتی لەسەر خۆی بدات کە باوەڕدارە ئەوە با شایەتیش ئەوەش بدات کە لە ئەهلی بەهەشتە.

جەریر ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: بیستم لە مەنصوری کوڕی موعتەمیر و موغیرە و ئەعمەش و (لیث) و عەمارە کوڕی قەعقاع و ئیبنو شوبرومەو عەلائی کوڕی موسەییەب و یەزیدی کوڕی ئەبو زیاد و سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك و، ئەوانەشی کە پێیان گەیشتووم هەر هەموویان: (يَسْتَثْنُونَ في الإِيمانِ، ويَعيبُونَ عَلَى مَنْ لا يَسْتَثْنِي)[٣]. واتە: (الاستثناء)ئەگەریان لە باوەڕهێناندا دەکرد، کەموکورتیان دەدایە پاڵ ئەوەی (الاستثناء)ئەگەری نەکردایە.

هەروەها سەبارەت بە باوەڕهێنان لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پرسیار کرا؟ ئەویش وتی: (قَوْلٌ وَعَمَل وَنِية). واتە: وتەو کردەوەو نیەتە. پێی وترا: ئەگەر پیاوێ وتی: تۆ باوەڕداری؟ وتی: ئەمە شتێکی داهێنراوە(بدعە)یە. ئەی

---

(١) – رواه مسلم.

(٢) – أخرجها الإمام اللالكائي في: « شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٣) – أخرجها الإمام اللالكائي في: « شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

ئەگەر پێی وترا: ئەی چۆن وەڵامی بداتەوە؟ وتی: بڵێ: باوەڕدارم (إن شاء الله)ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بێت.

## بنچیەی سێیەم

## هەڵوێستی ئەهلی سوننەو جەماعە دەربارەی بابەتی بە کافر دانان

لە بنچینەکانی عەقیدەی سەلەفی صالح، ئەهلی سوننە و جەماعە؛

بەڕاستی ئەوان هیچ کەسێك بە دیاریکراوی لە موسوڵمانان بە بێ باوەڕ دانانێن ئەگەر هەستابێ بە ئەنجامدانی کارێکی بێ باوەڕکەر مەگەر لەدوای رونکردنەوەی بەڵگەی شەرعی بۆی (إِقَامَة الحُجة)؛ جا بە بەجهێناجێی مەرجەکانی کافرکردن و، نەهێشتنی رێگریەکان و، نەهێشتن و رەواندنەوەی گومانی کەسانی نەزان و ئەوانەی کە لێکدانەوەی هەڵە بۆ دەقە شەرعیەکان دەکەن. وەك زانراویشە ئەمە لەو کارانەدا دەبێت کە پەنهان و شاراوەن و پێویستیان بە دەرخستن و رونکردنەوە هەیە، بە پێچەوانەی شتە ئاشکراکان کە پێویستیان بە رونکردنەوە نیە کوفری ئاشکراو سەریحە وەك؛ نکوڵی کردن لە بوونی زاتی خوای گەورە، بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و، نکوڵی کردنی پەیامەکەی و، نکوڵی کردن لەوەی کە کۆتاهەمینی پێغەمبەرانە، جگە لەوانە لەکارە پێویستیە زانراوەکانی تر لە دیندا.

ئەهلی سوننە و جەماعە: باوەڕیان وایە کەسێ زۆری لێکرا بێ بە ئەنجامدانی کارێکی بێ باوەڕی بە کافری نازانن ئەگەر دڵی ئەو کەسە پڕ بێ لە ئیمان و لەسەر باوەڕەکەی دڵنیابێت، بەڵکو هیچ کەسێ لە موسوڵمانان بە بێ باوەڕ نازانن بە ئەنجامدانی هەموو تاوانێك، با لەتاوانە گەورەکانیش بێ بەمەرجێ تاوانی گەورەی هاوبەش بۆ خوا دانان نەبێت؛ ئەهلی سوننە و جەماعە حوکم و بڕیاری بێ باوەڕی نادەن بەسەر ئەنجامدەری تاوانەکەدا، بەڵکو حوکم و بڕیاری لەسنور دەرچون و لاوازی و کەموکورتی ئیمانی دەدەن بەسەردا بەمەرجێ تاوانەکە بە حەڵاڵ نەزانێت، جا ئەگەر بەندەیە لەسەر تاوان بمرێت – بەمەرجێ تاوانەکە هاوبەش بۆ خوا دانان

نەبێت – و بە حەلاڵی نەزانی بێت، ئەوە کاری ئەو حەواڵە بە خوای بەرز و بڵندە، ئەگەر ویستی لێ بێ سزای دەدات، ئەگەر ویستی لێ بێ لێی خۆش دەبێت؛ ئەمەش پێچەوانەی بیروڕای ئەو دەستەو تاقم و کۆمەڵە گومڕایانەیە کە حوکم و بڕیاری بێ باوەڕی دەدەن بەسەر ئەو کەسەدا تاوانی گەورەیان ئەنجام داوە، یان لەپێگەیەکدایە لەنێوان دوو شوێندا نەباوەڕدارەو نە بێ باوەڕ.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾ سورة النساء: ٤٨.

واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگە لەوە خۆش ئەبێت لەهەر گوناهێکی تر بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت، هەرکەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت، ئەوە بێگومان گوناهێکی زۆر گەورەی هەڵبەستووە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ الزمر: ٥٣.

واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کەخۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لەمیهرەبانی و بەزەیی خوا، چونکە بێگومان خوا لەهەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت، بەڕاستی هەر ئەوە لێ بوردەی بەبەزەیی یە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هۆشیاری داوە سەبارەت بە کەسێ هەستێ بە کافرکردنی کەسێکی تر بەبێ بەڵگەی شەرعی، هەروەك لەم فەرمودەدا ئاماژەی پێداوە دەفەرموێت:

(أَيُّمَا امْرِئٍ قَالَ لأَخِيهِ: يَا كَافِرُ! فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا، إِنْ كَانَ كَمَا قَالَ، وَإِلاَّ رَجَعَتْ عَلَيْهِ)[1].

واتە: هەرکەسێ بە برایەکی موسوڵمانی بڵێ: ئەی بێ باوەڕ! ئەو حوکمە

(١) – رواه مسلم .

دەگەڕێتەوە بۆ سەر یەکێکیان، ئەگەر وابو کە وتی ئەوا وایە،، ئەگەر بێ باوەر نەبوو ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (مَنْ دَعَا رَجُلاً بِالْكُفْرِ، أَوْ قَالَ: عَدُوَّ اللَّهِ! وَلَيْسَ كَذَلِكَ إِلاَّ حَارَ عَلَيْهِ)[1]. واتە: کەسێ بانگی موسوڵمانێ بکات و پێی بڵێ: بێ باوەڕ، یان پێی بڵێ: دوژمنی خوا! ئەگەر وانەبێت، ئەوا خۆی بەر حوکمەکەی خۆی دەکەوێت و خۆی پێ بێ باوەڕ دەبێ.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (لَا يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلًا بِالْفُسُوقِ، وَلَا يَرْمِيهِ بِالْكُفْرِ؛ إِلَّا ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذَلِكَ)[2]. واتە: با هیچ کەسێ کەسێکی تر تاوانبار نەکات بە لەسنوردەرچون و خراپەکار، تاوانباری نەکات بە بێ باوەڕ، ئیللا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسە خۆی، ئەگەر کەسەکە وەها نەبوو.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (وَمَنْ رَمَى مُؤْمِنًا بِكُفْرٍ؛ فَهُوَ كَقَتْلِهِ)[3]. واتە: هەرکەسێ باوەڕدارێ تاوانبار بکات بەوەی کە بێ باوەڕە، ئەوە وەك ئەوە وایە بیکوژێت.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِأَخِيهِ: يَا كَافِرُ فَقَدْ بَاءَ بِهِ أَحَدُهُمَا)[4]. واتە: ئەگەر کەسێ بە برایەکی موسوڵمانی بڵێ: ئەی بێ باوەڕ! ئەوە ئەو حوکمە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێکیان.

**ئەهلی سوننەو جەماعە:**

جیاوازی دەکەن لە نێوان حوکم و بڕیاردانی رەها بەسەر خاوەن بیدعەیەکاندا بە تاوانبار، یان بە بێ باوەڕ، لەنێوان حوکم و بڕیاردان بەسەر کەسێکی دیاریکراودا

(١) – رواه مسلم .

(٢) – رواه البخاري .

(٣) – رواه البخاري.

(٤) – رواه البخاري .

– کە بە دڵنیاییەوە موسوڵمانەو باوەڕەکەی جێگیرە – بەڵام بیدعەیە لە بیدعەکانی لێ دەرچوە واتە هەستاوە بە ئەنجامدانی بیدعەیە؛ بەوەی یاخی و تاوانیارە، یان لەسنوردەرچووە،، یا بێ باوەڕە؛ هیچ کاتێ حوکم و بڕیاری بەسەردا نادەن هەتا هەقی بۆ رون ئەکرێتەوە، ئەمەش بە رونکردنەوەی بەڵگەی شەرعیە بۆی (إقَامَة الحُجة)، بە نەهێشتنی گومان و دودڵی یە– ئەمەش بۆ شتە پەنهان و نادیارەکان دەبێت نەك بۆ کاروبارە ئاشکراکان – هیچ کاتێ کەسێ بە دیاریکراوی بە بێ باوەڕ نازانن؛ ئیللا لەکاتێکدا نەبێ کە ئەو کەسە هەموو مەرجەکانی کافربونی تێدا هاتبێتەجێ، هەموو رێگری و بەربەستەکانی کافربونی تێدا لابرابێت.

لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: (كَانَ رَجُلاَنِ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ مُتَوَاخِيَيْنِ، فَكَانَ أَحَدُهُمَا يُذْنِبُ، وَالآخَرُ مُجْتَهِدٌ فِي الْعِبَادَةِ، فَكَانَ لاَ يَزَالُ الْمُجْتَهِدُ يَرَى الآخَرَ عَلَى الذَّنْبِ، فَيَقُولُ أَقْصِرْ. فَوَجَدَهُ يَوْمًا عَلَى ذَنْبٍ، فَقَالَ لَهُ: أَقْصِرْ. فَقَالَ: خَلِّنِي وَرَبِّي أَبُعِثْتَ عَلَيَّ رَقِيبًا، فَقَالَ: وَاللَّهِ لاَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكَ أَوْ لاَ يُدْخِلُكَ اللَّهُ الْجَنَّةَ! فَقُبِضَ أَرْوَاحُهُمَا، فَاجْتَمَعَا عِنْدَ رَبِّ الْعَالَمِينَ، فَقَالَ لِهَذَا الْمُجْتَهِدِ: أَكُنْتَ بِي عَالِمًا، أَوْ كُنْتَ عَلَى مَا فِي يَدِي قَادِرًا؟ وَقَالَ لِلْمُذْنِبِ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ بِرَحْمَتِي، وَقَالَ لِلآخَرِ: اذْهَبُوا بِهِ إِلَى النَّارِ). قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ:؛ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَوْبَقَتْ دُنْيَاهُ وَآخِرَتَهُ)[١].

واتە: دوو پیاو لە نەوەی ئیسرائیل دۆست و هاوڕێی یەك بوون، یەکێکیان هەر خەریکی ئەنجامدانی گوناهو تاوان بوو، ئەوی تریان بەردەوام هەوڵی ئەداو خەریکی خواپەرستی و عیبادەت بوو، ئەو کەسەی کە هەوڵی ئەداو خەریکی پەرستش بوو بەردەوام کاتێ هاوڕێکەی لەسەر تاوان کردن دەبینی پێی دەوت: دەست هەڵگرە، رۆژێکیان بینی تاوانی دەکرد، پێی وت: دەست هەڵگرە، ئەویش وتی: وازم لێ

(١) – صحيح سنن أبي داود: للألباني.

بێنەو برۆ بەرۆکم بەربدە خۆم و پەروەردگاری خۆم، ئەرێ تۆ کراوی بە چاودێر بەسەر منەوە؟ وتی: ئەویش تورە بوو وتی: سوێند بە (اللە) خوای گەورە هەرگیز لە تۆ خۆش نابێ - یان وتی: خوای گەورە هەرگیز ناتخاتە بەهەشتەوە! - رۆحی هەردووکیان کێشرا، هەردووکیان لەلای خوای پەروەردگاری جیهانیاندا کۆبوونەوە، خوای گەورە بە کابرای خواپەرستی فەرموو: ئەرێ تۆ زاناو شارەزا بووی بەوەی کە نایخەمە بەهەشتەوە، یان پێی فەرموو: تۆ تواناو دەسەلاتت هەبوو بەسەر ئەوەی کە لەدەستی مندایە کە لێخۆش بونە؟ لەپاشدا خوای گەورە بە کابرا تاوانبارەکەی فەرموو: بچۆرە بەهەشتەوە بە بەبەزەیی و رەحمەتی خۆم، بە کابرای خواپەرستی فەرموو: بیبەن بیخەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە. ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ وتی: سوێند بەو (اللە)یەی کە رۆحی منی بەدەستە! قسەیەکی کرد بەو قسەیە هەر هەموو دنیاو دوارۆژی دۆڕاند.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

خۆپارێزترین کەسن لە باسی بە کافر دانانی خەڵکدا؛ لەبەرئەوەی بێ باوەڕکردنی موسوڵمان بابەتێکی زۆر مەترسیدارە، کۆمەڵێ شوێنەواری گەورەی بەدوادا دێت؛ بەجێ دەهێڵێ، جا بۆیە پێویستە هیچ کاتێ نەچینە ناو ئەو باسەوە بەبێ بەڵگەیەکی رون و ئاشکرا خۆمانی لێ بەدوور بگرین، لەبەرئەوەی بنەڕەت و ئەسڵ لە مرۆڤی موسوڵماندا روکەشیەتی لەگەڵ مانەوەی لەسەر موسوڵمانەتی و دادپەروەری؛ هەر حسابی موسوڵمانی بۆ دەکرێت هەتا دێتەجێ نەمانی ئەوە واتە موسوڵمانەتی و دادپەروەری بە بەڵگەی شەرعی، لێرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە پێویستە لەسەر موسوڵمان زۆر خۆیان بەدوور بگرن لە بە کافردانانی خەڵك هەتا بوار هەبێ؛ باسی بە کافردانانی خەڵك باسێکی گەورە و مەترسیدارە، ئەوەی واجب و پێویستیەکانی نەزانێ هەڵەخلیسکێ و گومڕا دەبێت، جا بۆیە کەڵە زاناو

پێشەواکان تێیدا وەستاون خۆیان بەدور گرتووە لەوەی خۆیان توشی تاوانی بە کافردانانی خەڵك بکەن، کوێرانە حوکمی بێ باوەڕییان نەداوە بەسەر خەڵکدا، بەڵام ئەوانەی کە سەرەتای خوێندنی زانستی شەرعیانە یان سەرەتای موسوڵمانیەتیانە دەستپێشخەریان تێدا کردووەو تیاچوون.

ئەهلی سوننەو جەماعە لە بابەتەکانی بە کافردانان و باوەڕهێناندا حوکم دەدەن بەسەر خەڵکدا لەسەر روکەش(ظاهر)یان؛ ئەگەر ئاکار و رەوشتی موسوڵمانەتیان لێ دەرکەوت ئەوا حوکمی موسوڵمانەتی دەدەن بەسەریاندا لەسەر روکەش(ظاهر) و ناوەڕۆك(باطن)یان، ئەگەر بێ باوەڕییان لێ دەرکەوت ئەوا حوکمی بێ باوەڕی دەدەن بەسەریاندا لەسەر روکەش(ظاهر) و ناوەڕۆك(باطن)یان بەبێ ئەوەی شوێن ناخ و ناوەڕۆك(باطن)یان بکەون.

لەگەڵ ئەم خۆپاراستن(ورع)ە گەورەیان لە باسی بە کافرداندا؛ ئەوانە ڕاڕا نین و دودڵ نین لەسەر بە کافردانانی ئەو کەسانەی کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) بە کافریان داناون، لەبەرئەوەی دەقە شەرعیەکان بەڵگەن لەسەر دروستی بە کافردانانی کەسێ کە هەستاوە بە ئەنجامدانی کارێ یان وتەیە کە بێ باوەڕی بێ، بەڵکو بە کافردانانی کافریان داناوە بە بنچینەیە لە بنچینەکانی بیروباوەڕیان، هەروەها حوکم بڕیاریان داوە بەسەر کەسێکدا کە بێ باوەڕ(کافر) بە بێ باوەڕ نازانن، یان گومانی هەبێ لە بێ باوەڕی کەسێکی کافردا[1].

---

(١) – (من ثبت إسلامه بيقين فلا يزول بشك) على ضوء هذه القاعدة السلفية سار سلفنا الصالح، فكانوا أبعد الناس من التكفير، ولذلك: (لما سئل علي بن أبي طالب رضي الله عنه ، عن أهل النهروان أكفار هم؟ قال: من الكفر فروا، فسئل: أمنافقون هم؟ قال: المنافقون لا يذكرون الله إلا قليلا، وأولئك يذكرون الله صباح مساء، وإنما هم إخواننا بغوا علينا). أخرجه البيهقي في ((السنن الكبرى) ج ٨ ص ١٧٣) . ومن الضروري أن نفرق بين النوع والعين في التكفير ذلك أنه ليس كل ما هو كفر يكفر به شخص بعينه؛ فينبغي التفرقة بين الحكم على القول بأنه كفر والحكم

بێ باوەڕان لەشەرعدا دوو جۆرن:

* ئەوانەی کە هەر لەبنەڕەتدا بێ باوەڕن؛ واتە ئەوانەی هەر لەبنەڕەتەوە نەهاتونەتە ناو دینی ئیسلامەوە، کە ئەمانەن: دەهریەکان ڕۆژگارپەرستان، فەیلەسوفەکان، هاوبەش بۆ خوا دانەران، ئاگر پەرستەکان، بت پەرستەکان، خەڵکانی خاوەن کتێب و نامە ئاسمانیەکان لە جولەکەو گاورەکان؛ بێگومان سەرجەم ئەمانە بەڵگە هەیە لەسەر بێ باوەڕییان لە قورئان و سوننەو یەکدەنگی زانایاندا، مردووەکانیان بە هەمیشەیی لەئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە، چونە بەهەشتیان لەسەر حەرامە، کاروباریان لە پێویستیە زانراوەکانە لە دیندا واتە پێویستی شەرعیە کە ئەمانە بناسرێن، خوای بەرز و بڵند دەفەرموێت:

﴿ قَٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَٰغِرُونَ ۝٢٩ ﴾ سورة التوبة: ٢٩.

واتە: جەنگ بکەن لەگەڵ ئەوانەی کەبڕوا ناهێنن بەخوا و بەڕۆژی دوایی، بەحەرامی دانانێن ئەوەی کە خوا و پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە، مل کەچ ناکەن بۆ ئایینی ڕاست، ئەوانە کتێبیان پێ بەخشراوە هەتا باج و سەرانە دەدەن بەدەستی خۆیان بە ملکەچی لەکاتێکدا ئەوان سەرشوڕو ڕیسوان.

---

على صاحبه المعين بأنه كافر. قال شيخ الإسلام ابن تيمية رحمه الله: (فالمتاول الجاهل والمعذور ليس حكمه حكم المعاند والفاجر؛ بل قد جعل الله لكل شيء قدرا). مجموعة الرسائل والمسائل: ٣٨٢/٥. وقال رحمه الله : (وإذا عرف هذا فتكفير المعين من هؤلاء الجهال وأمثالهم بحيث يحكم عليه بانه مع الكفار لا يجوز الإقدام عليه إلا بعد أن تقوم على أحدهم الحجة بالرسالة التي يبين بها لهم أنهم مخالفون للرسول، وإن كانت مقالتهم هذه لا ريب أنها كفر، وهكذا الكلام في جميع تكفير المعينين). مجموعة الرسائل والمسائل: ٣٤٨/٣.

* هەڵگەڕاوەکان ئەوانەی کە پاشگەزبونەتەوە لەدین؛ ئەوانەی کە خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام بەڵام بیروباوەڕ، یان کردەوە، یان وتەیەکی وایان لێ دەردەچێت کە موسوڵمانەتیەکەیان هەڵدەوەشێنێتەوە؛ بەوەش بێ باوەڕ دەبن، ئەگەرچی هەڵسن بە ئەنجامدانی هەندێ لە دروشمەکانی ئیسلام، وەك (بَاطِنِيَّة)کان – دەڵێن تەنها ناخ گرنگە – (رَافِضَة)کان، قادیانیەکان و، وێنەی ئەوانە.

بێ باوەڕی هەڵوەشێنەرەوەی باوەڕە؛ ئەوەندە هەیە کە لە زمانی شەرعدا بێ باوەڕی دوو جۆرە:

هەندێ جار لەدەقەکانی قورئاندا مەبەست پێی بێ باوەڕبونێکە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەردەکات، هەندێ جاریش مەبەست پێی بێ باوەڕبونێکە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرناکات، ئەمەش لەبەرئەوەیە وەك چۆن باوەڕ چەندین بەش و لقی هەیە، هەر بەو شێوەیەش بێ باوەڕی چەندین بەش و لقی هەیە، هەروەها وەك چۆن زانراوە باوەڕ وتەو کردەوەیە، هەر بەو شێوەیەش بێ باوەڕی وتەو کردەوەیە، سەرجەم گوناهو تاوانەکان لە بەش و لقەکانی بێ باوەڕین، هەروەك چۆن سەرجەم تاعەت و گوێڕایەڵیەکان لە بەش و لقەکانی باوەڕن.

لە بنچینەکانی ئەهلی سوننەو جەماعە؛ ئەوەیە کە دەگونجێ کۆببێتەوە لە بەندەیەکدا باوەڕهێنان و هەندێ لە بەش و لقەکانی بێ باوەڕی یان دووڕوویی ئەمەش حەقیقەت و ئەسڵ و بنەڕەتی باوەڕهێنانەکەی لانادات.

بێ باوەڕی خاوەنی چەندین بنچینەو بەشی جیا جیایە؛ لەو بنچینەو بەشانە تیایاندایە پێویستی دەکات بکەرەکەی لە دینی ئیسلام دەربکات، هەشیانە بەپێچەوانەوە بکەرەکەی لە دینی ئیسلام دەرناکات.

بێ باوەڕی رودەدات واتە کەسێ دەکەوێتە ناو بێ باوەڕییەوە: بە بیروباوەڕێ کە لە دڵەکەیدا هەیە، بە ئەنجامدانی کردەوەیە بە ئەندامەکانی جەستەی، بە وتەیە کە بە زمانی دەریدەبڕێت، بە دودڵی و بە وازهێنان.

★ لەلای ئەهلی سوننەو جەماعە – بێ باوەڕی دوو جۆرە:

یەکەم: (کفر اکبر) بێ باوەڕی گەورە کە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەردەکات:

بریتیە لەوەی کە باوەڕهێنان هەڵدەوەشێنێتەوەو ئیسلامەتی پوچەڵ دەکاتەوە، مانەوەی هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا پێویست دەکات، ئەمەش دەبێت بە بونی بیروباوەڕێکی خراپ، وتەیە، کردەوەیە، دوڵی یە، وازهێنانێ، پشت هەڵکردنێ، خۆبەزلزانین و خۆبەگەورە زانینێ.

بێ باوەری گەورە چەند جۆرێکە، لەوانە:

١- (کفر الإنکار والجحود والتکذیب) بێ باوەڕی ئینکاری کردن و نکولی کردن و دان پێدا نەنان و بەدرۆخستنەوە:

بریتیە لەوەی کە روکەش(ظاهر) و لەناخ(باطن)دا کوفر بێت، وەك بیروبۆچونی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران، ئەو هەواڵانەی کە پێغەمبەران بە راستی رایانگەیاندووە پێچەوانەی واقیعە، یان بانگەشەکردن بۆ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێچەوانەی حەقی هێناوە، یان کەسێ پروپاگەندەی ئەوە بکات کە خوای گەورە شتێکی حەرام کردووە یان حەڵاڵی کردووە لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیزانێ ئەوەی کە ئەو وتویەتی پێچەوانەی فەرمانی خوای گەورە و نەهی لێ کردنیەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴾ العنکبوت: ٦٨.

واتە: کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستێ، یا باوەڕ نەهێنێ بەئایینی راست کاتێ بۆی هات، ئایا جێگای مانەوە بۆ بێ بڕوایان لە دۆزەخدا نیە.

٢- (کفر الإباء والاستکبار مع التصدیق) بێ باوەڕی گوێ پێ نەدان و خۆبەزلزانین لەگەڵ بەراست زانیی دا:

بریتیە لە ملکەچی نەکردن بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە ئاشکرا(ظاهر)، لەگەڵ ئەوەدا کە لە ناخ(باطن)دا دەزانێ کە حەقە، لەبەرئەوە ددان دەنێ بەوەدا کە ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەپەروەردگاریەوە هێناویەتی حەقە؛ بەڵام شوێنکەوتنی رەفز دەکات و رەتی دەکاتەوە لەبەر خراپی خۆی و خۆ بە بەزلزانینی و لەخۆبایی بوونی هەروەها دینی خوای پەروەردگار و ئەو کەسانەشی کە شوێنی کەوتون بە سوکیان دەزانێ: وەك بێ باوەڕێتی شەیتانی نەفرەتی؛ کە هیچ کاتێ نکوڵی نەکردووە لە فەرمانی خوای گەورە ئینکاریشی نەکردووە، بەڵام بە گوێ پێ نەدان و خۆ بە بەزلزانین روبەڕوی فەرمانەکەی خوای گەورە بویەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ﴾ الشعراء: ١١١.

واتە: وتیان ئایا (چۆن) باوەڕ بەتۆ بێنین، لەکاتێکدا ئەوانەی شوێنت کەوتون پەسترین کەسن (هەژارو داماو نەفامن).

٢ - (كفر الإعراض) بێ باوەڕی پشت هەڵکردن:

بریتیە لەوەی کە پشت هەڵکات بە گوێ و بەدڵی لەوەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەپەروەردگاریەوە هێناویەتی، بەراستی نازانێ، بەدرۆشی نازانێ، دۆستایەتی ناکات، دوژمنایەتیشی ناکات، هەرگیز گوێی بۆ ناگرێ، واز لەحەق ئەهێنێ و هەوڵی فێربونی نادات و، کردەوەشی پێ نەکات، هەڵدێ لەو شوێنانەش کە باسی حەقی تێدا دەکرێت ئەوە ئەو کەسە کافر و بێ باوەڕە واتە بێ باوەڕی پشت هەڵکردن.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ ﴾ الأحقاف: ٣.

واتە: ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لەوەی کە پێ ی ترسێنرابوون روو وەردەگێڕن.

٤- (كفر الشك) بێ باوەڕی دوودڵی؛

بەوەی كە دان نەنێ بەراستێتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) و بەدرۆشی نازانێ، بەڵكو دوودڵ و ڕاڕایە لەشوێنكەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لەكاتێكدا كە لێی داواكراوەو پێویستە دڵنیابێت بەتەواوی لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەپەروەردگاریەوە هێناویەتی حەقەو هیچ دوودڵی شك و گومانێكی تێدا نیە، جا هەركەسێ كە دوودڵ و ڕاڕابێ لەسەر شوێنكەوتنی ئەوەی كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی لەلایەن پەروەردگاریەوە، یان بە دروستی بزانێ كە ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی پێچەوانەی حەقە؛ ئەوە بێ باوەڕە واتە بێ باوەڕی دوودڵی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَقَالُوٓا۟ إِنَّا كَفَرْنَا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴾ ابراهيم: ٩.

واتە: ئایا بۆتان نەهاتووە هەواڵی ئەو گەلانەی كە لەپێش ئێوەدا بون، گەلی نوح و عاد و سەمود هەروەها ئەوانەی كە لەپاش ئەوان بون و هاتن بێجگە لەخوا هیچ كەس نایانزانێ پێغەمبەرەكانیان بۆهات بە موعجیزە و بەڵگەی ئاشكراوە، ئینجا ئەوان دەست و پەنجەی خۆیان گەست لە ڕق و قین داو، وتیان بەڕاستی ئێمە بێ بڕواین، بەو(پەیامە)ی كە بەئێوەدا نێردراوە، بەڕاستی ئێمە لەگوماندایین لەوەی ئێوە باناگمان دەكەن بۆلای و دودڵین.

٥- (كفر النفاق) بێ باوەڕی دووڕویی؛

بریتیە لە دەرخستنی ئیسلام و خێر و چاكە، شاردنەوەی بێ باوەڕی و خراپە، بریتیە لە پێچەوانەی ناخ بۆ ڕوكەش، دەرخستنی وتە بە زمان یان بە كردەوە بە پێچەوانەی ئەوەی لەدڵدایە لە بیروباوەڕەكان.

مرۆڤی دووڕو کێ یە؟ وتەی پێچەوانەی کردەوەیەتی، نهێنی پێچەوانەی ئاشکرایەتی، لە دەرگایەکەوە دەچێتە ناو ئیسلامەوەو، لە دەرگایەکی ترەوە دەچێتەدەرەوە، دچێتە ناو باوەڕەوە بە روکەش، بەڵام لەناخدا لێی دەردەچێ، ئا ئەم جۆرەیان بریتیە لە دووڕویی گەورە[1]، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴾ البقرة: ٨.

واتە: لەناو خەڵکدا هەندێ کەس هەیە کە دەڵێ: بڕوامان هێناوە بە خواو بەڕۆژی دوایی لەکاتێکدا ئەوان بڕوادار نین.

٦ – (کفر السَّبّ والإستهزاء) بێ باوەڕی جنێودان و گاڵتەکردن:

بریتیە لە لاقرتێ کردن و، بەکەم زانین و، جنێودان و، گاڵتەکردن و قەشمەری؛ بە شتێ لەدینی ئیسلام، لەوەی کە زانراوە لە دیندا – واتە هەموو کەس دەزانێ لە دینن وەك گاڵتەکردن بە سیواك و ریش و حیجاب و .. – ، ئیتر یەکسانە ئەو کەسە شۆخی و گاڵتە بکات، یان لەبەر بە بێ باوەڕن گاڵتە بکات، یان لەکاتی دەمەقاڵێ و ناکۆکی دا بێت؟ یا لەکاتی تورەبوندا بێت، وێنەی ئەوانە؛ بێگومان زانایانی ئوممەت تەباو یەکدەنگن لەسەر بێ باوەڕی ئەو کەسەی کە بکەری ئەو کارانەیە، خوای گەورە دەفەرموێت:

---

(١) – والنفاق نوعان: نفاق اعتقاد، ونفاق عمل:

أولاً: نفاق الاعتقاد، أو النفاق الأكبر: وهو ما أبطن الكفر في القلب، وأظهر الإيمان على لسانه وجوارحه، وصاحبه من أهل الدرك الأسفل من النار؛ مثل من كذب بما جاء به الله، أوبعض ما جاء به الله، وكذب الرسول، أو بعض ما جاء به الرسول، أو كراهية الانتصار لدين الرسول .. وغيرها من الأعمال الكفرية.

ثانياً: نفاق العمل، أو النفاق الأصغر: وهو النفاق العملي أي: ما ظهر فيه العمل على وجه مخالف لما يكون عليه الشرع، وصاحبه لا يخرج من الملة؛ مثل: إذا حدث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا ائتمن خان، وإذا خاصم فجر، وإذا عاهد غدر؛ كما جاء في الحديث.

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴾ سورة التوبة: ٦٥ – ٦٦.

واتە: سوێندبێ ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت بەڕاستی دەڵێن دڵنیابن ئێمە هەر دەمەتەقێ و گاڵتە دەکەین، تۆش بڵێ: ئایا بەخواو بەڵگەکانی و پێغەمبەرەکەی ئێوە گاڵتەو لاقرتێتان دەکرد؟. بەهانە مەهێننەوە بەڕاستی ئێوە بێ بڕوا بوونەوە پاش بڕوا هێنانتان ئەگەر ببورینو چاوپۆشی بکەین لەکۆمەڵ و تاقمێکتان (بەهۆی گەڕانەوەتانەوە)، سزای کۆمەڵ و تاقمێکی تر دەدەین، لەبەرئەوەی بێگومان ئەوانە تاوانبار بوون.

٧ – (کفر البُغض) بێ باوەڕی رق لێ بوونەوە:

بریتیە لە رق لێ بوونەوە لەدینی ئیسلام، یان شتێ لە ئەحکامەکانی، یا شتێ لە شەرعی خوای بەرز و بڵند، یان رق لێ بوونەوە لە پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم)، یا لەو شەرعەی کە هێناویەتی، یان شتێ لەوە، ئاوتەخواز بێت بەوەی کە نەبوایە، یان رق لێ بوونەوە لە شتێ کە خاوەن زانست و زانیارییەکان تەباو یەکدەنگ بن لەسەری کە ئەو شتە لەدینە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ﴾ سورة محمد: ٩.

واتە: ئەو تۆڵەیان لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە رقیان لەو قورئانە بوو کە خوا ناردوویەتی، بۆیە خواش کردەوەکانیانی پووچ کردنەوە.

ئەم جۆرە بێ باوەڕیانەو جگە لەوانەش مانەوەی هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا پێویست دەکات، لەگەڵ پوچەڵکردنەوەی سەرجەم کردەوەکان، ئەگەر خاوەنەکەیان لەسەری بمرێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴾ سورة البينة: ٦.

واتە: بێگومان ئەوانەی کە بێ بڕوابون لەخاوەن پەیام و بت پەرستەکان، لەئاگری دۆزەخان تێیدا دەمێننەوە بە ئێگجاری، ئا ئەوانە خراپترینی هەموو دروستکراوێکن.

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾ الزمر: ٦٥.

واتە: سوێند بەخوا نیگا کراوە بۆ تۆ و بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش، ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی بەڕاستی کردەوەت هەڵدەوەشێتەوە، بێگومان لەزەرەرمەندان دەبیت.

**دووەم: (کفر اصغر) بێ باوەڕی بچوك خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرناکات:**

ئەم جۆرە بێ باوەڕیە بنەڕەتی باوەڕهێنانی پێ هەڵناوەشێتەوە؛ بەڵکو کەمی دەکات و لاوازی دەکات، خاوەنەکەی لە سیفەتی باوەڕ روت ناکاتەوە، خاوەنەکەی توشی هەڕەشەی توند دەبێتەوە ئەگەر تەوبەی لێ نەکات و پەشیمان نەبێتەوە، شەرع دانەر بۆ هەندێ لە سەرپێچی و تاوانەکان وشەی بێ باوەڕی بەکارهێناوە وەك نموونەیە بۆ هەڕەشەکردن و سەرزەنشت کردن؛ لەبەرئەوە ئەم جۆرە شتانە لە تایبەتمەندیەکانی بێ باوەڕین، بەڵام ئەوەندە هەیە ناگەنە ئاستی بێ باوەڕی گەورە، هەرچی لەو جۆرەیە ئەوە لە تاوانە گەورەکانە، ئەمانەش هەڕەشەیەکی توند پێویست دەکەن بۆ خاوەنەکەیان بەڵام خاوەنەکەی بە هەتا هەتایی لەناو ئاگری دۆزەخدا نامێنێتەوە، خاوەنی ئەم جۆرە لە بێ باوەڕیی لەوانەیە تکا(شفاعة)ی تکاکاران بیگرێتەوە.

نموونە لەسەر ئەمە:

کوفر و بێ باوەڕیی ناز و نیعمەت، کوفری وەڵام دانەوەی چاکە بە خراپە چاکەی مێرد لەلایەن ژنەوە، شەڕکردن لەگەڵ موسوڵمان، سوێند خواردن بە غەیری خوا، تانەدان لە نەسەب و رەچەڵەکی خەڵکان، شیوەن کردن لەسەر مردو، باوەڕداریێ بە برا باوەڕدارەکەی بڵێ: ئەی بێ باوەڕ! جگە لەمانە لە جۆرەکانی بێ باوەڕی بچوك، خوای بەرز و بڵند دەفەرموێت:

﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ﴾ سورة الحجرات: ٩.

واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لەئیمانداران دژ بەیەکتر جەنگیان کرد، ئەوە لەنێوانیاندا ئاشتەوایی بکەن.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ)[1]. واتە: جنێودان بە موسوڵمان لەسنوردەرچون و تاوانە، جەنگ لەگەڵ کردنیشی بێ باوەڕیی یە.

دەفەرموێت: (لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ)[2].

واتە: لەدوای من مەگەڕێنەوە بۆ سەر بێ باوەڕێتی و هەندێکتان لە گەردنی هەندێکتان بدەن.

دەفەرموێت: (مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ أَشْرَكَ، أَوْ كَفَرَ)[3]. واتە: ئەوەی سوێند بە غەیری خوا بخوات، ئەوە هاوەڵی بۆ خوا بڕیار داوە، یان کوفری ئەنجام داوە.

---

(١) – متفق عليه.

(٢) – متفق عليه.

(٣) – صحيح سنن أبي داود: للألباني.

دەفەرموێت: (اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ؛ الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ، وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ)[١].

واتە: دوو شت هەن لەناو خەڵكدا لە بێ باوەڕین: تانەدان لە نەسەب و ڕەچەڵەك و، شیوەن کردن لەسەر مردو.

(١) - رواه مسلم.

## بنچینەی چوارەم

### باوەڕهێنان بە دەقەکانی قورئان و سوننە کە پەیمان و بەڵێندان و هەڕەشەو ترس و تۆقاندن.

**لە بنچینەکانی عەقیدەی سەلەفی صالح ئەهلی سوننە و جەماعە:**

بریتیە لە باوەڕهێنان بە دەقەکانی پەیمان و بەڵێندان و هەڕەشەو ترس و تۆقاندن؛ باوەڕیان پێی هەیە بە باوەڕبونێکی جێگیر و تەواو، تێی دەپەڕێنن وەك چۆن هاتووە لەلایەن خوای بەرز و بڵندەوە، بەرەنگاری نابنەوە بەوەی واتاکەی بگۆڕن و باوەڕی پێ نەکەن، باوەڕ بە دەقەکانی دەکەن، لەبەر فەرمودەکەی خوای گەورە:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾ سورة النساء: ٤٨.

واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگە لەوە خۆش ئەبێت لەهەر گوناهێکی تر بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت، هەرکەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت، ئەوە بێگومان گوناهێکی زۆر گەورەی هەڵبەستووە.

ئەهلی سوننە و جەماعە باوەڕیان وایە پاشەڕۆژ و سەرەنجامی بەندەکان پەنهان و شاراوەیە خوای گەورە خۆی نەبێت کەس نایزانێت، جگە لە خوا کەس نازانێ پاشەڕۆژ و سەرەنجامیان چۆنە بەرەو بەهەشت وەڕێ دەکەون یان بەرەو ئاگری دۆزەخ، مرۆڤی باوەڕدار دڵنیا نابێت لە مەکری خوای گەورە کە بۆ ئەو شوێنەی ببات بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکات و بەخەیاڵیدا بێت، یان سزای بدات بەهۆی تاوانەکانیەوە، بەڵام مرۆڤی باوەڕدار هەرگیز لە رەحمەت و بەزەیی خوای بەرز و بڵند نائومێد نابێ، مادەم لەسەر باوەڕهێنان و یەکخواناسی و سوننەیە بە وتەو بە کردەوە، خوای بەرز و بڵند دەفەرموێت:

﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ كُلَّمَا رُزِقُوا۟ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا ۙ قَالُوا۟ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَأُتُوا۟ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا ۖ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ سورة البقرة: ٢٥.

واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) مژدە بدە بەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردووە، کە بێگومان بۆ ئەوان هەیە بەهەشتانێ جۆگە ئاوی زۆر بەژێریاندا دەڕوات، هەرکاتێ لەوێ خواردەمەنیەکیان بدرێتێ لە میوەهات دەڵێن: ئەمە ئەوەیە کە لەمەوپێش پێمان درا ئێستا وێنەیان هێناوە، لەو بەهەشتانەدا بۆ ئەوان هەیە ژنانی پاکیزە ، ئەوان لەو بەهەشتانەدا هەتا هەتایین.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ)[١].

واتە: بەڕاستی کەسی وا هەیە کردەوەی خەڵکی بەهەشت دەکات لەپێش چاوی خەڵکدا، لەکاتێکدا ئەو کەسە ئەهلی ئاگری دۆزەخە، کەسی واش هەیە کردەوەی خەڵکی ئاگری دۆزەخ دەکات لەپێش چاوی خەڵکدا، لەکاتێکدا ئەو کەسە ئەهلی بەهەشتە.

هەروەها دەفەرموێت: (إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا)[٢]. واتە: کەسی واتان هەیە کردەوەی خەڵکی بەهەشت دەکات تا لەنێوانی ئەو و بەهەشتدا تەنها باڵێك دەمێنێ، جا نوسراوەکەی پێشی دەکەوێت و کردەوەی خەڵکی ئاگر

---

(١) – رواه البخاري ومسلم.

(٢) – رواه البخاري ومسلم.

دەکات و دەچێتە ئاگرەوە، کەسی وەهاشتان هەیە کردەوەی خەڵکی ئاگر دەکات تا لەنێوانی ئەو و ئاگردا تەنها باڵێك دەمێنێ، جا نوسراوەکەی پێشی دەکەوێت و کردەوەی خەڵکی بەهەشت دەکات و دەچێتە بەهەشتەوە.

ڕێگای دەربازبون و ڕزگاربون و سەرکەوتن بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار - لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە - ناوەندە لەنێوان دڵنیابون و بێ ئومێد بوندا، لە نێوان ترس و نائومێدبوندا.

خوای گەورە لە وەسفی باوەڕدارە ڕاستگۆکاندا دەفەرموێت: ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ ﴾ سورة الأنبياء: ٩٠.

واتە: بێگومان ئەوانە(ی باسکران لە پێغەمبەران) پێش بڕکێیان دەکرد لە (ئەنجامدانی) هەموو خێر و چاکەیەکداو هاواریان لە ئێمە دەکرد بە ئومێدی (بەهەشت) و لە ترسی (دۆزەخ)، ئەوان ملکەچ بوون بۆ ئێمە (دەترسن لێمان).

بەڵام شایەتی دەدەن بۆ کەسێ لەسەر ئیسلام و یەکخواناسی و بەندایەتی کردنی خوا بە تەنیا بمرێت بە ڕوکەشی ئیسلامەتیەکەی بەشێوەیەکی گشتی کە ئەهلی بە هەشتە - (إن شاء الله )ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێ - هەروەك خوای بەرز و بڵند لە قورئانەکەیدا بەڵێنی پێ داون؛ خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا ﴾ سورة النساء: ١٢٢.

واتە: ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە لە داهاتوویەکی نزیکدا دەیانخەینە بەهەشتانێك کە ڕووبارەکان بە ژێر درەختەکانیان دا دەڕۆن، دەمێننەوە تیایدا بە هەمیشەیی، بەڵێنی خوایە و ڕاستە (بەدی دەهێنرێت)، کێ لە خوا ڕاست بێژترە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ﴾ سورة القمر: ٥٤ - ٥٥ . واتە: بێ گومان پارێزکاران وان لە باخات و

ڕووبارەکانی (بەهەشتدا). لە نیشتگەیەکی پەسەندان لای پاشایەکی بەدەسەڵاتی توانا.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ سورة البقرة: ٢١٧. واتە: هەرکەسێك لەئێوە لەدینی خۆی هەڵبگەڕێتەوەو بەبێ بڕوایی بمرێت، ئا ئەوانە هەموو کردەوەیەکیان پوچ دەبێتەوە لە هەردوو جیهاندا، ئەوانە یار و هاودەمی ئاگرن، تێیدا دەمێننەوە بە یەکجاری.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (مَنْ مَاتَ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ؛ دَخَلَ الْجَنَّةَ)[1]. واتە: هەرکەسێ بمرێت چاك بزانێت کە جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی تر نیە بە هەق کە شایستەی پەرستن بێت، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە.

هەروەها دەفەرموێت: (مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا؛ دَخَلَ الْجَنَّةَ)[2]. واتە: هەرکەسێ بمرێت هاوەڵی بۆ خوای گەورە بڕیار نەدابێت؛ ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە.

ئەهلی سوننەو جەماعە شایەتی دەدەن بەوەی کە بێ باوەڕان، هاوبەش بۆ خوا دانەران، دووڕوەکان ئەوانەی کە لە کۆمەڵی ئەوانن لە ئەهلی ئاگری دۆزەخن، هەرکەسێ جگە لەدینی خوا ئاینێکی تر هەڵبژێرێ و بیکاتە ڕێگەو بەرنامەی ژیانی خۆی، ئەوانە بە هەتا هەتایی لەئاگری دۆزەخدا دەمێننەوەو هەرگیز ڕزگاریان نابێت ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتە بمرن، ئەمەش لەبەر گەورەیی کەتن و تاوانەکەیانە بەرامبەر بە حەقی خوای پەروەردگار، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ سورة البقرة: ٣٩.

---

(١) – رواه مسلم.

(٢) – رواه مسلم.

واتە: ئەوانەی کە بێ بڕوابون و نیشانەو ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانی ئەوانە هاوەڵ و هاودەمی ئاگرن، تیایدا دەمێننەوە بە هەتا هەتایی.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴾ سورة البينة: ٦.

واتە: بێگومان ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون لە خاوەن پەیام و بت پەرستەکان، لەئاگری دۆزەخان تێیدا دەمێننەوە بە ئێگجاری، ئا ئەوانە خراپترینی هەموو دروستکراوێکن.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴾ سورة النساء: ١٤٥.

واتە: (بابزانن)بەڕاستی دووڕووەکان لە خانە و تەبەقی هەرە ژێرەوەی ئاگردان، هەرگیز ڕزگار کەرێکت بۆ ئەوان دەست ناکەوێت.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ سورة التوبة: ٢٣.

واتە: ئەی ئەوانەی کەبڕواتان هێناوە باوکو براکانتان دامەنێن (هەڵمەبژێرن) بەدۆستو خۆشەویست، ئەگەر بێ باوەڕییان لەباوەڕ لەلا خۆشەویسترو چاکتربوو، هەر کەس لەئێوە ئەوانە بکات بەدۆستی خۆی، ئەوە هەر ئەوانە ستەمکارن.

هەروەها ئەهلی سوننەو جەماعە شایەتی دەدەن بەوەی کە هەرکەسێ لەسەر هاوبەش بۆ خوا دانان بمرێت ئەوا بێگومان دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە، یان هەرکەسێ بێ باوەڕی گەورە ئاشکرا بکات ئیتر بی ئەو بێ باوەڕیە گەورە

بیروباوەڕیێ یان وتەو گوفتار بێ یان کردەوە؛ ئەوا بە کردەوەکەی خۆی حوکم دەدرێت بەسەریدا کە کافرە، لەژیانی دونیادا مامەڵەی کافری لەگەڵدا دەکرێت، لە دوارۆژیشدا لەو کەسانە دەبێ کە بە هەتا هەتایی لەئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە.

خوای بەرز و بڵند دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾ سورة النساء: ٤٨.

واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگە لەوە خۆش ئەبێت لەهەر گوناهێکی تر بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت، هەرکەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت، ئەوە بێگومان گوناهێکی زۆر گەورەی هەڵبەستووە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا۟ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾ سورة النساء: ١٥٠ - ١٥١.

واتە: بەڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕن بەخواو پێغەمبەرەکانی، دەیانەوێ جیاوازی بخەنە نێوان خوا و پێغەمبەرەکانی، دەڵێن باوەڕ بەهەندێك (لەپێغەمبەران) دەهێنین، باوەر ناهێنن بەهەندێکی تریان و دەیانەوێ لەو نێوانەدا ڕێگەیەك بدەنەبەر، ئائەوانە بەڕاستی بێ باوەڕی تەواون و ئامادەمان کردووە بۆ بێ باوەڕان سزایەکی ڕسواکەر.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ سورة آل عمران: ٨٥.

واتە: هەرکەسێ دوای دینێ بکەوێت جگە لەدینی ئیسلام ئەوە لێی وەرناگیرێت، لە ڕۆژی دوایی دا لە زەرەرمەندانە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (مَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ النَّارَ)[١].

واتە: هەرکەسێ بمرێت و شتێ بکاتە شەریك و هاوبەشی خوای پەروەردگار؛ ئەوە دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

بڕیاری کۆتایی و دڵنیایی بۆ هیچ کەس نادەن لە ئەهلی قیبلە بەوەی کە ئەوکەسە بەهەشتی یە یان دۆزەخی ئیتر ئەو کەسە هەرچیەك بێ و هەر کەسێ بێت و لەهەر پلەو پایەیەکدا بێت، تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێ کە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) ئەو بڕیارەیان بۆ دابێت، بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کە بەڵگەیان بەدەستەوە نیە کار و فەرمانیان حەواڵە بە خوای گەورە دەکەن و دەیگێڕنەوە بۆ خوای پەروەردگار، لەگەڵ ئەوەشدا ئومێدەوارن کە خوای پەروەردگار پاداشتی چاکەکاران بداتەوە بە بەهەشتی بەرین، دەشترسن لەوانەی کە تاوانبار و خراپەکاران توشی سزا ببن[٢].

لەبەرئەوەیە ئەهلی سوننەو جەماعە شایەتی دەدەن بۆ ئەو کەسانەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شایەتی بۆ داون بەوەی کە بەهەشتین یان دۆزەخین، شایەتی دەدەن بۆ ئەو دە کەسەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مژدەی بەهەشتی پێدان و شایەتی بۆ دان کە لە ئەهلی بەهەشتن.

---

(١) - رواه مسلم.

(٢) - ولهذا لا يحكم على احد قتل أو مات بأنه شهيد، لأن النية مردها إلى الله تعالى. والصحيح أن يقال: نسأل الله له الشهادة نحسبه شهيداً إن شاء الله - ولا نزكي على الله احداً - بصيغة الدعاء وليس بصيغة الجزم لأن الجزم قول على الله بلا علم .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (أَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ، وَالزُّبَيْرُ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعْدٌ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعِيدٌ فِي الْجَنَّةِ ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بن عَوْفٍ فِي الْجَنَّةِ، وَأَبُوعُبَيْدَةَ بن الْجَرَّاحِ فِي الْجَنَّةِ)[١].

واتە: ئەبو بەکر لە بەهەشتدایە، عومەر لە بەهەشتدایە، (عثمان) لە بەهەشتدایە، عەلی لە بەهەشتدایە، (طلحة) لە بەهەشتدایە، زوبێر لە بەهەشتدایە، (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف لە بەهەشتدایە، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لە بەهەشتدایە، سەعیدی کوڕی زەید لە بەهەشتدایە، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح لە بەهەشتدایە.

بێگومان جێگیربووە بۆ زۆرێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕەزای خوایان لێ بێ شایەتی دراوە بەوەی کە بەهەشتین:

وەك عوکاشەی کوڕی میحصەن، (عبد الله)ی کوڕی سەلام، ئالی یاسر، بیلالی کوڕی ڕەباح، جەعفەری کوڕی ئەبو (طالب)، عەمری کوڕی (ثابت)، زەیدی کوڕی (حارثة)، (عبد الله)ی کوڕی ڕەواحە، ئەسمائی کچی ئەبو بەکر، (فاطمة)ی کچی ئەسەد، دایکی عیمارە، دایکی ئەیمەن، (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، خەدیجەی کچی خوەیلید، عائیشە، صەفیە، حەفصەو، هەموو هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، جگە لەوانەش زۆر کەسانی تریش، ڕەزای خوا لەهەر هەموویان بێ.

بەڵام ئەوانەی کە دەقەکان لەبارەیانەوە هاتووە کە دۆزەخین، ئەهلی سوننەو جەماعە شایەتی دەدەن کە دۆزەخین:

(١) – (صحيح سنن أبي داود) للألباني.

لەوانە ئەبو لەهەب (عبد العزي) کوڕی (عبد الطلب) و، هاوسەرەکەیشی دایکی جەمیل ئەروای کچی حەرب، ئەبو جەهل، ئومەییەی کوڕی خەلەف، (عبد الله)ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول، جگە لەوانە کە جێگیربووە لە حەقیاندا کە دۆزەخین.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە بەهەشت پێویست ناکرێت بۆ هیچ کەسێ ئیتر ئەو کەسە هەرچیەك بێ و هەر کەسێ بێت و لەهەر پلەو پایەیەکدا بێت، هەرچەندە کردەوەکانی چاك بن و چاکەکار بێ، تەنها بە جۆرێك نەبێ کە خوای گەورە دایبپۆشێت بە فەزڵ و بە منەت و بەخشندەیی خۆی؛ بە رەحمەت و بە بەزەیی و بە بەهرەو چاکەی خۆی بیخاتە بەهەشتەوە، خوای بەرز و بڵند دەفەرموێت:

﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَى مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ سورة النور: ٢١.

واتە: ئەگەر بەهرەو میهرەبانی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە هەرگیز کەسێ لەئێوە پوخت و پاك نەدەبۆوە، بەڵام خوا هەر کەسی بوێ (شیاوبێ) پاکی دەکاتەوە، خوا بیسەری زانایە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (مَا مِنْ أَحَدٍ يُدْخِلُهُ عَمَلُهُ الْجَنَّةَ). فَقِيلَ: وَلاَ أَنْتَ؟ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (وَلاَ أَنَا إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ رَبِّي بِرَحْمَةٍ)[1].

واتە: هیچ کەسێك بە کردەوەی خۆی خوای گەورە نایخاتە بەهەشتەوە، وترا: تەنانەت تۆش؟ ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! فەرمووی: تەنانەت منیش، مەگەر پەروەردگارم بە میهرەبانی و بە بەزەیی خۆی دامپۆشێت و بمخاتە بەهەشتەوە.

---

(١) - رواه مسلم .

ئەهلی سوننەو جەماعە:

سزا بە پێویست نازانن بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە رووبەڕوی هەڕەشەی توند بونەتەوە لە موسوڵمانان، جگە لە بێ باوەڕی - ئەگەر کەسێ بێ باوەڕ بێت دەتوانیرێت پێی بوترێت کافرە - ، بەڵام بۆ تاوانەکانی تر ئەگەر کەسێ تاوانەکەی بە حەڵاڵ نەزانی بێت ئەوە سزا بە پێویست نازانن بۆی، چونکە دەگونجێ خوای گەورە لێی خۆش ببێت بەوەی کە ئەنجامی داوە لە تاعەت و گوێڕایەڵی، یان بکەوێتە بەر شەفاعەتی شەفاعەتکاران، یان تەوبەی کردبێ و پەشیمان بوبێتەوە، یان بەوەی توشی بەڵاو کارەساتێك بوبێ، یان بە هۆی نەخۆشیەکەوە کە ئەو نەخۆشیە بوبێتە هۆی هەڵوەرینی تاوان و گوناهەکانی،خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ سورة الزمر: ٥٣.

واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کەخۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لەمیهرەبانی و بەزەیی خوا، چونکە بێگومان خوا لەهەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت، بەڕاستی هەر ئەوە لێ بوردەی بەبەزەیی یە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ سورة آل عمران: ١٢٩.

واتە: هەر بۆ خوایە هەرچی لە ئاسمانەکاندایە، هەرچی لەزەویدایە، خۆش دەبێ لەهەرکەس خۆی بیەوێت، سزای هەرکەسیش دەدات خۆی بیەوێت، خوا لێ بوردەی میهرەبانە.

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ﴾ سورة طه: ٨٢. واتە: بەراستی من زۆر لێبوردوم لەو کەسەی تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێت، پاشان بەردەوام بوبێ لەسەر ئەو ڕێبازە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَه)[1].

واتە: لەکاتێکدا پیاوێ بە ڕێگایەکدا تێپەڕ دەبوو لقە دارێکی دڕکاوی بینی ئازاری خەڵکی دەدا، ئەویش هەڵی گرت و لەسەر ڕێگاکە لایبرد، جا خوای گەورە سوپاسی کردو لێی خۆش بوو.

**ئەهلی سوننەو جەماعە:**

هیچ کاتێ حوکم و بڕیار نادەن بەسەر کەسێکی دیاریکراودا لەموسوڵمانان بەوەی کە ئەهلی ئاگرە، ئەگەر هەر ئەو بڕیارەشیان دا شایەتی ئەوە نادەن کە بە هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە؛ لەبەرئەوەی دەگونجێ تەوبەی کردبێ و پەشیمان بوبێتەوەو عاقیبەت و سەرەنجامی چاك بوبێت، خۆ ئەگەر هەر حوکی کەسێکیان دا؛ ئەوا ئەو حوکمەی کە دەیدەن دەیبەستنەوە بە مردنی کەسەکەوە واتە ئەگەر کەسەکە لەسەر بێ باوەڕی مرد ئەوە دەڵێن ئەو کەسە ئەهلی دۆزەخە، لەبەرئەوەی پەندو عیبرەت لەسەر عاقیبەت و سەرەنجامی کەسەکەیە؛ خۆ ئەگەر سەرەنجام لەسەر ئیمان مرد ئەوە ئەهلی بەهەشتە، - إن شاء الله - ، هەرچەندە لەوەو پێشیش خاوەنی کردەوەی چاك نەبێت، بەڵام ئەگەر سەرەنجام لەسەر بێ باوەڕی مرد ئەوە ئەهلی ئاگرە و بە هەتا هەتایی تێیدا دەمێنێتەوە، هەرچەندە لەوەو پێشیش خاوەنی چەندین کردەوەی چاك بوبێت.

(١) - رواه البخاري .

هەرکەسێ بە بێ باوەڕ ناسرا؛ ئەگەر لەپێش ئەوەدا بمرێت هیچ دیاتردەیەکی لێ دەرنەکەوت کە تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ؛ ئەوە حوکم و بڕیار دەدرێ بە سەریدا کە دۆزەخیەو هەتا هەتایی دەمێنێتەوە لە ئاگری دۆزەخدا – پەنا بەخوای گەورە – ئا ئەم (قاعدة) بنەماو یاساو دەستورە بەسەر کەسێکدا جێبەجێ دەکرێت لەسەر ئەو کەسانەی کە بە بێ باوەڕی و (مرتد)ی هەڵگەڕاوەیەتی مردون لە موسوڵمانان، بەڵام ئەوانەی لەبنەڕەتدا کافر و بێ باوەڕن بە هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە.

**ئەهلی سونەو جەماعە:**

باوەڕیان وایە بەوەی کە بۆ هەموو دروستکراوێ (أجل)کاتێکی دیاریکراو هەیە کە تێیدا کۆتایی بە ژیانی دێت، هیچ نەفسێك نامرێت مەگەر بە فەرمانی خواو، نوسراوێکی کات دیاریکراو؛ بەو جۆرەی کە خوا بۆی نوسیوە بمرێت بەو شێوەیە دەمرێت، ئینجا ئەگەر کاتی کۆتایی ژیانیان هات ساتێك دواناکەون و پێشیش ناکەون، خۆ ئەگەر مرد یان کوژرا؛ ئەوە دەمرێت بە ئاکامی دیاریکراوی خۆی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا ﴾ سورة آل عمران: ١٤٥.

واتە: هیچ کەسێك نەبووە کە بمرێت مەگەر بە فەرمانی خوا، نوسراوێکی کات دیاریکراوە.

ئەهلی سوننەو جەماعە:

باوەڕیان وایە کە پەیمان و بەڵێن و مۆژدەدانی بەهەشت بە باوەڕدارە خۆپارێزەکان حەقە.

هەڕەشەکردنی خوای پەروەردگار بەسزادانی سەرپێچیکاران لەیەکتاپەرستان و تاوانباران حەقە.

هەڕەشەکردنی خوای پەروەردگار بە سزادانی بێ باوەڕان و دووڕووەکان بە هەتا هەتایی مانەوەیان لە ئاگری دۆزەخدا حەقە.

خوای پەروەردگار بەڵێنی خۆی پەك ناخات خوای گەورە دەفەرموێت:
﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا﴾ سورة النساء: ١٢٢.

واتە: ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە لە داهاتوویەکی نزیکدا دەیانخەینە بەهەشتانێك کە ڕووبارەکان بە ژێر درەختەکانیان دا دەڕۆن دەمێننەوە تیایدا بە هەمیشەیی، بەڵێنی خوایە و ڕاستە (بەدی دەهێنرێت) و کێ لە خوا ڕاست بێژترە.

بەڵام خوای گەورە بەڵێنی داوە لە سەرپێچیکار و تاوانباری یەکتاپەرست و موسوڵمان خۆش ببێ بە گەورەیی و بە فەزڵ و بەخشندەیی و ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی، دەیانخاتە بەر تکای تکاکاران، خوای گەورە بەڵێنی داوە کە هیچ کەسێ لە موسوڵمانان بە هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا نەهێڵێتەوە، بەڵام بۆ جگە لەوان کە هاوبەش بۆ خوا دانەر و بێ باوەڕی ئەسڵین هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە بەدوری گرتووە کە ئەوان بەر ئەو لێخۆش بونە بکەون، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ ﴿٤٨﴾ ﴾ سورة النساء: ٤٨.

واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگە لەوە خۆش ئەبێت لەهەر گوناهێكی تر بۆ هەركەسێك كە بیەوێت.

# بنچینەی پێنجەم

## دۆستایەتی و دوژمنایەتی(المُوالاةُ والمُعاداةُ)[1]

## لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەدا

یەکێ لە بنچینەکانی عەقیدەی سەلەفی صاڵح، ئەهلی سوننە و جەماعە: بریتیە لە خۆشویستن لەبەر خوای گەورە و، رق لێ بوون لەبەر خوای گەورە:

* واتە: خۆشویستن و، دۆستایەتیکردن، هەوڵی سەرخستنی باوەڕداران بەتایبەتی و، موسوڵمانان بە گشتی بریتیە لە (ولاء).

* (براء) چیە واتە رق لێ بوون لەبەر خوا رقەبەرایەتی کردن لەگەڵ لە هاوبەش بۆ خوا دانەران و بێ باوەڕان، هەرکەسێکیش لەگەڵ ئەوان بوو و دۆستایەتی ئەوانی کرد هەر وەك ئەوانە دەبێ تەبەڕایان لێ بکەی و پشتیان تێ بکەی و رقت لێیان بێت، لەو دەستور و یاساو ڕێسایانەی کە دایاناون، خوای بەرز و بڵند دەفەرموێت:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾ سورة التوبة: ٧١.

---

[1] الموالاة لغة: هي المحبة، فكل من أحببته ابتداءً من غير مكافاة؛ فقد أوليته وواليته، والولاية ضد العداوة. وباختصار: إن الموالاة أو الولاء: المحبة والنصرة والاتباع، واللفظ مشعر بالقرب والدنو من الشيء .

المعاداة لغة: مصدر عادي يعادي معاداة. والعداء والعداوة: الخصومة والمباعدة؛ وهي الشعور المتمكن في القلب في قصد الإضرار وحب الانتقام، والعدو ضد الصديق. وباختصار: هي التباعد والاختلاف، وهي ضد الموالاة.

الموالاة والمعاداة شرعا: أصل الموالاة الحب، وأصل المعاداة البغض، وينشأ عنهما من أعمال القلب والجوارح ما يدخل في حقيقة الموالاة والمعاداة؛ كالنصرة والأنس والمعاونة والجهاد والهجرة.

فالموالاة إذن: الاقتراب من الشيء والدنو منه عن طريق القول أو الفعل أو النية، والمعاداة ضد ذلك.

ومن هنا نعلم أنه لا يكاد يوجد فرق بين المعنيين اللغوي والشرعي، وأن الله قد أوجب على المؤمنين أن يقدموا كامل الموالاة للمؤمنين، وكامل المعاداة للكافرين، ولا يتم الولاء للمؤمنين إلا بالبراء من المشركين؛ فهما متلازمان.

واتە: پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار هەندێکیان یارمەتی دەرو خۆشەویستی هەندێکی تریانن، فەرمان دەدەن بەچاکە و بەرگری دەکەن لەخراپە و، بەرێك و پێکی نوێژ جێبەجێ دەکەن و زەکات(ی سامانیان) دەدەن، گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئەوانە لەداهاتوودا خوا ڕەحمیان پێ دەکات، بەڕاستی خوا بەدەسەلاتی کار دروستە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ ﴾ سورة آل عمران: ٢٨.

واتە: نابێ بڕواداران بێ باوەڕان بگرن بە دۆستی خۆیان لەجیاتی بڕواداران، هەرکەسێ وا بکات ئیتر هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ خوادا نامێنێ.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە کە عەقیدەی دۆستایەتیکردن و دوژمنایەتیکردن لە بنچینە گرنگەکانن لەدیندا، پایەیەکە لەپایەکانی عەقیدەو پێگەو پلەیەکی زۆر تایبەتی و گەورەی هەیە لە شەرعی ئیسلامدا کە ئا لەم ڕوانەدا دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت:

یەکەم: دۆستایەتیکردن و دوژمنایەتیکردن بەشێکە لە واتای شایەتی (توحید)یەکخواناسی (لا إِلَهَ إِلّا اللهُ). چونکە مانای (لا إِلَهَ إِلّا اللهُ) بریتیە لە تەبەڕاکردن لەپەرستنی هەرپەرستراوێکی تر جگە لە (الله)، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ۖ ﴾ سورة النحل: ٣٦.

واتە: بێگومان ئێمە لەناو هەموو گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووە بەمەی تەنها خوا بپەرستن و دوورکەونەوە لە(پەرستنی) هەرپەرستراوێکی تر.

دووەم: بریتیە لە پتەوترینی پەتی ئیمان، مەرجێکە لە بەڕاست دانی عەقیدە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(أَوْثَقُ عُرَى الإِيمَانِ: الْمُوَالاَةُ فِي اللهِ، وَالْمُعَادَاةُ فِي اللهِ، وَالْحُبُّ فِي اللَّهِ، وَالْبُغْضُ فِي اللَّهِ)[١].

واتە: پتەوترینی پەتی باوەڕهێنان: بریتیە لە دۆستایەتیکردن لەبەر خوا و، دوژمنایەتیکردن لەبەر خوا، بریتیە لە خۆشویستن لەبەر خوا و، رق لێ بوونە هەر لەبەر خوای پەروەردگار.

**سێیەم: هۆکارە بۆ چەشتنی شیرینی و لەزەتی باوەڕهێنان و دڵنیایی.**

**پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:**

(ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الإِيمَانِ: مَنْ كَانَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَمَنْ أَحَبَّ عَبْدًا لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ، وَمَنْ يَكْرَهُ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ مِنْهُ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ)[٢].

واتە: سێ شت هەیە هەرکەسێك تێیدا هەبێت شیرینی و لەزەتی باوەڕهێنان دەچێژێت: هەرکەس خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) لە هەموو کەسێك خۆشەویستتر بن لەلای، هەرکەسێکی خۆشبوێت تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت، حەز نەکات بگەڕێتەوە بۆ سەر بێ باوەڕی وەك چۆن حەز ناکات فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە، دوای ئەوەی کە خوای گەورە رزگاریکردووە لە بێ باوەڕی و هیدایەتی داوە.

**چوارەم: بە بەجێهێنانی ئا ئەم بیروباوەڕ و عەقیدەیە؛ باوەڕهێنانی مرۆڤی پێ تەواو دەبێت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:**

(مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ وَأَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ)[٣].

واتە: هەرکەسێك خۆشویستنی لەبەر خوا بێت، رق لێ بوونی هەر لەبەر خوا بێت، ئەگەر بەخشی لە پێناوی خوادا ببەخشێت، ئەگەر نەیشی بەخشێ هەر لەبەر خوا نەیبەخشێ، ئەوە ئەوا بە دڵنیاییەوە باوەڕهێنانەکەی تەواوە.

---

(١) – أنظر (سلسلة الاحاديث الصحيحة) للألباني: ٩٩٨.

(٢) - متفق عليه.

(٣) - صحيح سنن ابي داود، للالباني .

**پێنجەم:** بەڕاستی هەرکەسێ غەیری خواو دینەکەی و خەڵکەکەی خۆشبوێت؛ ئەوە بێ باوەڕە بە خوای پەروەردگار.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ ۗ قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ سورة الأنعام: ١٤.

واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) بڵێ: دەتانەوێ منیش وەکو خۆتان لەخوا بەولاوە، کەسێکی تر بە دۆست و یارمەتیدەری خۆم بزانم؟! کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، ڕۆزیش بەگشت دروستکراوەکان دەداو، خۆشی لە ڕۆزی بێ نیازە، پێیان بڵێ فەرمانم پێ دراوە کە یەکەمین موسوڵمان و، یەکەمین کەس بم خۆ تەسلیم بکەم بە خوای گەورە، فەرمانم پێ دراوە نابێ لەهاویەش بڕیاردەران بیت.

**شەشەم:** بریتیە لەو پەیوەندیەی کە لەسەر بنچینەو بنەڕەتی ئەو عەقیدەیە کۆمەڵگەی ئیسلامی خواناس و یەکتاپەرست دادەمەزرێت، بینای ئەو کۆمەڵگە ئیسلامیە لەسەر ئەوە تەواو دەبێت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ)[1].

واتە: باوەڕهێنانی هیچ کەسێك لە ئێوە تەواو نابێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برا موسڵمانەکەشی پێی خۆش بێت.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

باوەڕیان وایە بەوەی کە عەقیدەی دۆستایەتیکردن و دوژمنایەتیکرد لە پێناوی خوای پەروەردگار واجب و پێویستیەکی شەرعیە؛ بەڵکو لە پێویستیەکانی شایەتومانیشە: (لا إِلَهَ إِلَّا اللهُ)، مەرجێکە لە مەرجەکانی، کە ئەویش بریتیە لە بنچینەیەکی گەورە و گرنگ لە بنچینەکانی عەقیدە و باوەڕهێنان؛ پێویستە لەسەر

(١) - رواه البخاري .

موسوڵمان ئاگای لێی بێت و چاودێری بکات، پارێزگاری لێ بکات، دەقی زۆر هاتووە کە جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەم بنچینە؛ لەوانە فەرمودەکەی خوای گەورە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ ﴾ سورة الممتحنة: ١.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بەدۆستی خۆتان دۆستایەتی خۆتانیان بۆ بنێرن، لەکاتێکدا دڵنیاشن ئەوان بێ باوەڕن بەو ئایینە ڕاستەی کە بۆتان هاتووە.

هەروەها فەرمودەکەی خوای گەورە:

﴿ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾ سورة التوبة: ٢٤.

واتە: (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) پێیان بڵێ: ئەگەر باوکانتان و کوڕانتان و برایانتان و هاوسەرانتان و خزم و عەشرەتتان و ماڵ و دارایی یە (بە زەحمەت) پەیداتان کردووە و بازرگانییەك کەدەترسن برەوی نەبێ (بێ بازاڕ بێ) و خانوو بەرەیەك کەپێی ڕازین خۆشەویست ترە لاتان لەخواو پێغەمبەرەکەی و تێکۆشان لەڕێگەکەیدا، ئەوە چاوەڕوان بکەن هەتا خوا فەرمان (و تۆڵە)ی خۆی دێنێ (بۆتان) ، خوا ڕێنموونی کەسانی تێپەڕ لەسنوور ناکات.

ئەهلی سوننە و جەماعە،

خەڵکی لە بیروباوەڕو عەقیدەی دۆستایەتیکردن و دوژمنایەتیکردندا دابەش دەکەن بە سێ بەشەوە:

**یەکەم: ئەوەی کە شایستەی دۆستایەتیکردن و خۆشویستنی رەهایە:**

ئەوانەش بریتین لەو باوەڕدارە راستەقینە نیازپاکانەی کە بڕوایان بە خوای گەورە هێناوەو بە پەروەردگاری خۆیانی دەزانن، بڕوایان بە پێغەمبەرەکەی هێناوەو بە پێغەمبەری خۆیانی دەزانن، هەڵئەسن بە ئەنجامدانی دروشمەکانی دینیئیسلام بە زانستەوە، بە وتەوە، بە بەکردەوەوە بە بیروباوەڕەوە؛ هەموو کاروکردەوەیە کە جێبەجێی دەکەن بە دڵسۆزی و بەملکەچیەوە تەنها بۆ خوای پەروەردگار جێبەجێی دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾ سورة المائدة: ٥٥ – ٥٦.

واتە: بێگومان دۆستو یارمەتیدەری ئێوە تەنها خواو پێغەمبەرەکەیی و بڕواداران، ئەوانەی کە بەرێكو پێکی نوێژەکانیان بەجێ ئەهێنن و زەکات ئەدەن و بەردەوام مل کەچن بۆ فەرمانی خوا. هەر کەس خواو پێغەمبەرو ئیمانداران بکات بەپشتیوانی خۆی، ئەوە بێگومان هەر کۆمەڵی خوا زاڵ و سەرکەوتوون.

**دووەم: ئەوەی لەلایەکەوە شایەنی دۆستایەتیکرنەو، لەلایەکی ترەوە شایەنی دوژمنایەتیکردن و تەبەڕا لێ کردنە:**

ئەوانە بریتین لە باوەڕدارانی تاوانبار و سەرپێچیکار؛ لەیەك کاتدا خۆشەویستی و دوژمنایەتی تیایاندا کۆدەبێتەوە؛ ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوانەیان خۆشدەوێ کە تیایاندایە باوەڕ و تاعەت و گوێڕایەڵی و تەقواو خۆپارێزی، لەلایەکی ترەوە رقیان لێیانە چونکە خاوەنی سەرپێچی و تاوانن بەڵام تاوانی کوفر و هاوبەش بۆ

خوا دانان نا، بۆ نموونە وەك: موسوڵمانێكی یاخی و سەرپێچیكار كردەوەی چاك و كردەوەی خراپ تێكەڵ دەكات، ئەوكەسەش كە گوێ نادات بە هەندێ لە ئەرك و واجباتەكانی سەرشانی و كەمتەرخەمی دەكات لە بەجێهێنانیاندا، هەندێ لە حەرام كراوەكان ئەنجام دەدات كە ناگاتە رادەی كوفر و بێ باوەڕی؛ وێنەی ئا ئەوانە بە ئەندازەی ئەو خێر و چاكەیەی كە تیایاندایەو لێیان دەردەكەوێت دۆستایەتی دەكرێن، هەروەها بە ئەندازەی ئەو تاوان و خراپەیەی كە تیایاندایەو لێیان دەردەكەوێت دوژمنایەتی دەكرێن، هەروەك چۆن پێویستە ئامۆژگاری بكرێن، بەو شێوەیەش پێویستە بێدەنگی نەنوێنرێت بەرامبەر بە گوناهو تاوانەكانیان؛ بەڵكو پێویستە فەرمانیان پێ بكرێ بە چاكەو، خراپەو تاوانیان لێ قەدەغە بكرێت، پێویستە سنورە شەرعیەكانیان لەسەر جێبەجێ بكرێت و تەمێ بكرێن و سزا بدرێن؛ تا دەست هەڵگرن لە سەرپێچی و گوناهو تاوانەكانیان و پەشیمان دەبنەوەو وازی لێ دەهێنن، هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جێبەجێ كرد بەسەر ئەو پیاوەدا كە ناوی (عبد الله) بوو، لەناو خەڵكدا بە(حِمَار)گوێدرێژ ناسرا بوو؛ كاتێك كە هێنایان بۆلای عەرەقی خواردبووەوەو سەرخۆش بوو، هەندێ لە هاوەڵان رەزای خوایان لێ بێ نەفرەتیان لێ كرد، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (لَا تَلْعَنُوهُ؛ فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ إِنَّهُ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ)[١]. واتە: نەفرەتی لێ مەكەن؛ سوێند بە (الله) ئەوەی كە من دەیزانم خواو پێغەمبەرەكەی خۆش دەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داركاری كردو حەدی خوای بەسەریا جێبەجێ كرد.

---

(١) - رواه البخاري .

**سێیەم: ئەوکەسەی شایستەی دوژمنایەتی و تەبەڕا لێ کرن و رق لێ بوونی رەهایە:**

ئەوانە بریتین لەوانەی کە بە تەواوەتی بێ باوەڕن ئەوانەی کە بێ باوەڕی و هاوبەش بۆ خوا دانان و بێ دینیان دەرکەوتووە، بە جیاوازی رەگەز و جۆرەکانیانەوە؛ لە جولەکە، لە گاور و، لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، لە بێ دینیان، لە بت پەرستان، لە ئاگرپەرستان، لە دووڕوان، ئەوانەی کە خۆیان بەزل دەزانن و ملکەچ ناکەن بۆ خوای گەورە، یان ئەوانەی شوێن ئەوان کەوتون لەوانەی کە شوێن رێچکەو مەزهەبە روخێنەر و ماڵ وێرانکەرەکان کەوتون، لەو حیزبانەی کە عیلمانین.

هەروەها ئائەم حوکم و بڕیارە جێبەجێ دەکرێ بەسەر ئەو کەسانەدا کە کاروکردەوەی بێ باوەڕانە ئەنجام دەدەن لە هەڵگەڕاوەکان کە پاشگەزبونەتەوەو خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام و بەناو موسوڵمانن: وەك ئەوەی کە کەوتۆتەناو هەڵوەشێنەرەوەیە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام، یان کەسێك کە کەسێکی تر بکاتە شەریك و هاوبەش بۆ خوا، وەك پەرستنی یەکێ لە بەدیهێنراوانی، یان جۆرێ لە جۆرەکانی پەرستشی بۆ تەرخان بکرێت؛ وەك پاڕانەوە لە غەیری خوای گەورە، یان هانا بردن بۆ غەیری خوا، داوای یارمەتی کردن لە غەیری خوا، یان پشت بەستن بە غەیری خوا، یان سەربڕین بۆ غەیری خوا، یان (نذر)کردن بۆ غەیری خوا، یان کەسێ جنێو بدات بە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی یان بە دینەکەی، یان نەکردنی یەکێ لەنوێژە فەرزەکان بەبێ هیچ بەهانەیەکی شەرعی، یان دین لە ژیان جودا بکاتەوەو باوەڕی وابێت کە دینی ئیسلام ناگونجێ لەگەڵ ئەم سەردەمەدا، یان جگە لەوانەیش لەو کردەوانەی هەڵگەڕانەوەن لە دین – لەدوای هەستان بە رونکردنەوەی بەڵگەی شەرعی بۆی (إقامه الحجه) – پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانان و کاربەدەستانیان لەدژی ئەم جۆرە هەڵگەڕانەوەیە جیهاد بکەن و

ڕێچکەکانیان لێ بگرن و لێیان لێ تەنگ بکەنەوە، وازیان لێ نەهێنن بە ئارەزووی خۆیان تاوان و خراپەکاری بڵاوبکەنەوە لەسەر زەویدا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ سورة التوبة: ٧٣.

واتە: ئەی پێغەمبەر جیهاد بکە دژی بێ باوەڕان و دووڕووان، توندو تیژ بە لەدژیان شوێنی حەوانەوەی ئەوانە دۆزەخە، کە دواڕۆژو چارە نوسێکی خراپە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ﴾ المجادلة: ٢٢.

واتە: کەسانێکت دەست ناکەوێ کە باوەڕیان هەبێت بە خواو بە ڕۆژی دوایی، کە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی خوا و پێغەمبەری خوا دەکەن، هەر چەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یا کوڕ و براو خزمیان بن.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە کە دۆستایەتیکردن لەبەر خوای گەورە چەندین پێویستی داخوازی و هەقێکی هەیە، پێویستە لەسەر موسوڵمان جێبەجێیان بکات تا ئیسلام و باوەڕەکەی تەواو بێت، ڕزگاری بێ لە کەوتنە ناو بێ باوەڕی، لەوانە:

یەکەم: کۆچکردن لە وڵاتی بێ باوەڕییەوە بۆ وڵاتی موسوڵمانان، بەڵام ئەمە موسوڵمانە چەوساوەکان و لاوازەکان ناگرێتەوە، هەروەها ئەو کەسەش ناگرێتەوە کە لەبەر چەندین هۆکاری شەرعی ناتوانێ کۆچ بکات.

دووەم: خۆدانەپاڵ و پەیوەندی کردنە بە کۆمەڵی موسوڵمانانەوە، جیانەبونەوە لێیان، هاوکاری کردنیان لەسەر چاکەو تەقواو فەرمان بە چاکە کردن و قەدەغەکردنی خراپەو تاوان.

**سێیەم:** هەرچی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ هەموو موسوڵمانانیش پێی خۆش بێت لە خێر و چاکەو، دوربوون لە خراپەو تاوان، سوربێ لەسەر خۆشویستنیان، لەگەڵ دانیشتنیان، پرس و راوێژ پێ کردنیان.

**چوارەم:** جاسوسی و سیخوڕی نەکردن بەسەریانەوە، یان گوێزانەوەی هەواڵ و نهێنیەکانیان بۆ دوژمنانیان واتە نابێ هەواڵیان بگەیەنرێت بە دوژمن، دەست هەڵگرتن لە ئازاردانیان بە هەموو جۆرێ، چاککردنی نێونیان.

**پێنجەم:** سەرخستنی موسوڵمانان بەسەر دوژمنەکانیاندا، پشت بەرنەدان و واز لێ نەهێنانیان هەرگیزاو هەرگیز، لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا، لەکاتی ئاسودەیی و خۆشگوزەرانی و تەنگ و چەڵەمەو کارەساتدا، لەهەموو کات و شوێنێکدا، یارمەتیدان و کۆمەکی کردنیان بە وتەو بە نەفس و بە سامان و دارایی، بەشداریکردنی دڵخۆشی و شادی و دڵ تەنگیان.

**شەشەم:** جێبەجێ کردنی مافەکانیان؛ لە سەردانی نەخۆش، لە شوێنکەوتنی جەنازە، لە بەزەیی و نەرم و نیانی نواندن و زەلیلی بەرامبەریان، لە راخستنی باڵی رەحمەت و بەزیی بۆیان، لە پاڕانەوەو داوای لێ خۆشبون کردن بۆیان، لە سەلام لێ کردنیان، لە بەزیی هاتنەوە بە لاواز و پەککەوتەیاندا، لە غەش و فڕوفێڵ لێ نەکردنیان لەکاتی مامەڵەدا، لە نەخواردنی سامان و داراییان بە ناڕەوا، لە مامەڵە نەکردن بەسەر مامەڵەیاندا، یان لە داخوازی نەکردن بەسەر داخوازی برا موسوڵمانەکەیدا، لە دەنگیان لێ وەرنەگرتنیان لەسێ شەو زیاتر.

**حەوتەم:** هەتك نەکردن و دەست درێژی نەکردنە سەر حورومەتی موسوڵمانان، لە بێ باوەڕ دانانیان، لە حەڵاڵ کردنی خوێنیان، یان لە ئابڕوبردنی شەرەف و ناموسیان، یان بەتاڵان بردنی سامان و داراییان، یان زوڵم و ستەم لێ کردنیان، یان جنێودان پێیان و جەنگ لەگەڵ کردنیان، یان نەفرەت لێ کردنیان، یا گومانی خراپ

پێ بردنیان، یان گاڵتە پێ کردنیان، یان غەیبەت کردنیان، یا دووزمانی و خراپەکاری و ئاژاوە نانەوە لە نێوانیانداو تێکدانی نێوانیان.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە کە دوژمنایەتیکردن لەبەر خوا چەند کار و دواکاریە دەخوازێ لە ژیانی مرۆڤی موسوڵماندا؛ پێویستە لەبەرچاوی بگرێت، وەریبگرێت تا پارێزراو و سەلامەت بێ لە کەوتنە ناو بێ باوەڕی، لەگەڵ کەسانی بێ باوەڕدا کۆك و تەبا نەبێت، لەوانە:

یەکەم: ڕق لێ بوونە لە هاوبەش بۆ خوا دانان و بێ باوەڕی و ئەو خەڵکانەی کە موشریك و بێ باوەڕن و ڕێچکەکانی؛ بە هەموو جۆر و شکڵ و شێوەکانیەوە، شاردنەوەی دوژمنایەتیکردنە بۆیان واتە دەبێ لەناخەوە ڕقت لێیان بێت و دژایەتیان بکەی، ئاشکراکردنی دورەپەرێزی پشتکردن تێیان لە خۆیان و خواکانیان، لە بێ باوەڕی و هاوبەش بۆ خوا دانانیان، لە سەرجەم بیروباوەڕەکانیان، لە یاساو ڕێساو دەستورەکانیان، لەگەڵ ئەوەی کە دەیانپەرستن جگە لە (الله)، ڕازی نەبوون بە سەرجەم ئەوانە.

دووەم: هەرگیز بێ باوەڕان نەگیریت بە دۆست و یارمەتیدەر و پشتیوان بۆ خۆت، موسوڵمانان، یان مەیل و ئارەزوت بۆ لایان هەبێت لە هاوڕێیەتیکردن و کردنیان بە پشت و پەنای خۆت، یان بە گەورە و بەڕێزیان بزانی، یان زەردەخەنەیان بۆ دەربڕی، یان ڕوت خۆش بێ بەرامبەریان، پێویستە هەموو ئەمانە ئەنجام نەدەیت و بە تەواوی لێیان دابڕێت بەتەواوی و لێیان جیاببیتەوە ، ئەگەرچی خزم و کەسوکارە تایبەت و نزیکەکانی خۆت بن.

سێیەم: وازهێنان لە وڵاتی بێ باوەڕان بەشێوەیەکی بەگشتی، نیشتەجێ نەبون تیایدا، ژمارەیان زۆر نەکرێت، سەفەر نەکرێت بۆی، مەگەر لەبەر حاڵەتی زەروری و

پێویست، بەو مەرجە دەبێت توانای دەرخستنی دروشمەکانی دین و جێبجێکردنیان هەبێت، بانگەوازیان بۆ بکات، شانازیشیان پێوە بکات.

**چوارەم:** خۆنەچواندن پێیان لەو شتانەدا کە تایبەتمەندی ئەوانە؛ ئیتر ئەو شتە دین بێت یان دونیا، خۆچواندن پێیان لە کاروباری ئاین دا وەك: خۆچواندن پێیان لە دروشمەکانی ئاینیەکەیاندا، رێگەکانی پەرستشەکانیان نابێ ئێمە ئەو رێگایانە بگرینەبەر، یان وەرگێڕانی کتێبەکانیان و ئاسانکردنی بۆ خوێندنەوەو شارەزابوون و ئاگادار بوون لێیان، یان هەموو زانستەکەیان لێ وەربگری، بەبێ پوختەکردن و لەبێژنگ دانیان، بەبێ هیچ رێکخەر(ضوابط)ێکی شەرعی، یان هێنانی پرۆگرام و یاساو رێساو دەستورەکانیان لە حوکڕانی و پەروەردە و فێرکردن، کردەوە کردن پێی، خەڵکی ناچار بکەیت ئا بەوانەی کە هێناوتەو جێبەجێی بکەیت بەسەریاندا.

خۆچواندن پێیان لە کاروبارە دونیاییەکانیاندا: خۆچواندن پێیان لە ئاکار و رەوشت و ئاداب و داب و نەریتیان، کە تایبەتمەندی ئەوانە؛ وەك رێگەی چۆنیەتی خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و جل و بەرگ، یان ناونان بەناوی ئەوانەوە واتە خۆت و منداڵەکانت بە ناوەکانی ئەوانەوە ناو بنێی، یا شوێن داب و نەریتەکانیان بکەویت کە بەو شێوەیە لەناو موسڵمانانندا نەناسراوە.

**پێنجەم:** سەرنەخستنی بێ باوەڕان، یان بە باش باس کردنیان، یان ستایش کردنیان و پیاهەڵدانیان، یان بڵاونەکردنەوەی فەزڵ و چاکەکانیان لەناو خەڵکدا، یان یارمەتیدانیان لەسەر بێ باوەڕییان، یا پیلان گێڕان لەگەڵ ئەواندا دژ بە موسوڵمانان، یان گواستنەوەی هەواڵ و نهێنیەکانیان بۆ بێ باوەڕان، یان ملیان بۆ کەچ بکرێت، یان داوای یارمەتیان لێ بکرێت مەگەر لەحاڵەتی زۆر پێویستدا ئەویش لەدژی بێ باوەڕانی وەك خۆیان.

بەڵکو دەبێت واز بهێنرێت لەهاوڕێیەتی و دانیشتن لەگەڵیاندا، یان هەرگیز نەکرێنە جێی متمانەی موسوڵمانان و نزیك نەخرێنەوە لێیان بۆ پاراستنی

نهێنیەکانیان، یان هەل و فرسەتیان نەدرێتێ کارە گرنگەکانی موسوڵمانان جێبەجێ بکەن.

**شەشەم:** بەشداری نەکردن لەچەژن و خۆشی و بۆنەو ئاهەنگە ئاینیەکانیاندا، بەو بۆنانەوە پیرۆزباییان لێ نەکرێت، بە وتەو بە کردەوە بە گەورە دانەنرێن، وەك ئەوەی پێیان بڵێی گەورەو سەروەرم یان شێوەی ئەوانە، بێگومان خوای گەورە بە سەرشۆڕ و سوك ریسوا دایناون.

**حەوتەم:** داوای رەحمەت و بەزەییان بۆ نەکرێت؛ لەبەرئەوە ئەو کارە خۆشەویستی دەگرێتەخۆ بۆیان، بە راست زانینی ئەو نارەوایی و خراپەو تاوانەیە کە لەسەرینی.

**هەشتەم:** بە هیچ شێوەیە دروست نیە روپامایی و خۆبردنە پێشەوە بۆئەوەی بێ باوەڕان لێت رازی بن، یان بە قسەی شیرین خۆتیان لەلا خۆشەویست بکەیت، یان لەگەڵیان رێك بکەویت و بچیت بە دەمیانەوە لەسەر حسابی دین، یان بێدەنگ بیت لەسەرئەوەی کە ئەوانی لەسەرە لە خراپەکاری و لە نارەوایی.

**نۆیەم:** لەکاتی کێشەو تەنگانەدا نەکرێنە دادوەر بۆ چارەسەری کێشەکان، یان رازیبون بە حوکم و بڕیاریان یان رازیبون بە هەندێ لە حوکم و بڕیارەکانیان، پێویستە وازبهێنرێت لە شوێنکەوتنی ئارەزویان، شوێنکەوتنیان لەهەر کارێ لە کارەکانیاندا، لەبەرئەوە شوێنکەوتنیان واتە وازهێنانە لە حوکمی خوای گەورە، هەروەها وازهێنانە لە حوکمی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم).

**دەیەم:** شوێن نەکەوتنی بێ باوەڕان و هاوبەش بۆ خوا دانەران، یان گوێرپەڵی کردنیان لەو شتەی کە فەرمانی پێ دەکەن، یان ئاماژەی پێ دەکەن و دەیرازێننەوە بۆ خەڵك تا هەستن بە جێبەجێ کردنی.

**یانزەهەم:** دەستپێشخەری نەکردن لە سڵاو لێ کردنیان بە سڵاوی ئیسلام: واتە بە (السَلاَمُ عَلَيْكُمْ).

# بنچینەی شەشەم

**بەڕاست دانانی کەرامەتی دۆستانی خواو (تصديق كرامات الأولياء)و پێشبینی(فراسه)ی پیاوچاکان و خەوبینین و (سحر)جادو ئیرەیی(حسد)و چاوپیسی و جنۆکە.**

یەکێکی تر لە بنچینەکانی عەقیدەی سەلەفی صالح، ئەهلی سوننە و جەماعە: بەڕاست دانانی کەراماتی دۆستانی خوایە[1]: بریتیە لەوەی کە دەگونجێ خوای گەورە مۆڵەت بدات روبدات لەسەردەستی هەندێ لە باوەڕدارە چاك و خاوەن

* الكرامة : هي أمر خارق للعادة وغير مقرون بدعوى النبوة ولا هو مقدمة لها ؛ يُظهرُه الله على يد بعض عباده الصالحين– من الملتزمين بأحكام الشريعة– إكراما لهم من الله عز وجل ، فإذا لم يكن مقرونا بالإيمان الصحيح والعمل الصالح كان استدراجا . وقد وقع في الأمم السالفة ، كما في سورة الكهف وغيرها ، وفي صدر هذه الأُمة من الصحابة والتابعين ؛ كما حصل مع عمر بن الخطاب رضي الله عنه : « يا سارية الجبل » . وغيرها كثيرة جدا ، وفي كتب السنن الصحيحة والآثار المنقولة شيء كثير من الكرامات التي كرم الله تعالى به عباده الصالحين العاملين بكتابه وبسنة نبيه– صلى الله عليه وسلم –وما رواه آلاف من العلماء وغيرهم من الثقات وشاهدوه ، وهي متواترة وموجودة في الأُمة وباقية فيها إلى ما شاء الله تعالى ، ووقوع كرامات الأولياء في الحقيقة معجزة للأنبياء ، لأن الكرامة لم تحصل لأحدهم إلا ببركة متابعته لنبيه وسيره على هدى دينه وشريعته ، وهي من الأُمور الجائزة عقلا . وقد يكون ما يعطيه الله لعبده المؤمن من فتح آفاق العلم أمامه أفضل وأعظم من كل الخوارق المادية التي نسمع بها أو نقرأ عنها ، ومن الكرامة التي نص عليها سلفنا ؛ الاستقامةُ على الكتاب والسنة ، وطاعتهما والرضا بحكمهما ، والتوفيق في العلم والعمل . وإن علم حصول الكرامة لبعض المسلمين ؛ لا يدل على ضعف إيمانهم ، لأن الكرامة تقع لأسباب منها : تقوية إيمان العبد ، ولهذا لم يرَ كثير من الصحابة شيئا من الكرامات لقوة إيمانهم وكمال يقينهم ، ومنها أيضا : إقامة الحجة على العدو ، والكرامة لا تقيد من ناحية العقل ، وإنما تقيد بضوابط الشرع ، وللكرامة شروط منها : أن لا تناقض حكما شرعيا ، ولا قاعدة دينية ، وأن تكون لحي ، وأن تكون لحاجة ؛ فإن فقد أَحد هذه الشروط ؛ فليست بكرامة بل هي إما خيال ، وإما وهم وإما إلقاء من الشيطان . والكرامة لا يَثبُت بها حكم من الأحكام الشرعية ، ولا ينتفي بها حكم شرعي أيضا ذلك أن للأحكام الشرعية مصادرها المعروفة من كتاب الله وسنة رسوله والإجماع ، وإذا أجرى الله الكرامة على يدي مسلم ، فينبغي له أن يشكر الله على هذه المنحة والنعمة ، ويسأل الله تعالى الثبات وعدم الفتنة إن كانت ابتلاء واختبارا ، وأن يكتم أمرها وأن لا يتخذها وسيلة للتفاخر والتباهي أمام الناس فإن ذلك يوردُ موارد الهلكة ، وكم من أناس خسروا الدنيا والآخرة حين استدرَجهُم الشيطان من هذا الطريق ؛ فاصبحت تلك الأعمال وبالا عليهم . واعلم أن لأولياء الرحمن صفات ذكرها الله تعالى في كتابه الكريم في كثير من الآيات ، وجمعت في سورة الفرقان : من الآية ، ٦٣– ٧٤ ، وذكرها النبي– صلى الله عليه وسلم – في كثير من الأحاديث ومن هذه الصفات على سبيل المثال : الإيمان بالله وبملائكته ورسله وكتبه واليوم الآخر والقضاء والقدر خيره وشره ، والتقوى : وهي الخوف من الله ، والعمل بسنة نبيه– صلى الله عليه وسلم – والاستعداد ليوم اللقاء ، والحب في الله والبغض في الله ، وأن رؤيتهم تُذكرُ بالله ، وهم يمشون على الأرض هونا ، وإذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاما ، ويبيتون لربهم سُجدا وقياما ، ويقولون ربنا اصرف عنا عذاب جهنم ، وإذا أنفقوا لم يسرفوا ولم يَقتُروا ، ولا يدعون مع الله إلها آخر ، ولا يقتلون النفس التي حرم الله إلا بالحق ، ولا يزنون ، ولا يشهدون الزور ، وإذا مروا باللغو مروا كراما ، وإذا ذُكروا

تەقواكانی، ئەوانەی كە بەڕاستی و بە دڵسۆزی شوێن ڕێگەو سوننەتەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كەوتون؛ لەو شتانەی لە توانای مرۆڤ بەدەرن، وەك ڕێزێك بۆیان، وەك دەرخستنی فەزڵ و چاكەی ئەو دۆستانە؛ هەروەك بەڵگە لەسەر ئەوە لە قورئان و سوننەت و كۆدەنگی زانایان، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ سورة يونس: ٦٢ – ٦٤.

واتە: ئاگادار بن بێ گومان دۆستانی خوا ترسیان لەسەر نی یە، خەفەتیش ناخۆن. ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لەخوا دەترسن. هەر بۆ ئەوانە مزگێنی لەژیانی دنیادا و، لە دواڕۆژیشدا گۆڕان نی یە بۆ وتە(و بەڵێنە)كانی خوا، هەر ئەوەیە سەركەوتنی زۆر گەورە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (إنَّ الله قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ آذَنْتهُ بِالحَرْبِ)[1]. واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: هەركەسێ دوژمنایەتی دۆستێكی من بكات ئەوە بە دڵنیاییەوە جەنگم لەگەڵ بەرپا كردووە.

بەڵام بۆ ئەهلی سوننە و جەماعە كۆمەڵێ ڕێكخەر(ضوابط)ی شەرعی هەیە لە باوەڕبون بە كەرامات، مەرج نیە هەموو ئەو كارانەی كە لەتوانای مرۆڤ بەدەرن ڕودەدەن كەرامەت بێت؛ بەڵكو دەگونجێ ئەو كارەی كە ڕویداوەو لە توانا بەدەرە (إستدراج) بێت واتە هەڵخەڵەتاندن و پلە پلە بەرزكردنەوە بێت تا كۆتا پلە دەكەوێتە خوارەوەو لەناودەچێت، یان بچێتە ناو كەرامەت و لە كەرامەتیش نەبێت؛ لە كاروكردەوەی ساحیر و جادوگەر و فاڵچیەكان و دەججال و درۆزنەكان و،

بآيات ربهم لم يخروا عليها صُما وعميانا ، ودعاؤهم: ربنا هب لنا من أزواجنا وذرياتنا قرة أعين واجعلنا للمتقين إماما . وغيرها من الصفات الثابتة في الكتاب والسنة.

(١) – رواه البخاري .

شەیاتینی جنۆکە بێت، جیاوازی رون و ئاشکرا هەیە لەنێوان کەرامەت و سیحر و جادو(شعوذة)دا:

* **کەرامەت:** لەخوای گەورەوەیە؛ هۆکاری رودانی بریتیە لە تەقواو گوێڕایەڵی کردنی و شوێنکەوتنی رێگەو رێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و سوننەتەکانی، کردوەی چاك ئەنجامدان.

**کەرامەت؛** تایبەتمەندە بە دۆستەکانی خوای خاوەن بەزەیی و میهرەبانی؛ ئەوانەی کە لە خوا دەترسن و پارێزکارن، لە ئەهلی باوەڕهێنان و، یەکخواناسی و، سوننەن و، بەردەوامیان هەیە لەسەر دین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانُوٓاْ أَوْلِيَآءَهُۥٓۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ﴾ سورة الأنفال: ٣٤.

واتە: لەکاتێکدا ئەوان خۆشەویست و سەر پەرشتیاری ئەو (مزگەوتە) نین، بەڕاستی سەر پەرشتیار و خۆشەویستی ئەو (مزگەوتە) خوا ناسان و پارێزکارانن.

* **جادوگەری**(شعوذة): لەشەیتانی رەجم کراوەوەیە، هۆکاری رودانی بریتیە لە کاروکردەوەی بێ باوەڕی و هاوبەش بۆ خوا دانان و سەرپێچی و تاوان و لەسنوردەرچون و خراپەکاری و شوێنکەوتنی هەواو ئارەزو ئەو کەسانەی کە شوێنکەوتەی هەواو ئارەزون.

* **جادوگەری**(شعوذة): تایبەتمەندە بە دۆستەکانی شەیتانەوە؛ گومڕایانن؛ لە ئەهلی بێ باوەڕی و، هەوابەش بۆ خوا دانان و، گومڕایی و، بیدعەو، هەواو ئارەزو، دووڕویی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ سورة الأنعام: ١٢١.

واتە: بێگومان شەیتانەکان بەنهێنی شت بەدۆستانیان دەڵێن بۆ ئەوەی موجادەلە و دەمە دەمێتان لەگەڵ بکەن، جا ئەگەر بەگوێیان بکەن ئەوە بێگومان لەهاوبەش دانەران دەبن.

ئەهلی سوننە و جەماعە؛

هەرگیزاو هەرگیز فەزڵی دۆستانی خوا نادەن بەسەر پێغەمبەراندا سەلامی خوایان لەسەر بێ، بەڵکو یەك پێغەمبەر لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە چاکترە لە سەرجەم دۆستەکانی خواو پیاوچاکان.

هیچ کاتێ زێدەڕەوی ناکەن و ڕۆناچن دەربارەی یەکێ لە دۆستانی خوادا، بیروبۆچونیان وا نیە کە دۆستەکانی خوا بتوانن سود و زیان بە کەسی تر بگەیەنن، بێ گوناه(معصوم) نین واتە پارێزراو نین لە گوناه، شەرع دانەریش نین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ ﴾ سورة الحج: ٧٥.

واتە: خوا لە مەلائیکەکاندا نێردراو هەڵدەبژێرێت، هەروەها لە خەڵکیش دا.

لە بنچینەکانی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە:

* بریتیە لە بەڕاستدانانی پێشبینی(فراسة)ی ڕاست لەلایەن پیاوچاکان و خاوەن تەقواکانەوە؛ لە ئەهلی باوەڕهێنان و یەکخواناسی، فیراسەت بریتیە لە نورێك خوای گەورە دەیخاتە ناو دڵی بەندەیەکەوە؛ بەو فیراسەتە جیاوازی دەکات لەنێوان هەق و ناهەقدا، لەنێوان ڕاستگۆ و درۆزندا، جا هەرکەسێ باوەڕەکەی بەهێز و پتەوتر بێت ئەوا پێشبینی(فراسة)کەی ڕاستتر و تیژترە.

* بەڕاستدانی خستنەوەی خەوبینینی چاك، بریتیە لە بەشێك لە پێغەمبەرایەتی، خەوبینینی چاك موژدەیەکە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ بەندە باوەڕدارەکەی، دەروکردنەوەی خێر و چاکەیە بۆی لە کاروبارەکانی دونیاو دوارۆژدا، کاتێ کە قیامەت نزیك دەبێتەوەو دونیا بەرەو کۆتایی دەڕوات؛ خەوبینینی باوەڕدار درۆی تێدا نابێت و بەڕاست دەردەچێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِذۡ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾ قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٥﴾

وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ سورة يوسف: ٤ – ٦.

واتە: (بیریان خەرەوە) کاتێ یوسف بە باوکی وت: ئەی بابە گیان بە ڕاستی من لە خەومدا دیم یازدە ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ دیمن سوژدەیان بۆ دەبردم. وتی: ئەی کوڕی شیرینم خەوەکەت مەگێڕەرەوە بۆ براکانت نەوەك بەهۆیەوە فێڵ و پیلانێکت لێبکەن، بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئادەمی. ئابەو شێوەیە هەڵت دەبژێرێ (بۆ پێغەمبەرایەتی) پەروەردگارت، فێرت دەکات بەشێك لەخەو پەرژین، بەهرەی خۆی تەواو دەکات بۆت، بۆ بنەماڵەی یەعقوب، هەر چونێ تەواوی کرد بۆ هەردوو باپیرەت لەپێشدا، کەئیبراهیم و ئیسحاقن، بەڕاستی پەروەردگارت زانای کاردروستە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا بَلَغَ ... قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ سورة الصافات: ١٠٢.

واتە: (ئیبراهیم) وتی: ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم بەڕاستی من لە خەودا دیم کە سەرت دەبڕم جا سەرنج بدە دەڵێ ی چی و ڕات چی یە؟ (کوڕەکە) وتی: بابەگیان ئەوەی فەرمانت پێ دراوە بیکە، دڵنیابە دەمبینی بە ویستی خوا لە خۆگران دەبم.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبُوَّةِ إِلاَّ المُبَشِّرَاتِ)، قالوا: وَمَا المُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: (الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ)[1].

واتە: (پێغەمبەرایەتی هیچ نەماوەتەوە تەنها موژدەدان نەبێت)، وتیان: ئەو موژدەدانانە چین؟ فەرمووی: (خەوبینینی چاکە).

سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ ﴾ يونس: ٦٤

(١) – رواه البخاري: ٩/٤٠ (٦٩٩٠).

ئەبو (درداء) لە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) پرسی؟ دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾ ﴾ ورة يونس: ٦٤.

ئەویش فەرمووی: (مَا سَأَلَنِي عَنْهَا أَحَدٌ غَيْرَكَ مُنْذُ أُنْزِلَتْ؛ هِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَهُ)[1]. واتە: جگە لەتۆ کەس پرسیاری دەربارەی ئەم ئایەتە لێ نەکردووم لەوەتەی دابەزیوە؛ بریتە لە خەوی چاك کە موسوڵمان دەیبینێ، یان پێوەی دەبینرێ.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

شایەتی دەدەن کە لەدونیادا جادو جادوگەران بونیان هەیە، هەیەتی بە هەقیقەت کاریگەریی کەونی و قەدەری هەیە بەڵام بە ئیزنی خوا، هەشیەتی هەقیقەت نیە، بەڵکو تەنها خەیاڵاتی روتە.

بێگومان شەیاتینی جنۆکە ئەوانن پایەو کۆڵەکەی جادو جادوگەر، بەو توانایەی کە خوای گەورە پێی بەخشیون دەتوانن ئەو کارە بکەن، بەڵام خوای پەروەردگار ئەو توانایەی بە ئادەمیزاد نەبەخشیوە، ئەوەندە هەیە ئەوانە بەویست و خواست و ئیزنی خوا نەبێ ناتوانن زیان بە هیچ کەسێك بگەیەنن، هەتا جادوگەرەکە زیاتر بێ باوەڕ بێ شەیتان زیاتر گوێڕایەڵی دەکات، خوای گەورەش دەفەرموێت:

﴿ وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَـٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ

(١) – صحيح سنن الترمذي للألباني.

وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴾ سورة البقرة: ١٠٢.

واتە: (جولەکەکان) دوای ئەو (شتانە) کەوتن کە شەیتانەکان دەیان خوێندەوە(بۆ خەڵك) لەسەردەمی پاشایەتی سولەیماندا، سولەیمان بێ بڕوا نەبوو، بەڵام شەیتانەکان بێ بڕوا بوون، خەڵکیان فێری جادو دەکرد، هەروەها ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە لە بابل بۆ سەر هاروت و ماروت (دوو مەلائیکە بوون)، ئەمانە کەسیان فێر نەدەکرد هەتا پێیان نەوتایە ئێمە هەر تاقیکەرەوەی (ئادەمیزاد)ین کەواتە بێ بڕوا مەبە، ئینجا فێری جادوی وا دەبوون لێیانەوە کە ژن و مێردی پێ لەیەك بکەن، ئەوان بەم جادووە ناتوانن زیان بەکەس بگەیەنن مەگەر بەویستی خوا، فێری شتێك دەبن کە زیانیان پێ دەگەیەنێ نەك قازانج، بێگومان زانییان هەر کەسێ جادو بکڕێ (بە فەرمودەی تەورات) لەڕۆژی دواییدا بێ بەش دەبێت، بەڕاستی زۆر بەدە ئەو شتەی کە (بڕوای) خۆیانیان پێ فرۆشت ئەگەر بیانزانیایە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴾ سورة الأعراف: ١١٦.

واتە: جادویەکی گەورەیان نواند.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ ﴾ سورة يونس: ٨٠.

واتە: جا کاتێ جادو بازەکان هاتن.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ !) قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: (الشِّرْكُ باللهِ، والسِّحْرُ،...)[1].

---

(١) – متفق عَلَيْهِ، أخرجه البخاري: ١٢/٤ (٢٧٦٦) ، ومسلم: ٦٣/١ (٨٩) (١٤٥).

واتە: خۆتان بەدووربگرن لە حەوت تاوانە زۆرگەورەو لەناوبەرەکە: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! ئەو حەوت تاوانە گەورەیە چین؟ فەرمووی: هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان و، سیحر و جادو کردن و ....

هەرکەسێ باوەڕی بەوە هەبێ کە جادو بەبێ ئیزنی خوای گەورە سود یان زیان دەگەیەنێت؛ ئەوە بەدڵنیاییەوە ئەو کەسە بێ باوەڕ بووە.

هەرکەسێ باوەڕی بەوە هەبێ کە جادوکردن حەڵاڵە ئەوە کوشتنی واجبە، لەبەرئەوە موسوڵمانان یەکدەنگ و تەبان لەسەر حەرامیەتی جادو.

جادوگەر داوای لێ دەکرێت تەوبە بکات و پەشیمان بێتەوە، ئەگەر پەشیمان بووەوە باشە، ئەگەر پەشیمان نەبویەوە ئەوە دەبێ بدرێت لەملی.

ئەهلی سوننە و جەماعە: باوەڕیان وایە ئەگەر کەسێ جادوی لێ کرا بە پاڕانەوە و ئەو نوشتە شەرعیانەی کە لە قورئان و سوننەدا هاتوون شیفای بۆ دێ و چاك دەبێتەوە – بە ئیزنی خوای پەروەردگار – ، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾ الإسراء: ٨٢[1].

* قال ابن قدامة المقدسي رحمه الله: (السحر: عُقَد ورقى وكلام، يتكلم به، أو يكتبه، أو يعمل شيئا يؤثر في بدن المسحور، أو قلبه، أو عقله من غير مباشرة له، وله حقيقة فمنه ما يقتل وما يمرض ، وما يأخذ الرجل عن امرأته ؛ فيمنعه وطأها ، ومنه ما يفرق بين المرء وزوجه ، وما يُبَغض احدهما إلى الآخر، او يُحببُ اثنين، وهذا قول الشافعي . . . وقال: إذا ثبت هذا فإن تعلم السحر وتعليمه حرام لا نعلم فيه خلافا بين أهل العلم، قال أصحابنا: ويكفر الساحر؛ بتعلمه وفعله سواء اعتقد تحريمه أو إباحته. ثم قال عن حقيقة السحر: ولولا أن السحر له حقيقة لما أمر الله تعالى بالاستعاذة منه ، قال تعالى : ( يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ ) إلى قوله: ( فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ ) سورة البقرة : الآية ، ١٠٢) . انظر: « المغني » ، ج ٨ ، ص١٥٠- ١٥١.

واتە: لەم قورئانەدا دەنێرینە خوارەئەوەی کە هۆی شیفاو میهرەبانی یە بۆ بڕوا داران، بەڵام (هاتنی ئەم قورئانە) بۆ ستەمکاران هیچ زیاد ناکات جگە لە خەسارەتمەندی.

**ئەهلی سوننە و جەماعە؛**

باوەڕیان وایە کە ئیرەیی بردن(حسد) و چاوپیسی هەقن، ئەگەر خوای گەورە بیەوێت زیان دەگەیەنن بە بەندەکان؛ بەڵکو جاری وا هەیە کاریگەریەکی وەهای هەیە دەبێتە هۆی کوشتنی ئەو کەسەی کە حەسودی پێ براوە یان چاوی لێ کراوە.

حەسودی گشتگیرترە لە چاوپیسی، لەبەرئەوە هەموو چاوپیسێ حەسودە، بەڵام هەموو حەسودێ چاوپیس نیە.

حەسودی رودەدات لەلایەن کەسێکەوە دڵەکەی پیسەو دەروونی پیسەو رقاوییە، لەئەنجامی دڵ پیسی و رق و کینەو پێ ناخۆشبوونەوە ڕودەدات، کەسی حەسود ئاواتەخوازە ئەو نازو نیعمەتەی کە خوای پەروەردگار رشتویەتی بەسەر کەسێکدا نەیمێنێ، بەڵام چاوپیسی دەگونجێ لەلایەن پیاوی چاکیشەوە بێت، یان دەگونجێ مرۆڤ چاو لە سەر و ماڵی خۆشی بکات، هۆکاری چاوپیسی بریتیە لە بەخۆدانازین و خۆبەگەورەزانین و خۆ بەچاکزانین، بەڵکو حەسودی و چاوپیسی هاوبەشن لە شوێنەواری خراپدا کە جێی دەهێڵن؛ بە جۆرێ کە ئەو دووانە هۆکارن بۆ ئەوەی کە کەسی حەسودی پێ براو یان کەسی چاو لێ کراو هەردوکیان توشی زیان ببن.

هەروەك باوەڕیان وایە کە پەناگرتن بە خوای گەورە واجبە لە زیان و خراپەی حەسودی و چاوپیسی؛ بە پاڕانەوە و زیکرە شەرعیەکان، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾ سورة الفلق: ٥.

واتە: لە زیانی بەخیل و حەسود کاتێك کە حەسودی ببات.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَـٰرِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ ﴾ سورة القلم: ٥١.

واتە: بەڕاستی نزیك بوو بێ بڕواکان هەڵتخلیسکێنن بەچاو(ی پیس)یان، لەکاتێکدا کە قورئان دەبیستن، دەیان وت: بەڕاستی ئەم (پێغەمبەرە) شێتە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾ سورة النساء: ٥٤.

واتە: یان ئیرەیی(حەسودی) دەبەن بەخەڵکی؟ لەسەر ئەوەی خوا پێی بەخشیوون (کە پێغەمبەرێتی یە) لە فەزڵ و بەهرەی خۆی.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (الْعَيْنُ حَقٌّ، وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرِ لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ، وَإِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ فَاغْسِلُوا)[١].

واتە: چاوپیسی هەق و ڕاستە، ئەگەر شتێ هەبوایە پێش قەدەری خوای گەورە بکەوتایە، ئەوا چاوپیسی پێشی دەکەوت، ئەگەر داوای خۆشتنتان لێ کرا بۆ کەسێك کە بوبێ بەچاوتانەوە، ئەوە خۆتان بشۆن.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (لَا يَجْتَمِعُ فِي جَوْفِ عَبْدٍ؛ الإيمان والحَسَد)[٢]. واتە: باوەڕهێنان و حەسودی پێکەوە لەدڵی هیچ بەندەیەکدا کۆنابنەوە.

(١) – رواه مسلم.

(٢) – اخرجه الحاكم في: (المستدرك) ج٢ ص٧٢، وصححه الألباني في (الصحيح الجامع).

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

باوەڕیان وایە کە خوای گەورە جنۆکەی دروستکردووە لەئاگر لەپێش دروستکردنی ئادەمدا؛ ئەوانە دەخۆن و دەخۆنەوە و هاوسەرگیری دەکەن و نەوەو وەچە دەخەنەوە و زۆر دەبن، بریتین لەچەند دەستەو تاقمێك، ئەوان ئێمە دەبینن بەڵام ئێمە ئەوان نابینین، توانای ئەوەیان هەیە شکڵ و شێوەی خۆیان بگۆڕن، خاوەنی توانای زۆر بەهێزن، خاوەنی سەلیقەو پسپۆری دەستکردن، ئەوانە تەکلیفیان لەسەرەو لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکرێت، هەیانە باوەڕدارەو هەشیانە بێ باوەڕە، خوای گەورە موحەممەدی (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەوانیش ڕەوانە کردووە؛ ئەوەی گوێڕایەڵی بکات دەچێتە بەهەشتەوە، ئەوەشی گوێڕایەڵی نەکات یاخی ببێ و سەرپێچی بکات ئەوە ئاگری دۆزەخ جێگەیەتی، بۆیە ناونراون جنۆکە(جن) لەبەرئەوە شاراوەن و پەنهانن لەبەرچاوی مرۆڤ و نابینرێن.

ئەهلی سوننە و جەماعە باوەڕیان وایە کە خوای گەورە شەیاتینی جنۆکەی دروستکردووە واتە هەیانە کافرە، وەسوەسە دەخەنە دڵی ئادەمیزادەوە، لەهەموو لایەکەوە دەوری ئادەمیزاد دەدەن بۆ ئەوەی فریوی بدەن، دەستیان لێ بوەشێنن و بچنە ناو جەستەیانەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ ﴾ سورة الأنعام: ۱۲۱. واتە: بێگومان شەیتانەکان بەنهێنی شت بەدۆستانیان دەڵێن بۆ ئەوەی موجادەلە و دەمە دەمێتان لەگەڵ بکەن، جا ئەگەر بەگوێیان بکەن ئەوە بێگومان لەهاوبەش دانەران دەبن.

خوای گەورە ئەگەر بیەوێت زاڵیان دەکات بەسەر هەر یەکێ لە بەندەکانی خۆیدا، لەبەر حیکمەتێ، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ وَعِدۡهُمۡۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴾ سورة الإسراء: ٦٤.

واتە: هەرکەس لەوانە کە دەتوانی گومڕای بکە بەدەنگت (بە گۆرانیت)، و بدە بەسەریانداو تێیان خوڕە بەسوار و پیادەی لەشکرەکەتەوە و هاوبەشییان بکە لەماڵ و سامان و منداڵیاندا بەڵێنیشیان پێ بدە، بەڵام شەیتان بەڵێنیان پێ نادات تەنها خەڵەتاندن نەبێت.

خوای گەورە ئەگەر بیەوێت هەر یەکێ لە بەندەکانی خۆی لە فڕو فێڵی شەیتانەکان دەپارێزێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴾ سورة النحل: ٩٩ – ١٠٠.

واتە: بەراستی ئەو(شەیتان) دەسەڵاتی نی یە بەسەر ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوەو تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن. تەنها دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە کە ئەو(شەیتان) دەکەنە دۆست پشتیوانی خۆیان و ئەوانەی بەهۆیەوە بوونەتە هاوەڵ دانەر.

## بنچینەکانی حەوتەم
## پرۆگرامی وەرگرتنی دین و بەڵگە هێنانەوە
## لەلای ئەهلی سوننەو جەماعەوە.

له بنەماكانی عەقیدەی سەلەفی صالح ئەهلی سوننەو جەماعە: سەبارەت بە پرۆگرامی وەرگرتنی دین و بەڵگە هێنانەوەوە؛ بریتیە لە شوێنکەوتنی هەرشتێ کە لە قورئانەکەی خوای گەورەدا هاتووە، هەروەها ئەوەش کە لە سوننەتی راست و صەحیحی پێغەمبەرەکەیدا (صلى الله عليه وسلم) هاتووە؛ ئەوەی کە ئاشکرایە ئەوەشی کە نهێنی و شاراوەیە، خۆبەدەستەوەدانی تەواوە بۆ ئەو دوو سەرچاوە کە بریتن لە قورئان و سوننەت، ملکەچبوون بۆ حوکم و بڕیارەکانی ئەو دوانە، کردەوەکردنە بەوەی ئەو دوانە داوای دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا﴾ سورة الأحزاب: ٣٦.

واتە: بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی موسوڵمان نیە کاتێ خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری هەر کارێکیان دا(بۆیان نیە) سەرپشك بن لە کارەکەیاندا، هەرکەس سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بەڕاستی گومڕابووە بە گومڕابونێکی ئاشکرا.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ، لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا: كِتَابَ اللهِ وَسُنَّةَ رَسُولِهِ)[1]. واتە: دوو شتم بۆ بەجێهێشتون ئەگەر دەستیان پێوە بگرن هەرگیز لەپاش ئەوە گومڕا نابن: بریتین لە کتێبەکەی خواو سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم).

---

(١) – صحيح: رواه الحاكم في: (المستدرك)، وصححه الألباني في (المشكاة).

ئەهلی سوننە و جەماعە: هەرگیز نالّێن یەکەم جار قورئان لەپاشدا سوننەت، بەلّکو دەلّێن قورئان و سوننەت بەیەکەوە، چونکە خوای گەورە قورئان و سوننەتی پێکەوە باسکردووە لە زۆرێك لە بەلّگەکاندا، گوێڕایەلّی خۆی و گوێڕایەلّی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) فەرز کردووە لەسەر بەندەکانی.

سوننەتی پێغەمبەرە ئەمین و دەست پاکەکەی (صلی الله علیه وسلم) رونکەرەوەیە بۆ ئەو مەبەست و مانایەی کە خوای گەورە خۆی دەیەوێت لە قورئانە پیرۆز و شکۆمەندەکەیدا، لە شەرعە حەکیم کاربەجێکەیدا، هەرگیزاو هەرگیز بۆ هیچ کەسێك نیە – جا ئەو کەسە هەرکەسێك بێت و لەهەر پلەو پایەیەکدا بێت – پێچەوانەی سوننەت بکات لەدوای ئەوەی کە پێی دەگات، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل: ٤٤.

واتە: قورئانمان بۆ تۆ نارد بۆ ئەوەی روونی بکەیتەوە بۆ خەلّکی ئەوەی بۆیان نێردراوەتە خوارەوە، بەلّکو بیربکەنەوە و تێ بگەن.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

پێیان وایە بە پێویستی دەزانن شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و سوننەتەکەی لەهەموو شتێکدا ئیتر ئەو شتە گەورە بێت یان بچوك، هەروەها خۆبەدەستەوەدان بە سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)؛کە رێگەی رەحمەت و بەزەیی و رزگاری و سەرکەوتن و بەدەستهێنانی رەزامەندی خوای بەرز و بلّندە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ﴾ سورة الأعراف: ١٥٦ – ١٥٧.

واتە: بەزەیی و رەحمەتیشم هەموو شتێکی گرتۆتەوە، جا لەدوایی دا ئەو (بەزەیی یەم) دەنوسم بۆ ئەوانەی پارێزکار و لەخوا ترسن و زەکات دەدەن، ئەوانەش کە بڕوا بەبەڵگەو نیشانەکانی ئێمە دێنن. ئەوانەی کە شوێن پێغەمبەر و نێردراوی نەخوێندەوار دەکەون (کە لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووە)، ئەو کەسەی کە(نامە دارەکان) دەیبینن بە نوسراویی لایانە لە تەورات و ئینجیل دا.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

لەدوای سوننەتی پێغەمبەرەکەیان (صلى الله عليه وسلم) شوێنی ئەوە دەکەون کە صەحابەکان لەسەری بوون رەزای خوایان لیّ بیّ، ئەوانەی کە دینەکەیان وەرگرت لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەپاکی و بە دڵسۆزی و بە زانست و بە کردەوە؛ لە کۆچکەران و یاریدەدەران بەگشتی، لە خەلیفە راشدینەکان بە تایبەتی؛ لەبەرئەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەسیەتی کردووە بە شوێنکەوتنی خەلیفە راشدینەکان بە تایبەتی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە دەفەرموێت:

(عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي، وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الْمَهْدِيِّينَ الرَّاشِدِينَ؛ تَمَسَّكُوا بِهَا، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ؛ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ)(١).

واتە: ئاگاداربن پێویستە لەسەرتان دەستبگرن بە سوننەتی منەوە، دەستبگرن بە سوننەتی خەلیفە رێنمویی کراوەکان و راشیدینەکانەوە، بە توندی دەستی پێوە بگرن، بە خرێکانتان قەپی پێدا بکەن، ئاگاداربن لەو شتە تازانەی کە لە ديندا دادەهێنرێن، بێگومان ئەو شتە تازە داهێنراوانە بیدعەن، هەموو بیدعەیەکیش لەدیندا گومڕاییە.

---

(١) – (صحيح سنن أبي داود) للألباني.

لەپاشدا شوێنی ئەو کەسانە دەکەون کە لەدوای صەحابەکانەوە هاتوون، لەو سێ چەرخ و سەردەمە زێڕین و گەورەی سەرەتای هاتنی دینی ئیسلام، کە ئەوانیش بریتین لە صەحابەکان خۆیان و (تابعین)شوێنکەوتوان و، شوێنکەوتوانی (تابعین) لە چاکەدا، ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەربارەیان دەفەرموێت:

(أُوصِيكُمْ بِأَصْحَابِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)(١).

واتە: وەسیەتان بۆ دەکەم کە دەستبگرن بە ڕێگەو ڕێبازی هاوەڵانی منەوە، پاشان ئەوانەی کە لەدوای ئەوانەوە دێن، پاشان ئەوانەی کە لەدوای ئەوانیشەوە دێن کە (تابعین)ن.

لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (تَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً؛ كُلُّهُمْ فِي النَّارِ إِلاَّ مِلَّةً وَاحِدَةً). قَالَ: مَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (مَا أَنَا عَلَيْهِ وَأَصْحَابِي)(٢).

واتە: (ئوممەتەکەی من دابەش دەبێت بۆ حەفتاو سێ بەش، هەموویان بۆ ناو ئاگرن تەنها یەك بەشیان نەبێت). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کێ یە؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە من و هاوەڵانم لەسەرینی).

ئا لەم ڕووەو کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆی داناوین؛ ئەهلی سوننە و جەماعە تاکە (مرجع)سەرچاوەیان بۆ گەڕانەوە سەری لەکاتی ناکۆکی و دووبەرکی و جیاوازیدا کتێبەکەی خوای گەورە و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی (صلى الله عليه وسلم)، خوای گەورە دەفەرموێت:

(١) – (صحيح سنن الترمذي) للألباني.
(٢) – صحيح سنن الترمذي للألباني.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْۖ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾ سورة النساء: ٥٩.

واتە: ئەی کەسانێك کە باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن، پاشانیش گوێڕایەڵی کاربەدەستە (عادیلە)کانی خۆتان بن، جا ئەگەر دووبەرەکیتان هەبوو لەشتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر، ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی، ئەوە باشترە، ئاکام و ئەنجامی چاکترە.

بەڕاستی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) (مرجع)سەرچاوەی ئەهلی سوننە و جەماعەن بۆ تێگەیشتن لە قورئان و سوننەت، لەبەرئەوە ئەوان شایەت حاڵی دابەزینی قورئان بوون، لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ژیان، لە بنچینەکانی دیندا هیچ جیاوازیەکیان نەبووە لە نێواندا؛ ئەوان زاناترین کەسن بە مەبەست و موورادی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم)؛خوای گەورە شوێن نەکەوتنی ئەوانی کردووە بە هۆکاری سزاو تۆڵەو گومڕایی و دژایەتی و ناکۆکی و دووبەرکی و جیاوازی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴾ سورة النساء: ١١٥.

واتە: هەرکەسێك دژایەتی پێغەمبەر بکات پاش ئەوەی کە ڕێبازی ڕاستی بۆ ڕوون بوویەوە و شوێنی ڕێگایەکی تر بکەوێ بێجگە لەڕێگای بڕواداران، ڕووی وەردەگێڕین بۆ ئەو ڕێبازەی کەهەڵی بژاردووەو دەیخەینە دۆزەخ، ئای چ پاشەڕۆژێکی خراپە.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

هیچ کاتێ لانادەن لە دەقێکی صەحیح و راست و دروست، هەرگیز لە هیچ کارو بڕیارێکدا پێشی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) ناکەون، هیچ کاتێ دژایەتی و بەرهەڵستی شتێ ناکەن لە قورئان و سوننەتی صەحیح؛ بە عەقڵی خۆیان، بە (قیاس)پێوەر، بە زەوق – بڵێ زەوقی من وا دەخوازێت – ، بە کەشف– بڵێ بە کەشف بۆم رون بۆتەوە –، بە وتەی شێخ ، بە وتەی پێشەوا، بە داواکردنی زۆرینە، لەبەئەوە دینی خوا تەواو بووە لەژیانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، خوای گەورە لەوبارەوە دەفەرموێت:

﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ سورة المائدة:٣.

واتە: ئەمرۆ ئایینەکەتانم تەواو (کامڵ) کردووە بۆتان و چاکەو بەهرەی خۆم بەتەواوی رشتووە بەسەرتانداو رازی بووم کەئیسلام دینتان بێت.

ئەهلی سوننە و جەماعە قسەی هیچ کەسێك لە دروستکراوان ناخەنە پێش کەلام و فەرمودەی خوای گەورە و فەرمودەی پێغەمبەرە دەست پاك و ئەمینەکەی (صلی الله علیه وسلم)، ئیتر ئەو کەسە هەر کەسێك بێت و لەهەر پلەو پایەیەکدا بێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾ سورة الحجرات:١.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە پێش مەکەون لە هیچ کارو بڕیارێکدا لەخواو پێغەمبەرەکەی و لەخوا بترسن، بێ گومان خوا بیسەری زانایە.

ئەهلی سوننە و جەماعە بیروباوەڕیان وایە پێشکەوتنی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی هۆکارە بۆ گومڕابون، لەبەرئەوەی ئەو پێشکەوتنە هەواو ئارەزوە، قسەکردنە بەناوی خواوە بەبێ زانست و زانیاری، بریتیە لە رازاندنەوەی شەیتان بۆ رێگرتن لەرێگەی خوای بەرز و بڵند، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾ سورة الجاثية: ٢٣.

واتە: ئاخۆ بینیوتە ئەو کەسەی هەواو ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی، خواش بەزانایی گومڕای کرد و مۆری ناوە بەسەر گوێ و دڵیدا و پەردەی داوە بەسەرچاویدا، دەی جگە لە خوا کێ ڕێنموونی دەکات، دەی بۆچی بیر ناکەنەوە.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

دەڵێن ئەقڵی رون و تەواو لەگەڵ نەقڵی راست و صەحیح هاوڕێك و تەبان و دژایەتی یەکتر ناکەن، بەڵام کاتێ کە کێشەیە یان دژایەتییەك رویدا ئەو کاتە نەقڵە راستەکە پێش دەخەن، ئەسڵەن هیچ کێشەو دژایەتییەکیش نیە لەنێوانیاندا، چونکە هەرگیز ناگونجێ نەقڵی راست شتێ بهێنێ مەحاڵ بێ ئەقڵی رون قبوڵی بکات، بەڵکو نەقڵ بەو شێوەیە دەیهێنێ هۆکارێکە بۆ زیاتر رۆشنبونەوەی ئەقڵەکان، ئەقڵی رون و تەواو هەرچی نەقڵی راست هەواڵی دابێ بە راستی؛ لەبەرئەوە کە نەقڵ لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە، پێچەوانەکەی نابێت واتە ئەقڵ شوێن ئەقڵ ناکەوێت.

ئەهلی سوننە و جەماعە؛ لە پلەوپایەی ئەقڵ و پێگەکەی کەم ناکەنەوە، لەبەرئەوە عەقڵ هۆکاری تەکلیف و پێ سپاردنە، رۆڵی عەقڵ بریتیە لەرەزامەندی و دڵنیایی بون، بریتیە لە بیرکردنەوە و رامان لەم گەردونە فراوان و بەرینە، لەشەرعی حەکیم و کاربەجێ، بەڵام دەڵێن: هەرگیزاو هەرگیز ئەقڵ پێشی شەرع ناکەوێت، بەڵکو عەقڵ کاردەکات لە چوارچێوە و بازنەو بڕیاری شەرعدا، چونکە خوای گەورە سنورێکی بۆ عەقڵ دیایکردووەو سنور نابەزێنێت، کەواتە ناگونجێ کەموکورت پێش بکەوێ و حاکم و دادوەر بێت بەسەر کامل و تەواودا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ ۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ سورة القصص: ٥٠.

واتە: ئینجا ئەگەر بەگوێیان نەکردی و (وەڵامیان نەدایەوە) ئەوە بزانە کەتەنها شوێن هەواو ئارەزوی خۆیان دەکەون، کێ لەو کەسە گومڕاترە کەشوێن ئارەزووی خۆی بکەوێت بێ ڕێنموونیی لەلایەن خواوە، بێگومان خوا ڕێنموونیی گەلی ستەمکار ناکات.

هەر لەبەر ئەوەیە بە ئەهلی سوننە و جەماعە ناسراون؛ لەبەر دەست پێوە گرتنیان و شوێنەکەوتنیان و خۆبەدەستەوەدانی ڕەهایان؛ بۆ ڕێگەو ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و سوننەتەکەی لە هەموو شتێکی گەورەو بچوکدا، کردەوە کردن بەو سوننەتە ئاشکراو نهێنی چۆن بێت بەو شێوەیە شوێنی دەکەون، شوێنکەوتنی کۆمەڵ و جەماعەتی موسوڵمانان، خوای بەرز و بڵند دەفەرموێت:

﴿ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ ﴾ سورة النور: ٥١ – ٥٢.

واتە: قسەی ئیمانداران تەنها ئەمەیە کاتێ بانگ بکرێن بۆ لای (بەرنامەی) خواو پێغەمبەرەکەی بۆ ئەوەی بڕیاربدات لەنێوانیاندا، دەڵێن بیستمان و گوێڕایەڵین، هەر ئەوانەن ڕزگار بووان. جا هەر کەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، لەخوا بترسێ و خۆی لە(سەرپێچی) خوا بپارێزێ، ئەوە بەڕاستی هەر ئەوانە سەرکەوتوون.

سەرچاوەی ئەهلی سوننە و جەماعە بۆ وەرگرتنی دینەکەیان لەپاش قورئان و سوننە؛ بریتیە لەوەی کە پێشەوایانی دین لەسەری کۆبونەتەوە، زانایانی ئیسلام کە عالمن بە گوێرەی قورئان و سوننەت کاردەکەن، لەو پێشەوایانەی کە شایەتی پێشەوایەتی و فەزڵ و گەورەیی و شوێنکەوتنی سوننەت و پێشەوایەتیان لەو بوارەدا بۆ دراوە، دورکەوتنەوەیان لە بیدعەو هۆشیاریدان لێی، لەوانەی کە زانایانی

ئوممەتی ئیسلامی رێك و تەبان لەسەر پێشەوایەتیان و، گەورەیی و شکۆمەندی پلەوپایەیان لەدین دا، پشتی پێ دەبەستن واتە پشت دەبەستن بە کۆدەنگی زانایان، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

(إن اللهَ لا يَجْمَعُ أمَّتِي عَلى ضَلاَلَة، وَيَدُ الله مَع الجَمَاعَة، ومَنْ شَذَّ شَذَّ فِي النَّار)[1].

واتە: بەڕاستی خوای گەورە ئوممەتەکەم لەسەر گومڕایی کۆناکاتەوە، دەستی خوای پەروەردگار لەسەر کۆمەڵ و جەماعەتەوەیە، ئەوەی تاك ببێتەوە ئەوە بۆ ئاگری دۆزەخ تاك دەبێتەوە.

ئەم ئوممەتە سەربڵند و پیرۆز و موبارەکە، پارێزاروە هەرگیز لەسەر گومڕایی و ناڕەوایی کۆنابێتەوە، بە هیچ شێوەیە لە شێوەکان ناگونجێ؛ هەرگیزاو هەرگیز کۆنابنەوە لەسەر گومڕایی واز ناهێنن لە هەقی رون.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە هیچ کەسێك پارێزراو نیە لە هەڵەو تاوان جگە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئیتر ئەو کەسە هەر پێگەیەکی هەبێت لەدین دا، هەرچەندە پلەوپایەی بەرز بێت لە زانست و زانیاری دا، بە تەواوی باوەڕیان بە کۆشش(الأجتهاد)کردن نیە لەگەڵ بونی دەقی رون و ئاشکرادا.

بەڵکو باوەڕیان وایە کۆشش(إجتهاد)کردن لەو ئەحکام و بڕیارانەدا دەبێت کە جێگەو شوێنی کۆشش(إجتهاد)ە، یان لەو بابەتانەی حوکمەکانیان شاراوەیەو رون نیە، ئا لەو کاتەشدا بە ئەندازەی پێویست کۆشش(إجتهاد) دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کاتێ دەمارگیری نایانگرێ بۆ راوبۆچونی هیچ کەسێك، تا قسەکەی رێك و تەبا نەبێت لەگەڵ قورئان و سوننەدا.

(١) - (صحيح سنن الترمذي) للألباني برقم: ١٧٥٩.

باوەڕیان وایە کە موجتەهید دەبێ ئامادەکاریەکانی کۆشش(إجتهاد) کردنی تێدا بێتەجێ، ئەوکاتە بۆی هەیە کۆشش(إجتهاد) بکات، لەشارەزابون بە (ناسخ و منسوخ، خاص و عام، مطلق و مقید) واتە دەبێ شارەزای بنەماکان(أصول)ی فیقه بێت، دەبێت شارەزایی لە بەڵگەکاندا هەبێت بە فراوانی ئەو بەڵگانەی لە قورئان و سوننەتدا هەیە، دەبێت شارەزایی هەبێت لە کۆدەنگی و یەکڕایی زانایان و، (قیاس)پێوەر و، بنەماکانی فیقه و، وتەی هەوەڵان و، هەروەها دەبێت شارەزایی باشی هەبێت لە زمانی عەرەبی دا، لەپاشدا بەم ڕێکخەر(ضوابط)ە شەرعیانە دەتوانێت کۆشش(الإجتهاد) بکات؛ لەگەڵ ئەمانەشدا موجتەهید دەپێکێت و هەڵەش دەکات؛ ئەگەر پێکای دوو پاداشتی بۆ هەیە: پاداشتی کۆشش کردنەکەی و پاداشتی پێکانەکەی، ئەگەر نەشی پێکا تەنها پاداشتێکی بۆ هەیە، ئەویش بریتیە لە پاداشتی کۆشش کردنەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ سورة النساء:٨٣.

واتە: کاتێك هەواڵێکیان پێ بگات دەربارەی ئاسایش و هێمنایەتی یان لەبارەی ترسەوە بڵاوی دەکەنەوە، بەڵام ئەگەر بیانگەڕانایەتەوە بۆ لای پێغەمبەر و بۆ لای کاربەدەستانی خۆیان، ئەوە ئەوانەی ڕاستی هەواڵەکان دەردەهێنن دەزانن هەواڵەکە (ڕاستە یان درۆیە) ، ئەگەر چاکەو بەزەیی خوا نەبوایە بەرامبەر بەئێوە بێ گومان شوێن شەیتان دەکەوتن کەمێکتان نەبێت.

جیاوازی و ڕاجیایی لە بابەتە (إجتهاد)یەکاندا لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە نابێتە هۆکاری دوژمنایەتی و ناکۆکی و ڕق و کینەو دەنگ لێك وەرگرتن پێویست بەوە ناکات؛ بەڵکو هۆکارێکە بۆ ئەوەی هەندێکیان هەندێکیانیان خۆش بوێت،

هۆکارێکە بۆ ئەوەی هەندێکیان دۆستایەتی هەندێکیان بکەن، لەدوای یەکترەوە نوێژ دەکەن، لەگەڵ جیاوازی و راجیایشیان لەسەر هەندێ بابەتە لاوەکیەکان.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾ سورة الأنفال: ٤٦.

واتە: (باوەڕداران) گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بکەن، جیاوازمەبن و دوویەرەکی مەکەن بەهۆیەوە بشکێن و لاوازبن و هێزتان برواو نەمێنێ، خۆڕاگر بن بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆگراندایە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ ﴾ سورة الأنعام: ١٥٩.

واتە: بەڕاستی ئەوانەی ئاینەکەیان بەش بەش کردو بوون بەچەند دەستەو تاقمێکەوە، تۆ لەهیچ شتێکدا لەئەوان نیت، بێگومان کاری ئەوان تەنها بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە، پاشان خوا هەواڵیان پێ دەدا بەهەر کردەوەیەك کەکردویانە.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

هیچ کەسێ لە موسوڵمانان پەیوەست ناکەن بە مەزهەبێکی فیقهی دیاریکراوەوە، هەرچەندە لایان وایە هیچی تێدا نیە ئەگەر لەڕووی شوێنکەوتنەوە بێت نەك لاسایکردنەوە(تقلید)[1].

---

* التقليد: هو (التزام المكلف في حكم شرعي مذهب من ليس قوله حجة في ذاته) أو هو قبول قول القائل من غير معرفة لدليله، أو الرجوع إلى قول لا حجة لقائله عليه. والمقلد: هو الذي يقلد شخصاً بعينه، وفي جميع أقواله أو أفعاله، ولا يرى ان الحق يمكن ان يكون فيما عداه، ومن غير أن يعرف دليله، ولا يخرج عن أقواله، ولو ثبت له عكس ذلك، ولا خلاف بين أهل العلم أن التقليد ليس بعلم، وأن المقلد لا يطلق عليه اسم عالم.

ولقد ذم الله – عز وجل – التقليد ونهى عنه في كثير من الآيات، فقال تعالى: { وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلاَ يَهْتَدُونَ }المائدة: ١٠٤.

وعلماء السلف والأئمة المجتهدون جميعاً نهوا عن التقليد، لأن التقليد أحد أسباب الضعف والتنازع بين المسلمين، والخير في الوحدة والاتباع والرجوع في الخلاف إلى الله وإلى رسوله ولذلك لم نر الصحابة – رضي الله عنهم – يقلدون

پێویستە لەسەر هەر موسوڵمانێکی راستگۆ کە بەشوێن رەزامەندی خوای پەروەردگاردا دەگەڕێت بە شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مەزهەبێکەوە بگوێزێتەوە بۆ سەر مەزهەبێکی تر لەبەر بەهێزی بەڵگەی و (تەرجیح) دانی.

پێویستە لەسەر فێرخوازی زانستی شەرعی ئەگەر ئەهلی ئەو مەیدانە بوو توانای تەماشاکردن و لێکدانەوەی بەڵگەکانی زانا تێکۆشەرە باوەڕپێکراوەکانی هەبوو، ئەوە پێویستە لەسەری کار بەو زانستە بکات کە هەیەتی، لە بابەتێکدا لە مەزهەبی پێشەوایەکەوە بگوازێتەوە بۆ سەر مەزهەبی پێشەوایەکی تر - لەبەر بەهێزی بەڵگەی ئەو مەزهەبەو (تەرجیح) دانی - لە بابەتێکی تردا، دروست نیە بۆ فێرخوازی زانستی شەرعی شوێن وتەی هیچ کەسێك بکەوێت بەبێ ئەوەی بەڵگەی بزانێ؛ لەبەرئەوە ئەگەر ئەو کارە بکات دەبێتە کەسێکی لاسایی کەرەوە(مقلد)، هەروەها پێویستە لەسەری هەرچی لەتوانایدایە بیخاتەگەڕ لە تێڕوانین لەو بابەتانەی کە زانایان تێیدا جیاوازن و لەو بەڵگانەی کە زانایان بۆ ئەو بابەتانە کردویانە بە بەڵگەی بابەتەکانیان، تا شتێکی لە بابەتەکەدا لا کەڵەکە دەبێ و هەق

---

أحداً منهم بعينه في جميع المسائل، وكذلك الأئمة الأربعة - رحمهم الله - لم يتعصبوا لآرائهم وكانوا يتركون آراءهم لحديث رسول الله صلى الله عليه وسلم وينهون غيرهم عن تقليدهم دون معرفة أدلتهم. قال الإمام أبو حنيفة رحمه الله : (إذا صح الحديث فهو مذهبي) وقال: (لا يحل لأحد أن يأخذ بقولنا ما لم يعلم من أين أخذناه).

وقال الإمام مالك رحمه الله: (إنما أنا بشر أخطئ وأصيب، فانظروا في رأيي؛ فكل ما وافق الكتاب والسنة فخذوه، وكل ما لم يوافق الكتاب والسنة فاتركوه).

وقال الإمام الشافعي رحمه الله: (كل مسألة صح فيها الخبر عن رسول الله صلى الله عليه وسلم عند أهل النقل بخلاف ما قلت؛ فأنا راجع عنها في حياتي وبعد موتي).

وقال الإمام أحمد رحمه الله: (لا تقلدني ولا تقلد مالكاً ولا الشافعي ولا الأوزاعي ولا الثوري، وخذ من حيث أخذوا). وأقوالهم في هذا الباب كثيرة، لأنهم كانوا يفقهون معنى قوله تعالى : { اتَّبِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلاَ تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء قَلِيلاً مَّا تَذَكَّرُونَ } سورة الأعراف: الآية، ٣.

و راستێتی بۆ دەردەکەوێ دەڵێ رای راجح لەم بابەتەدا بەم شێوەیەیە، جا ئەگەر نەیتوانی ترجیح بدات واتە راسترینی بەڵگەکان دیاری بکات ئەو کاتە حوکمەکەی دەبێتە حوکمی عامی نەخوێنەوار؛ ئەو کاتە پرسیار لە زانایان دەکات.

ئەو کەسەی کە عەوامە واتە نەخوێندەوارە ناتوانێ بڕوانێتە بەڵگەکان و توانای تەماشاکردن و لێکدانەوەی نیە، ئەوە مەزهەبی نیە، بەڵکو مەزهەبەکەی مەزهەبی موفتیەکەیەتی، بۆیە پێویستە لەسەری مشوری پرسیارکردن بخوات، پرسیار لەو کەسانە بکات کە متمانەی بە زانست و زانیاری و دین و ئەمانەت پارێزییان هەیە، پێویستە لەسەری پرسیار بکات لە زانا خواناسە خۆپارێزە صالح و چاکەکان ئەوانەی کە خاوەنی زانست و زانیارین و کار بە قورئان و سوننەت دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ النحل: ٤٣.

واتە: دەی پرسیار بکەن لەزانایان ئەگەر ئێوە نازانن.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

دروست نیە شوێنکەوتنی رێ پێدراوەکان(رخص) بەبێ بەڵگەی شەرعی تەرجیح دراو، دروست نیە لاسایی کردنەوەی زانایەکی باوەڕپێکراو، رێگرییان کردووە لە کۆکردنەوەی چەند راو بۆچونێکی جیاواز لە بابەتێکدا بەبێ مەبەستی پێکانی راوبۆچونی راست و دروست، چونکە شوێنکەوتنی رێ پێدراوەکان(رخص) دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی تەکلیف و ئەرکە شەرعیەکان و خۆدەرباز کردن لێیان، ئەمەش بریتیە لە کارکردن بە هەواو ئارەزوو بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەکی شەرعی، بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە ئەمەیان کردووە بە رێگەیە لە بابەتە جیاوازەکاندا.

**ئەهلی سوننە و جەماعە،**

**باوەڕیان وایە کە تێگەیشتن لەدین جێگیر و تەواو نابێت بە زانست و کردەوە نەبێت پێکەوە؛ هەرکەسێ زانستێکی زۆری دەست خست، بەڵام کردەوەی پێ نەکرد، یان لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەدەڕۆیشت و کاری بە سوننەتەکانی نەدەکرد، ئەوە فەقیە نیەو لەدین تێ نەگەیشتوە، لەبەرئەوەی دەقەکانی قورئان و سوننە جەختیان کردۆتەوە لەسەر واجبی پێکەوە گرێدانی زانست و کردەوە، هۆشیاری دەدا سەبارەت بە جیاکردنەوەی زانست و کردەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴾ الصف: ١ – ٢.

**واتە: بە پاکی و بێگەردی یادی خوا دەکات هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەوی دایە، ئەو زاڵی کاربەجێ یە. ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بۆچی ئەوی ئەیڵێن ئەنجامی نادەن.**

**خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ سورة البقرة: ٤٤.

**واتە: ئایا فەرمان بەسەر خەڵکدا دەدەن بە چاکە؟ خۆتان فەرامۆش دەکەن، (لەگەڵ ئەمەشدا) کە ئێوە دەوری پەڕاوەکە(تەورات) دەکەنەوە، دەی ئایا ژیرنابن و تێ ناگەن.**

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێك وەرگرتن و فێربونی زانستی بەسود؛ بە پێی توانای خۆی، ئەوەی کە مرۆڤ بە هۆیەوە پەروەردگاری خۆی پێ دەناسێ، دینە راستەکەی، پێغەمبەرە ئەمین و دەست پاکەکەی (صلی الله علیه وسلم)، بە هۆیەوە شارەزای ئەوە ببێت چۆن پەروەردگاری بناسێ، بەهۆی ئەو زانستەوە رەزامەندی خواو بەهەشتەکەی بەدەست بهێنێ، چۆن خۆی بەدور بگرێت لە تورەیی و خەشم سزاو سەخت و بە ئازارەکەی، لەبەرئەوە زانستی بە سود پێشەوای کردەوەی چاکە، کردەوەکردن راست و دروست نیە بەبێ زانستی راست و دروست، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا الْأَلْبَابِ ﴾ سورة الزمر: ٩.

واتە: (ئەی موحەممەد) بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن، بەڕاستی تەنها خاوەنانی ژیریی ئامۆژگاری وەردەگرن.

هەروەك پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە شیاوەو ئامادەباشە فێری زانستی بەسود ببێ، بڵاوکردنەوەی ئەو زانستە بەسودە بە هەموو هۆکارێکی رێ پێدرا و رەوا، فێرکردنی ئەو کەسەی کە نایزانێت، دروست نیە شاردنەوەی هیچ شتێ لە زانستی راست و دروست، بەتایبەتی ئەگەر پرسیاری لێ کرا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَبَيَّنُوا فَأُولَٰئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾ سورة البقرة: ١٥٩ - ١٦٠.

واتە: بێگومان ئەوانەی دەیشارنەوە ئەوەی کە ناردومانەتە خوارەوە لە ئایەتانی رۆشن و رێنمایی، دوای ئەوەی رونمان کردۆتەوە بۆ خەڵك لە نامەی

(تەورات و ئینجیل)دا، ئەوانە خوا نەفرەتیان لیٚ دەکات، نەفرەتکەرانیش نەفرەتیان لیٚ دەکەن. مەگەر ئەوانەی کە پەشیمان بوبنەوە و کردەوەی چاکیان کردبیٚ و (ئەوەی شاردبویانەوە) ئاشکرایان کردبیٚ، ئا ئەوانە پەشیمانیانیان لیٚ گیرا دەکەم، هەر منم گیراکەری میهرەبان.

## بنچینەی هەشتەم

## پێویستێتی گوێڕایەڵیکردنی کاربەدەستانی موسوڵمانان لەچاکەدا

**لە بنچینەکانی عەقیدەی سەلەفی صالح، ئەهلی سوننە و جەماعە:**

ئەوان باوەڕیان وایە کە پێویستە پێشەوایە دانێن بۆ موسوڵمانان، بۆ پاراستنی کۆمەڵی موسوڵمانان و شکۆمەندی ئیسلام، بۆ پیادەکردن و جێگیرکردنی دین، بۆ جێبەجێکردنی حەدە شەرعیەکان، بۆ هەڵسوڕاندن و بەڕێوەبردنی کاروباری موسوڵمانان، بۆ بەجێهێنانی مافەکان و هێنانەدیان، حوکم کردن بەوەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە، بۆ فەرمان کردن بە چاکەو، ڕێگریکردن لە خراپە و تاوان، بۆ بانگەواز کردن بۆ لای خوای گەورە، باوەڕیان وایە کە بیستن و گوێڕایەڵی کردنی بۆ پێشەوای موسوڵمانان پێویستە، هەروەها بۆ ئەو کەسەش کە پێشەوای موسوڵمانان دەیکات بە کاربەدەست بەسەر موسوڵمانانەوە، تا ئەوکاتەی فەرمان نەکەن بە خراپە گوێڕایەڵی کردنیان واجبە، خۆ ئەگەر هاتو فەرمانیان کرد بە خراپەو تاوان؛ ئەوا دروست نیە گوێڕایەڵیان لەو خراپەیەدا، بەڵام بەگشتی گوێڕایەڵی کردنیان لەچاکەدا هەر دەمێنێتەوە، لەبەر کردەوە کردن بەم فەرمایشتەی خوای گەورە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴾ سورة النساء: ٥٩.

واتە: ئەی کەسانێك کە باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن، پاشانیش گوێڕایەڵی کاربەدەستە (عادیلە)کانی خۆتان بن، جا ئەگەر دووبەرەکیتان هەبوو لەشتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی ئەوە باشترە،

ئاکام و ئەنجامی چاکترە. لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت:

(مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللهَ، وَمَنْ يُطِعْ الأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ الأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي)(١).

واتە: هەرکەسێ گوێڕایەڵی من بکات، ئەوە گوێڕایەڵی خوای گەورەی کردووە، هەرکەسێ سەرپێچی من بکات، ئەوە سەرپێچی خوای گەورەی کردووە، هەرکەسێ گوێڕایەڵی کاربەدەست بکات، ئەوە گوێڕایەڵی منی کردووە، هەرکەسێ سەرپێچی کاربەدەست بکات، ئەوە سەرپێچی منی کردووە.

لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت:

(اسْمَعُوا وأَطِيعُوا، وَإِنِ اسْتُعْمِلَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ، كَأَنَّ رأْسَهُ زَبِيبَةٌ)(٢).

واتە: بیبیستن و گوێڕایەڵی بکەن، ئەگەر بەندەیەکی حەبەشی کرا بە کاربەدەست و سەرپەرشتیارتان.

لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت:

(تَسْمَعُ وَتُطِيعُ لِلأَمِيرِ، وَإِنْ ضُرِبَ ظَهْرُكَ وَأُخِذَ مَالُكَ؛ فَاسْمَعْ وَأَطِعْ)(٣). واتە: گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری ئەمیر و فەرمانڕەوا بە، ئەگەر لە پشتیشت درا وماڵیشت برا، ئەوا بیستەو گوێڕایەڵ و فەرمانبەردار بە.

لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت:

(مَنْ كَرِهَ مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا فَلْيَصْبِرْ عَلَيْهِ؛ فَإِنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ خَرَجَ مِنَ السُّلْطَانِ شِبْرًا؛ فَمَاتَ عَلَيْهِ إِلاَّ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً)(٤). واتە: هەرکەسێ لە ئەمیر و فەرمانڕەواکەی شتێکی بینی

---

(١) – متفقٌ عَلَيْهِ، أخرجه البخاري: ٩/٧٧ ( ٧١٣٧ )، ومسلم: ٦/١٣ ( ١٨٣٥ ) ( ٣٢ ).

(٢) – رواه البخاري: ٩/٧٨ ( ٧١٤٢ ) .

(٣) – رواه مسلم: (١٨٤٧).

(٤) – رواه مسلم: (١٨٤٩).

بەدڵی نەبوو ئەوە با ئارام بگرێت لەسەری؛ چونکە هیچ کەسێ لەخەڵك نیە یەك بست دەرچوبێ لە فەرمانی کاربەدەست و دەسەڵاتداری موسوڵمانان؛ لەسەر ئەو حاڵەتە بمرێت ئەوە بە مردنێکی نەفامانە مردووە.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

باوەڕیان وایە کە گوێڕایەڵی کردنی کاربەدەست و فەرمانڕەوای موسوڵمانان لە چاکەدا، لە چاکترین گوێڕایەڵی کرنەکانە و لەو هۆکارانەیە کە مرۆڤ دەتوانێت خۆی لە خوای گەورە پێ نزیك بکاتەوە، لە گەورەترینی واجباتەکانە لەسەر ژێردەستەکان(رعية)، بریتیە لە بنچینەیەکی گەورەو شکۆمەند لە بنچینەکانی عەقیدەو باوەڕهێنان، هەر لەبەر ئەوەیە پێشەوایانی سەلەفی صالح خستویانەتە ناو بابەت و باسەکانی بیروباوەڕەوە – واتە باسی گوێڕایەڵی کاربەدەستی موسوڵمانان – ، کەم کتێب هەیە لە کتێبەکانی بیروباوەڕی زاناو پێشەواکانی سەلەفی صالح ئەهلی سوننەو جەماعە خاڵی بێ لەم باسە، ئیللا کتێبەکانیان ئەم بابەتەیان لەخۆگرتووەو هێناویانە بە شێوەیەکی رێکوپێك و بە چاکی باسیان کردووە، بە چاکی راڤەیان کردووە، بە چاکی رونیان کردۆتەوەو بەیانیان کردووە بۆ خەڵك تا بزانن چۆن هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ پێشەوای خۆیاندا، ، ئەمەش بریتیە لە واجبێکی شەرعی لەسەر هەموو موسوڵمانێك؛ چونکە پایەیەکە لە پایەکانی فەرمانڕەوایی و حوکمڕانی و، بناغەیەکە لە بناغەکانی سیستەمی رژێم و دەسەڵاتەکەی، کە ئەوەش بریتیە لە کارێکی بنەڕەتی و گرنگە بۆ بوونی رێکوپێکی لە دەوڵەتی ئیسلامدا، جێگیرکردنی ئەو ئامانجانەی کە لە پێناویدا دانراوە، بەجێهێنانی مەبستە شەرعیەکان.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

بیروباوەڕیان وایە کە دروستە موسوڵمانان لەدوای کاربەدەست و فەرمانڕەواکانەوە نوێژی بە کۆمەڵ و نوێژی هەینی و نوێژی جەژنەکان بکەن، هەروەها فەرمان کردن بە چاکەو، رێگری کردن لە خراپەو تاوان و، جیهادو تێکۆشان و حەج کردن لەگەڵیان دروستە ئیتر چاکەکار بن یان خراپەکار بن، باوەڕیان وایە کە دوعای چاکێتی و چاکسازی و هیدایەتیان بۆ بکرێت، دروستە ئامۆژگاری کردنیان[١]، رێنماییان کردنیان بۆ رێگەی هەق، یادخستنەوەیان بە هێمنی و لەسەرخۆیی، دەبێ دڵی خەڵکیان بۆ نەرم بکرێت تا گوێڕایەڵییان بکەن، هەتا ئەو کاتەی شتێ لە بنچینەو بنەماکانی ئیسلام و دین نەگۆڕن.

ئەهلی سوننە و جەماعە؛ لە فەرمان دەرچونیان و بەرەنگار بونەوەیان بە چەك و شمشێر قەدەغەدەکەن، ئەگەر سەرپێچیەکیان کرد بەڵام سەرپێچیەکەیان نەگەیشتە رادەی بێ باوەڕبون، فەرمان دەکەن بەوەی ئارام بگرن لەسەر ئەوە هەتا بێ باوەڕبونی ئاشکراو رون(کفر بواح)یان لێ دەرنەچێت ئەگەر (کفر بواح)یان لێ دەردەکەوت ئەوا گوێڕایەڵییان ناکرێت؛ لەبەر فەرمان کردنی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بە گوێڕایەڵی کردنیان لەکارێکدا کە سەرپێچی و تاوان نەبێت، فەرمان دەکەن بەوەی کە نەجەنگن لەگەڵیان لەکاتی فیتنەدا کە لەنێوان موسوڵماناندا رودەدات، بەڵام فەرمان دەکەن بەوەی کە بجەنگن لەگەڵ ئەو کەسەی کە بیەوێت کاری ئەم ئوممەتە پارچە پارچە بکات لەکاتێکدا کە خۆی یەك بووە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

* قال الإمام النووي رحمه الله: (وأما النصيحة لأئمة المسلمين ؛ فمعاونتهم على الحق، وطاعتهم فيه وأمرهم به، وتنبيههم وتذكيرهم برفق ولطف، وإعلامهم بما غفلوا عنه) . شرح صحيح مسلم: ج ٢، ص٢٤١.

(خِيَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ، وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ، وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ، وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ)، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَفَلاَ نُنَابِذُهُمْ بِالسَّيْفِ؟ فَقَالَ: (لاَ، مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ، وَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْ وُلاَتِكُمْ شَيْئًا تَكْرَهُونَهُ فَاكْرَهُوا عَمَلَهُ، وَلاَ تَنْزِعُوا يَدًا مِنْ طَاعَةٍ)(١).

واتە: باشترین کاربەدەستانی ئێوە ئەوانەن کە ئێوەیان خۆشدەوێت و ئەوانیش ئێوەیان خۆشدەوێت، ئەوان دوعای خێر بۆ ئێوە دەکەن و ئێوەش دوعای خێر بۆ ئەوان دەکەن، خراپترینی کاربەدەستانی ئێوە ئەوانەن کە ئێوە رقتان لێیانە و ئەوانیش رقیان لە ئێوەیە، ئەوان نەفرەت لە ئێوە دەکەن و ئێوەش نەفرەت لەوان دەکەن، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)! ئایا بەرەنگاریان نەبینەوە بە شمشێر؟ فەرمووی: نەخێر، تا ئەوکاتەی کە نوێژ دەکەن لەناوتاندا، ئەگەر لە کاربەدەستەکانتان شتێکتان بینی پێتان ناخۆش بوو بە لاتانەوە باش نەبوو، ئەوا ئەو کردەوەیتان پێ ناخۆش بێت، بەڵام دەست لە گوێڕایەڵیان مەکشێننەوە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ، فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ، وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ، وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! أَلاَ نُقَاتِلُهُمْ؟ قَالَ: (لاَ، مَا صَلَّوْا)(٢).

(١) – رواه مسلم: (١٨٥٥).

(٢) – رواه مسلم: (١٨٥٤).

* واعلم أن من ولي الخلافة واجتمع عليه الناس ورضوا به ، أو غلبهم بسيفه حتى صار خليفة ، وجبت طاعته وحرم الخروج عليه . قال الإمام أحمد : (ومن غَلَبَ عليهم- يعني الولاةَ- بالسيف حتى صار خليفة ، وسمي أمير المؤمنين ؛ فلا يحل لأحد يؤمن بالله واليوم الآخر أن يبيتَ ولا يراهُ إماما براً كان أو فاجرا) . « الأحكام السلطانية » ، لأبي يعلى : ص٢٣ . وقال الحافظ في الفتح : (وقد أجمع الفقهاء على وجوب طاعة السلطان المتغلب ، والجهاد معه ، وأن طاعته خير من الخروج عليه ؛ لما في ذلك من حقنِ الدماء ، وتسكين الدهماء) ج ١٣ ، ص٩ . وقال شيخ الإسلام ابن تيمية رحمه الله : (وقل من خرج على إمام ذي سلطان ؛ إلا كان ما تولد على فعله من الشر أعظم مما

واتە: بێگومان کەسانێك دەکرێنە کاربەدەست بەسەرتانەوە، جا شتی باش و شتی خراپیشیان لێ دەبینن، هەرکەسێك پێی ناخۆش بێت ئەوە بێ تاوان دەرچێت لێی، هەرکەسێك ئینکاری لێ بکات ئەوە سەلامەت دەبێت لەتاوانی ئەو کارە خراپە، بەڵام هەرکەسێك پێی رازی بێت و شوێنی بکەوێت ئەوە تاوانبارە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)! ئایا لەگەڵیان نەجەنگین؟ فەرمووی: (نەخێر، تا ئەوکاتەی کە نوێژ دەکەن).

بەڵام گوێڕایەڵی کردنی کاربەدەستان لە سەرپێچی و تاواندا هەرگیزاو هەرگیز بە هیچ شێوەیە دروست نیە؛ ئەمەش کردنەوە کردنە بەوەی کە لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتووە لە رێگرتن لەوەی کە گوێڕایەڵی کاربەدەستان بکرێت لە سەرپێچی و تاواندا؛ لەبەرئەوە گوێڕایەڵی هیچ بەدیهێنراوێ ناکرێت لە سەرپێچی خوای کردگاردا، بەڵکو پێویستە لەسەر زانایانی ئوممەت ئامۆژگارییان بکەن و رێنماییان بکەن و، هەوڵبدرێت بە هەموو هۆکارێکی شەرعی بۆ گەڕانەوەیان بۆ هەق؛ بەمەرجێك بەدکاری و خراپەکارییەکی گەورەتر رونەدات

---

تولد من الخير) منهاج السنة ج ٢ ص٢٤١ . وأما من عطل منهم شرع الله ولم يحكم به وحكم بغيره ؛ فهؤلاء خارجون عن طاعة المسلمين فلا طاعة لهم على الناس ؛ لأنهم ضيعوا مقاصد الإمامة التي من اجلها نُصبوا واستحقوا السمع والطاعة وعدم الخروج ، ولأن الوالي ما استحق أن يكون كذلك إلا لقيامه بأمور المسلمين ، وحراسة الدين ونشره ، وتنفيذ الأحكام وتحصين الثغور ، وجهاد من عاند الإسلام بعد الدعوة ، ويوالي المسلمين ويعادي أعداء الدين ؛ فإذا لم يحرس الدين ، أو لم يقم بأمور المسلمين ؛ فقد زال عنه حق الإمامة ووجب على الأمة– متمثلة بأهل الحل والعقد الذين يرجع إليهم تقدير الأمر في ذلك– خلعه ونصب آخر ممن يقوم بتحقيق مقاصد الإمامة ؛ فأهل السنة عندما لا يجوزون الخروج على الأئمة بمجرد الظلم والفسوق– لأن الفجور والظلم لا يعني تضييعهم للدين– فيقصدون الإمام الذي يحكم بشرع الله ؛ لأن السلف الصالح لم يعرفوا إمارة لا تحافظ على الدين فهذه عندهم ليست إمارة ، و( إنما الإمارة هي ما أقامت الدين ثم بعد ذلك قد تكون إمارة بَرة ، أو إمارة فاجرة . قال علي بن أبي طالب رضي الله عنه : « لا بد للناس ؛ من إمارة برة كانت أو فاجرة ، قيل له : هذه البرة عرفناها فما بال الفاجرة ؟! قال : يؤمن بها السبُل وتُقام بها الحدود ويُجاهد بها العدو ويُقسم بها الفيء) » منهاج السنة ، لابن تيمية : ج ١ ص١٤٦ .

لەوەی کە هەوڵبدرێت راست بکرێنەوەو بگەڕێنرێنەوە بۆ هەق؛ ئەگەر نا پێویستە لەسەر ژێردەستەکان(رعیة) ئارام بگرن، هەتا خوای گەورە کاری خۆی جێبەجێ دەکات و ئەو جۆرە کاربەدەستانە لادەبات لەسەریان، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

(السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ، فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلَا سَمْعَ وَلَا طَاعَةَ)[١].

واتە: بیستن و گوێڕایەڵی کردن لەسەر هەموو موسوڵمانێك پێویستە، لەوەی کە پێی خۆشە و لەوەشدا کە پێی ناخۆشە، ئەگەر فەرمانی پێ نەکرێت بە سەرپێچی، خۆ ئەگەر فەرمانی پێ کرا بە سەرپێچی ئەوە هەرگیز بیستن و گوێڕایەڵی نیە.

(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (لَا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةٍ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ)[٢].

واتە: گوێڕایەڵی کردن نیە لە سەرپێچی خوای گەورەدا، بەڵکو گوێڕایەڵی تەنهاو تەنها لە چاکەدا دەکرێت.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

بیروباوەڕیان بۆچونیان وایە بارێکی قورس و گران لەسەرشانی پێشەوای موسوڵمانانە، چەندین ئەرك و واجباتی گەورە و بەرپرسیارێتی جیاواز جیاواز، کە خوای گەورە واجبی کردووە لەسەری؛ جا بۆیە پێویستە کارکردن بۆ بەجێهێنانی ئەو ئەرك و بەرپرسیارێتیانە، لەوانە:

* جێبەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلام؛ هەر بەو شێوەیەی کە خوای پەروەردگار دەیەوێت لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا، لەبەرئەوە شەریعەتی ئیسلام گشتگیرە بەش بەش بوون هەڵناگرێت قابیلی قبوڵکردن نیە.

---

(١) - رواه البخاري: (٦٧٢٥).

(٢) - متفقٌ عَلَيْهِ.

* بانگەوازکردن بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلامی هەق و راست قورئان و سوننە، بڵاوکردنەوەی زانست و شارەزایی لەناو موسوڵماناندا؛ بە هەموو ڕێگەکان، بەرپەرچدانەوەی گومان و ناڕەوایی و دژایەتی کردنی.

* جیهاد و تێکۆشان لەپێناوی خوای گەورەدا، بۆ بەرزکردنەوەی وشەی خوا.

* پتەوکردنی کەلێنەکان واتە سنورەکانی دەوڵەتی ئیسلام بە هێزێکی ئامادەباش و بەرگریکار و ڕێگر واتە بە کەرەسەی جەنگی پێویست و، هێزی بەرپەرچدانەوە؛ تا موسوڵمانان لە دڵنیایی و هێمنی ئارامیدا بژین و دین و شەرەف و ناموس و سەر و ماڵیان پارێزراو بێت.

* هەستان بە جێبەجێ کردنی (حد) سنورە شەرعیەکان و پیادەکردنی ئەحکام و بڕیارەکان، تا قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە بپارێزرێت لە هەتککردن و پێشێل کردن، مافەکانی بەندەکانی خوای پەروەردگار بپارێزرێت لە لەناوچون و بەکاربردنێکی بێ سود.

* کۆکردنەوەی دەستکەوت و زەکات بەو شێوەیەی کە شەرع دایناوەو واجبی کردووە.

* دەبێ کاربەدەستی موسوڵمانان کەسێکی خاوەن تەقواو لەخوا ترس بێت، پێویستە لەسەر پێشەوا لەخوابترسێ بەرامبەر بەو خەڵکانەی کە خوای گەورە خستونیەتیە ژێردەستی و ئەوی کردووە بە شوان و بەرپرسیان مافیان پێشێل نەکات، بە نەرم و نیان و لەسەرخۆ بێت لەگەڵیان، ئامۆژگارییان بکات، شوێن عەیب و عار و شەرەف و ناموسیان نەکەوێت، دەبێ ئەوە بزانێ کە کرێکارێکە خوای پەروەردگار بە کرێی گرتووە لەسەر ئوممەت تا ببێتە شوانیان و چاودێرییان بکات و کاروبارەکانیان بۆ هەڵبسوڕێنێت، بۆ خزمەتکردنی دینی خواو شەریعەتەکەی، بۆ

جێبەجێ کردنی سنورەکانی خوای پەروەردگار لەسەر گشتی و تایبەتی بەبێ جیاوازی.

* پێویستە لەسەر پێشەوا پێشەنگ و سەرمەشقی چاك بێ بۆ ژێردەستەکانی، لێهاتو بەهێز بێ و لە لۆمەو سەرزەنشتی سەرزەنشتکاران نەترسێ، ئەمین و دەست پاك بێ لەسەر ئوممەت، دینیان بپارێزێ، خوێن و سەر ماڵ و سامان و، شەرف و ناموسیان بپارێزێ، هەروەها پارێزەری بەرژەوەندی و ئاسایش رەفتارو هەڵسوکەوت و کاروباریان بێت.

* هەرگیزاو هەرگیز تۆڵەسەندنەوەی لەبەر نەفسی خۆی نەبێت، بەڵکو تۆڵەسەندنەوەی لەبەر خوای پەروەردگار بێت، کاتێ کە تورە دەبێ لەبەر خوای گەورە تورە ببێت. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾ ﴾ سورة الحج: ٤١.

واتە: ئەوانەی ئەگەر دەسەلاتمان پێدان لە زەویدا بە چاکی نوێژ بەجێ دێنن، زەکات دەدەن و، فەرمان دەدەن بە چاکەو، بەرگری دەکەن لە خراپەو، سەرئەنجامی هەموو کارەکان تەنها بەدەست خوایە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِي ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴾ سورة ص: ٢٦.

واتە: ئەی داوود بێگومان ئێمە تۆمان کرد بەجێ نشینی (پێغەمبەرانی پێش خۆت) لەزەویدا، کەوابوو تۆش لەنێوان خەڵکدا بەڕاستی فەرمانڕەوایی بکە شوێن هەوا و ئارەزوات مەکەوە با لەڕێگای خوا لات نەدات، بێگومان ئەوانەی لەڕێگای خوا لادەدەن و گومڕا دەبن سزای سەختیان بۆ هەیە، چونکە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لەبیر کردبوو.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴾ سورة المائدة: ٧٨ - ٧٩.

واتە: نەفرین کرا لەوانەی بێ بڕوابوون لەبەرەو نەوەی ئیسرائیل لەسەر زمانی داود و عیسای کوڕی مەریەم، ئەو نەفرینەش لەبەر ئەوە بوو سەرپێچیان کردو هەمیشە دەست درێژیان دەکرد. ئەوانە بەرگری یەکتریان نەدەکرد لەهەر کارێکی بێزراوی بێ شەرعی کەدەیانکرد، بێگومان زۆر بەدبوو ئەوەی کە ئەیانکرد.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللَّهُ رَعِيَّةً، يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ؛ إِلاَّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ)[1].

واتە: هیچ بەندەیەك نیە خوای گەورە بیکات بە شوان بەسەر خەڵكانێكەوە، بمرێت لەو ڕۆژەدا کە دەمرێت، ئەو کەسە کەسێکی ناپاك و خیانەتکار بێت لەگەڵیان لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بێت، ئەوە خوای پەروەردگار بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات.

(١) - متفقٌ عَلَيْهِ أخرجه البخاري: ٩/٨٠ (٧١٥١)، ومسلم ١/٨٧ (١٤٢).

## بنچینەی نۆیەم

## عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە دەربارەی هاوەڵان و خەلافەت و کەسوکاری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

**لە بنچینەکانی عەقیدەی سەلەفی صالح، ئەهلی سوننە و جەماعە:**

* خۆشویستنی سەرجەم هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم) بەدڵ، مەدح کردنیانە بە باشی بە زمان، پاڕانەوەیە بۆیان و داوای بەزەیی و رەحمەت و لێ خۆشبون کردنە بۆیان، داواکردنە لە خوای گەورە کە لێیان رازی بێت واتە کە باسیان کردن دەڵێن خوای گەورە لێیان رازی بێت، دڵ و زمان و دەستیان سەلامەت و پارێزراوە بەرامبەریان، هەمیشە دڵەکانیان ئاوەدانە بە خۆشەویستی هاوەڵان، زمانیان هەمیشە پاراوە بە باسکردن و یادکردنەوەیان بە شێوەیەکی چاك و جوان.

* رق لێ بوون و دژایەتی کردنی هەرکەسێك کە رقی لە هەواڵان بێت و دژایەتیان بکات، یان کەسێك کە خۆشی نەون، یان کەسێك دەستدرێژی بکاتەسەریان، یان کەسێك رق و کینەی هەبێت بەرامبەر بە یەکێ لەوان؛ لەبەرئەوە خوای گەورە رازی بووە لەوان، موژدەی پێ داون بەوەی کە تەوبەو پەشیمانی لێ قبوڵ کردون، لێیان خۆش بووە، رازی بووە لێیان، بەهەشتی پێ داون.

هاوەڵان یەکەم کەس بوون کە باوەڕیان هێنا بە خوای گەورە و باوەڕیان هێنا بە پێغەمبەرە ئەمین و دەست پاکەکەی (صلی الله علیه وسلم)، خوای گەورە رێنمویی کردن بۆ ئیسلام و دینی راست و یەکخواناسیی پاك و بێگەرد، لە چرای روناکی و سەرچاوەی کانیاوی پەیامبەریەتی دینیان وەرگرت واتە راستەوخۆ لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)؛ بۆیە زۆر دڵسۆز و نیەت پاك بوون بۆ دینەکەیان لەنهێنی و لەئاشکرادا، لەو پێناوەدا هەموو شتێکی سەنگین و بە نرخ و

گران بەهایان دانا، کاتێ کە ئیسلام غەریب و نامۆ بوو ئەوان باوەڕیان پێ هێنا، لەکاتی ناخۆشی و مەترسی و تەنگانەدا جیهادو تێکۆشانیان کرد، بانگەوازیان کرد بۆ ڕێگەی خوا بە حیکمەت و ئامۆژگاری جوان، ئارام و خۆڕاگر بوون لەسەر دوژمنایەتی کردنی دوور و نزیك.

بە ڕاستی تەواوترین کەس بوون لەڕووی ئیسلام و باوەڕهێنان و ئیحسان و چاکەوە؛ هەروەها گەورەترینی خەڵك بوون لەڕووی خۆبەدەستەوەدان و بەڕاست دانان و ملکەچی و دڵسۆزی نیەت پاکی و زانست و کردار و گوێڕایەڵی و جیهادو تێکۆشان و دەستپێشخەرییان بۆ هەموو کارێکی جوان و پەسەندو سوپاسکراو، ئەوانە کەسە گەورەکانی ئوممەت بوون، کۆڵەکەو پاڵپشتی شەریعەت بوون لە رووی زانست و کردەوەوە، سەردەمی ئەوان چاکترینی سەردەمی ئوممەت بوو بەشێوەیەکی گشتی و رەها؛ خوای گەورە هەڵی بژاردبون بۆ ئەوەی ببنە یاوەر و هاوەڵی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم)، پاڵفتەی کردن بۆ هەڵگرتنی پەیامەکەی و بۆ گەیاندنی بە هەموو خەڵك بە گشتی؛ خوای گەورە یارمەتیدان و سەرکەوتوی کردن بۆ ئەو کارە؛ گەیاندیان هەر بەو شێوەیەی کە خوای پەروەردگار دایبەزاند بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەستان بە جێبەجێ کردن و جێگیرکردنی فەرمانەکانی دین، بینای ئیسلامیان قایم و پتەو کرد، کۆشك و تەلاری ئیسلامیان تەواو کرد و سەریان خست، خوای گەورە بناغەو بنەماکانی دینی پێ قایم کردن، لە پێناوی خوادا جیهاد و تێکۆشانی راستەقینەیان کرد، هەستان بە بڵاوکردنەوەی دینی ئیسلام بەناو ولاتان و ناوچەکان و بەناو بەندەکاندا، هەستان بە ئازادکردنی دڵەکان لەپێش رزگارکردنی ناوچەکان و ولاتەکاندا، حوکمڕانیان کردو دادپەروەر بوون؛ بونە گەورەو کاربەدەست، جێگیربون، بەختەوەر و خۆشبەخت ئەو کەسەیە کە شوێن ڕێگەو ڕێبازی ئەوان دەکەوێت، شوێن پێیان هەڵدەگرێت، کۆدەنگی و یەکڕایی ئەوان دەکاتە بەڵگە بۆ خۆی، زانستی ئەوان فێر دەبێت،

کردەوەو رەفتار بە کردەوەی ئەوان دەکات، قەدر و رێز و گەورەیی و فەزڵیان دەزانێ و لەبەرچاوی دەگرێت.

خوای پەروەردگار ئیمتیازێکی گەورەی پێ بەخشین رەزای خوایان لێ بێ، بە شتێکی گەورەو شکۆمەند تاکی کردنەوە کە هیچ کەسێ لەدوای ئەوان ناتوانێ پێی بگات هەرچەندە گەیشتبێتە پلەوپایەیەکی بەرزو پێگەیەکی گەورە؛ ئاگادارین ئەوەش بریتی بوو لەوەی کە شەرەفمەندو سەربەرزبوون بە بینین و سەیرکردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها هاوڕێیەتی و تێکەڵاوی، بیستنی فەرمودەکانی، وەرگرتنی دین بە پاراوی و رەوانی لێی، گەیاندنی ئەو دینە بەوانەی دوای خۆیان وەك چۆن وەریان گرتبوو؛ جا چاکەو پاداشتیان بۆ هەیە وەك چاکەو پاداشتی هەرکەسێك کە کردەوەی دەکرد بەوەی ئەوان پێیان راگەیاند، بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوکەسانە خۆشیان هیچ شتێ کەم بکات هەتا رۆژی دوایی.

هاوەڵە بەرێزەکان رەزای خوایان لێ بێ هەر هەموویان دادپەروەر بوون و جێگەی باوەڕ و متمانە بوون، بە هۆی ئەوەوە کە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) رێزی خستن و لێیان رازی بوون، مەدحیان کردووە بە چاکی، هیچ کەسێ لەوان دادپەروەرتر نیە کە خوای گەورە هەڵی بژاردبون بۆ ئەوەی بیانکاتە هاوەڵی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم)، وەرگرتنی شەریعەت راستەوخۆ لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، هیچ خاوێن کردنەوەو تەزکیەیە چاکتر نیە لەوە، هیچ رێکخستن و تەعدیلێ تەواوتر نیە لەوە، ئەوان دۆستانی خواو هەڵبژێردراوانی خوای پەروەردگار بوون، ئەوان باشترین دروستکراوانی خوای پەروەردگار بوون، ئەوان باشترین و چاکترین کەسی ئەم ئوممەتەن لەدوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە رەهایی، کە ئەم ئوممەتەش بریتیە لە باشترینی گەل و ئوممەتەکان.

شایەتی دان بۆیان بە بوونی ئیمان و ئیحسان و چاکەو فەزڵ و گەورەیی و دادپەروەری و بەرزێتی و بڵندی پلەوپایەیان و، تەواویەتی سیفاتیان؛ کە بنەڕەتێکی براوەیەو، شتێکی زوانراوە لە دینی ئیسلام کە دەبێ هەموو کەسێك بیزانێت.

* خۆشویستن و بەرگری کردن لێیان و، شوێنکەوتنیان و، شوێن پێ هەڵگرتنیان کردنیان بە سەرمەشق و پێشەنگ بریتیە لە دین و باوەڕهێنان.

* رق لێ بوون لێیان و زمان درێژی بەرامبەریان و دەستدرێژ کردنە سەریان و، لەبەرچاو نەگرتنی هەق و مافەکانیان، بریتیە لە بێ باوەڕی و دووڕویی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ۖ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ ﴾ سورة الفتح: ٢٩.

واتە: موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەری خوایە، ئەو (باوەڕدار)انەش کەلەگەڵیدان بەرامبەر بێ باوەڕان توندو تیژن و لەنێوان خۆیاندا بە بەزەیین، دەیان بینی (هەمیشە) لە کڕنوش و سوژدە بردندان داوای بەهرەو رەزامەندی خوا دەکەن، نیشانەیان لە ناو چاوانیاندا دیارە بەهۆی زۆر سوژدەبردن(یانەوە)، ئەوە نموونەیانە لە تەوراتدا، ئەوە نموونەشیان لە ئینجیلدا، وەك کشتوکاڵێك وایە چەکەرەی دەرکردبێ (سەوز بووبێ)، ئەنجا چەکەرەکەی بەهێز کردبێ و قاییم بوبێ، جا لەسەر لاسکی خۆی ڕێك وەستابێ (ئەوەندە جوان بێ) جوتیارەکانی سەرسام کردبێ، تابە (زۆربونی) هەوەڵانی داخ و مەراق بدا بەکافران، خوا بەڵێنی داوە بەوانەیان کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکەیان کردووە بە لێبوردن و پاداشتی گەورە (کە بەهەشتە).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ جَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ سورة التوبة: ٨٨ - ٨٩.

واتە: بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە لەگەڵیدا تێکۆشان بەماڵ و گیانیان، هەموو خێر و خۆشی هەر بۆ ئەوانە، هەر ئەوانەن سەرفرازن. خوا بەهەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون، کەڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا بەهەمیشەیی تیا دەمێننەوە ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ سورة التوبة: ١٠٠.

واتە: پێشکەوتووە یەکەمەکان لەکۆچەران و یاریدەدەران ئەوانەش زۆر بە چاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە و شوێنیان کەوتوون، خوا لێیان ڕازییە ئەوانیش لەخوا ڕازین، (خوا) بەهەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون کە ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا تێیدا دەمێننەوە بێ بڕانەوە، ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

هیچ کاتێ باسی هاوەڵە بەڕێزەکان ناکەن ئیللا بە چاکە بە جوانی نەبێت؛ لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوانی خۆشویستوە، وەسیتیشی کردووە بۆ ئوممەتەکەی کە ئەوانیان خۆش بوێت؛ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(اللَّهَ اللَّهَ فِي أَصْحابِي لا تَتَّخِذُوهُمْ غَرَضاً بَعْدِي، فَمَنْ أَحَبَّهُمْ فَبِحُبِّي أَحَبَّهُمْ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ فَبِبُغْضِي أَبْغَضَهُمْ، وَمَنْ آذاهُمْ فقد آذانِي، وَمَنْ آذانِي فقد آذى اللَّهَ، وَمَنْ آذى اللَّهَ يُوشِكُ أَنْ يَأْخُذَهُ)[1].

واتە: لەخوا بترسن لە هەقی هاوەڵەکانی مندا، لەدوای من ئەوان مەگرن بە ئامانج واتە رقتان لێیان بێ و جنێویان پێ بدەن و تانەو تەشەریان لێ بدەن، جا هەرکەسێك ئەوانی خۆش بوێت ئەوە لەبەر خۆشەویستی من ئەوانی خۆش ویستوە، هەرکەسێکیش رقی لێیان بێت ئەوە رقی لە منە، بۆیە رقیشی لەوانە، هەرکەسێك ئازاری ئەوان بدات ئەوە ئازاری منی داوە، هەرکەسێك ئازاری من بدات، ئەوە ئازاری خوای گەورەی داوە، هەرکەسێکیش ئازاری خوای گەورە بدات، ئەوە دور نیە خوای پەروەردگار بیگرێت و لەناوی بەرێت.

لەبەر رێزی پلەوپایەی و بەرزێتی پێگەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)؛ بەخشراوە بە هەرکەسێك کە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) دیبێ شەرەف و رێز و پلەی بەرزی صەحابە، جا هەرکەسێك پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) دیبێ، باوەری پێ هێنابێ، لەسەر ئەو حاڵەتەش مردبێ؛ ئەوە لە هاوەڵە بەرێزەکانە، پلەی هاوەڵێتی هەیە بەپێی ئەندازەی ئەو ماوەیەی کە هاوەڵێتی کردووە و پێشتر لەگەڵی بووە و لێی بیستوە، سەیری کردووە، ئەگەر هاورێیەتیەکەی بۆ ماوەی ساڵێك بێت، یان مانگێك بێت، یان رۆژێك بێت، یا کاتێکی کەمیش بێت لەرۆژێکدا هەر پلەی هاورێتی پێ بەخشراوە بەڵام تا زوتر باوەری هێنابێ و زیاتر هاورێتی کردبێ پلەی بەرزترە.

(١) – (صحيح سنن الترمذي) للألباني.

* قال عبد الله بن مسعود رضي الله عنه : (حُب أبي بكرٍ وعمرَ ، ومعرفةُ فضلِهما من السنة) . وقال الإمام مالك رحمه الله : (كان السلف يُعلمون أولادهم حب أبي بكرٍ وعمر؛ كما يُعلمون السورة من القرآن) . اخرجهما اللالكائي في (شرح أصول اعتقاد أهل السنة).

هیچ کەسێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە کۆچەران و یاریدەدەران ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە؛ ئەوانەی لەژێر درەختی (رضوان)دا پەیمان و بەڵێنیان دا بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە بجەنگن لەسەر ئەو ستەمەی کە لێیان کرابوو، لەسەر ئەوەی کە ڕا نەکەن و پشت هەڵنەکەن لە جەنگ، لەسەر ئەو حاڵەتە بمرن؛ جێگیربوون لەسەر ئەو پەیمانەی کە دابویان بەخوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم)، خوای گەورە لەوان رازی بوو، ئەوانیش لە خوای پەروەردگار رازی بوون، ئەوان واتە هاوەڵان لەو رۆژەدا ژمارەیان لە هەزار و چوار سەد کەس زیاتر بوو، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ ﴾ سورة الفتح: ١٨.

واتە: سوێند بەخوا بێگومان خوا رازی بوو لەو ئیماندارانەی کە پەیمانیان پێدایت لەژێر درەختەکەدا (لە حودەیبیە)، جا خوا ئاگادار بوو بەوەی لە دڵیاندایە بۆیە دڵنیایی و ئارامی بۆ ناردن، پاداشتی دانەوە بەسەرکەوتنێکی نزیك (کەئازاد کردنی خەیبەر بوو).

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (لاَ يَدْخُل النارَ أَحَد بَايع تَحْتَ الشجَرَة)[1]. واتە: هەر کەسێك لەوانەی لەژێر درەختی (رضوان)دا پەیمان و بەڵێنیان دا بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

باوەڕیان وایە کە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)؛ لەگەڵ ئەو هەموو چاکێتی و فەزڵ و گەورەییەی پلەوپایەیان وەك یەك نین، بەڵکو هەندێکیان لە هەندێکی تریان گەورەتر و چاکترن؛ ئەمەش بە پێی زوو دەستپێشخەریان بوو بۆ باوەڕهێنانیان بە ئیسلام و کۆچکردنیان و داڵدەدانی

---

(١) – رواه البخاري .

موسوڵمانان و سەرخستنی ئیسلام و جیهادو تێکۆشان کردن، هەروەها بە پێی ئەو کردەوانەیان کە ئەنجامیانداوە بەرامبەر بە دینەکەیان و پێغەمبەرەکەیان (صلی الله علیه وسلم).

بەشێوەیەکی گشتی چاکترینیان پێشکەوتووە یەکەمەکانە لەکۆچەران و یاریدەدەران؛ لەپاشدا ئەوانەی کە بەشداریان کرد لە جەنگی بەدری گەورەدا، ئینجا ئەوانەی کە بەشداریان کرد لە جەنگی ئوحود و ئەحزاب دا، ئەوانەی لەژێر درەختی (رضوان)دا پەیمان و بەڵێنیان دا بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە بەرگری بکەن لە دینی ئیسلام و جیهاد بکەن، هەروەها ئەوانەی کە لە عەقەبەی یەکەم و دووەم کە پەیمان و بەڵێنیان دا بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)؛ ئەوانەی کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەیان (صلی الله علیه وسلم) سەرخست، لەپاشدا هاوەڵە بەرێزەکانی تر ئەوانەی کە بەخشیان لەپێش رزگارکردنی شاری مەککەدا، هەروەها ئەوانەی کە لەدوای رزگارکردنی شاری مەککە موسوڵمان بوون و لەپێناوی خوای گەورەدا جەنگان و جیهادو تێکۆشانیان کرد؛ خوای گەورە لە هەموویان رازی بێت.

باوەڕیان وایە کە هەندێ لە هەاوەڵان بە دیاریکراوی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مژدەی چوونە بەهەشتی پێ داون؛ لەوانە (عشرة المبشرة) واتە ئەو دە کە مژدەی چوونە بەهەشتیان پێدرا؛ ئەوانەش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناوی هێناون بریتین لەمانە:

ئەبو بەکری صدیق، عومەری فاروق، (عثمان ذو النورین)، عەلی (المرتضی)، (طلحة)ی کوڕی (عبید الله)، زوبێری کوڕی عەوام، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، سەعیدی کوڕی زەید، (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف، ئەبو عوبەیدە عامری کوڕی جەراح ئەمین و دەست پاکی ئەم ئوممەتە، خوای گەورە لە هەموویان رازی بێت.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

بیروباوەڕیان وایە بە بیروباوەڕێکی جێگیر و تەواو کە هیچ دوودڵی و گومانێکی تێدا نیە؛ کە لەپێشترین کەسی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شایستەی ئەوەن ببنە پێشەواو خەلیفە بریتین لەم چوارە: ئەبو بەکر، عومەر، (عثمان)، عەلی خوای گەورە لە هەموویان رازی بێت؛ ئەوانە گەورەترین و چاکترین کەسانێ بوون لە کۆچەران و موسوڵمانان، بە کۆدەنگی زانایان لەدوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چاکترین کەسانی ئەم ئوممەتەن، ئەوانە هاوەڵ و وەزیر و خزم و زاواو خەزوری پێغەمبەر بوون (صلی الله علیه وسلم) ئەبو بەکر و عومەر خەزوری بوون، (عثمان) و عەلیش زاوای بوون؛ ئەوانە بە ریزبەندی خەلیفەی راشدین و پێشەوای رێنمایی کراو بوون، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

(أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللهِ، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ كَانَ عَبْدًا حَبَشِيًّا؛ فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ بَعْدِي الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ)(١).

واتە: وەسیەتتان بۆ دەکەم بەوەی لە خوا بترسن، ببیستن و گوێڕایەڵی بکەن ئەگەر ئەوەی کە کاربەدەستانە بەندەیەکی حەبەشی بێت، لەبەرئەوە ئەوەی لەدوای من بژی جیاوازییەکی زۆر دەبینێ، جا بۆیە ئاگاداربن پێویستە لەسەرتان دەستبگرن بە سوننەتی من و، سوننەتی خەلیفە راشیدینە رێنمایی کراوەکانەوە، بە ددانە خرێکانتان قەپی پێدا بکەو واتە بە توندی دەستی پێوە بگرن، ئاگاداری شتە تازە داهێنراوەکان بن لە دیندا، بێگومان ئەو شتە تازانەش داهێنراو(بیدعە)ن، هەموو بیدعەیەکیش لەدیندا گومڕاییە.

---

(١) - (صحيح سنن ابي داود) للألباني.

لە پێشەوایەتی ئەوانە ماوەی (خلافة)جێنشینی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سی ساڵ بووە، لەگەڵ خەلافەتی حەسەنی کوڕی عەلی رەزای خوای گەورە لە هەموویان بێ، بەپێی ئەم فەرمودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): (الْخِلَافَةُ فِي أُمَّتِي ثَلَاثُونَ سَنَةً، ثُمَّ مُلْكٌ بَعْدَ ذَلِكَ)(١). واتە: ماوەی خەلافەتی لە ئوممەتی من دا سی ساڵە، لەپاشدا دەبێتە پاشایەتی.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە کە هیچ کەسێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان (معصوم)پارێزراو نیە لە گوناهو تاوان، هەروەها خزمە نزیك و پاکەکانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)، نە پێشکەوتووە یەکەمەکان، نە ئەوانەی دوای ئەوانیش؛ بەڵکو لەلایان دروستە ئەوانیش بکەونە هەڵەوە بە شێوەیەکی گشتی چونکە ئەوانیش ئادەمیزادن و دەکەونە هەڵەوە؛ بەڵام خوای گەورە بەڵێنی پییان داوە بەوەی کە لێیان خۆش ببێ و لێیان رازی بێت، لێیان خۆش ببێت بە قبوڵکردنی تەوبەیان و پەشیمان بوونەوەیان و بەو چاکانەی کە مایەی سڕینەوەی تاوانەیکانیانە، بە کردەوە چاکەکانیان.

بەڵام ئەهلی سوننە و جەماعە دەڵێن هاوەڵە بەڕێزەکان رەزای خوایان لێ بێ (معصوم)پارێزراون لەوەی کە هەر هەموویان بەتێکڕا بکەونە هەڵەیەکەوە، هەرگیزاو هەرگیز کۆببنەوە ناگونجێ لەسەر وتەی پوچ و ناڕەواو وازهێنان لە هەق و راستی، بەڵان تاك تاکیان (معصوم)پارێزراو نین،(معصوم)پارێزراوێتی بۆ ئەو پێغەمبەرانەیە کە خوای گەورە هەڵیبژاردون بۆ گەیاندنی پەیامەکەی واتە لە گەیاندنی پەیامەکەی خوای پەروەردگاردا (معصوم)پارێزراون و هەرگیز ناکەونە هەڵەوە، خوای گەورە

بەگشتی ئەم ئوممەتەی پاراستوە لەوەی بکەونە هەڵەوە نەك تاکەکانی یەك بە یەك، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(إن الله لا يَجْمَعُ أمَّتي عَلى ضَلاَلَة، وَيَدُ الله مَع الجَمَاعَة، ومَنْ شَذَّ شَذَّ فِي النَّار)[1].

واتە: بەڕاستی خوای گەورە ئوممەتەکەم لەسەر گومڕایەتی کۆناکاتەوە، دەستی خوای پەروەردگار لەگەڵ کۆمەڵ و جەماعەتی موسوڵمانانە ، ئەوەی تاك ببێتەوەو دوپەرێز بێت ئەوە بۆ ئاگری دۆزەخ تاك دەبێتەوە.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

کۆدەنگن لەسەر پێویستێتی بێ دەنگ بوون لەو فیتنە و ئاژاوەو کوشتارەی کە رویدا لە نێوان هاوەڵە بەرێزەکاندا رەزای خوایان لێ بێ، دەست هەڵدەگرن لەوەی لە نێوانیاندا رویدا لە ناکۆکی، کاروباری ئەوەی کە رویدا دەیگێڕنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار، زۆر خۆیان بەدور دەگرن لە باسکردنی ئەو موسیبەت و ناخۆشیەی کە رویدا، داوای لێ خۆشبون دەکەن بۆ کوژراوەکانی هەردوو لا لەگەڵ بەزەیی هاتنەوە پێیاندا.

هیچ کەسێ لە هاوەڵە بەرێزەکان بە (معصوم)پارێزراو نازانن لەوەی کە بکەونە هەڵەوە، هەروەها بە تاوانباریشیان نازانن، باوەڕیان وایە کۆشش(ئیجتیهاد)یان کرد، داواکاری هەق و راستی بوون، بە دەستی ئەنقەست ئەو هەڵەیان نەکرد؛ هەر لایەکیان پێکابێتی دوو پاداشتی بۆ هەیە، ئەو لایەش کە نەیپێکا بێت ئەوە تەنها یەك پاداشتی بۆ هەیە، هەڵەکەی جێگەی لێخۆشبونە؛ بە ئیزنی خوای گەورە؛

(١) – (صحيح سنن الترمذي) للألباني برقم: ١٧٥٩.

سەرجەم هاوەڵان بیانویان هەبوو بۆ بەشداریکردن لەو جەنگەدا، پاداشتیشی لەسەر وەردەگرن، گوناهباریش نین[١].

ئەهلی سوننە و جەماعە؛ جنێونادەن بە هیچ کەسێ لە هاوەڵە بەڕێزەکان، پشتیان تێ ناکەن و تەبەڕا لەکەسیان ناکەن، بە خراپە باسیان ناکەن بە بەرپرسیان نازانن لەو روداوە نەخوازراوەدا، بە خراپە باسیان ناکەن؛ بەڵکو بە مەدح و پیاهەڵدانی چاك کە شایستەی ئەوان بێت باسیان دەکەن؛ وەك جێبەجێ کردنێك بۆ فەرمانەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت:

(لَا تَسبوا أَصْحَابِي، لَا تَسبوا أَصْحَابِي؛ فَوَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَن أَحَدَكُم أَنْفَقَ مِثْلَ أحُد ذَهَبا مَا أَدْرَكَ مُدّ أحَدِهِم، وَلا نَصِيفَه)[٢] *.

واتە: جنێو مەدەن بە هەوەڵەکانی من، جنێو مەدەن بە هەوەڵەکانی من، سوێند بە (الله) کە گیانی منی بەدەستە ئەگەر یەکێکتان ئەوەندەی کێوی ئوحود ئاڵتون ببەخشێ، ناگاتە گوێلێکی ئەوان، یان نیو گوێلی.

* هەرکەسێك ئەوانی خۆش بوێت، رێزیان لێ بگرێت، بە گەورەیان بزانێت، داوای لێ خۆشبونیان بۆ بکات لە خوای پەروەردگار، بۆیان بپاڕێتەوە بە چاکە، رازی بێ لێیان و داوای رەزامەندیان بۆ بکات، هەق و مافیان لەبەرچاو بگرێت، قەدریان بزانێ، باسی فەزڵ و گەورەییان بکات، بەرگرییان لێ بکات، زمانی بپارێزێ

(*) جمهور الصحابة الكرام رضي الله عنهم لم يدخلوا في الفتنة، ولما هاجت الفتنة كان أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم عشرات الألوف فلم يحضرها منهم مائة! بل لم يبلغوا ثلاثين. كما رواه الإمام أحمد في: « مسنده » بسند صحيح عن ابن سيرين ، وعبد الرزاق في: « المصنف» ، وابن كثير في تاريخه: « البداية والنهاية » فانظر.

(٢) – (صحيح سنن الترمذي) للألباني.

(**) وقد وقعَ بين عُبيد الله بن عمر ، وبين المقداد كلام ؛ فشتمَ عُبيد الله المقداد ، فقال عمر بن الخطاب رضي الله عنه : (علي بالحَداد اقطع لسانَه لا يجترئُ أحد بعدَه فيشتم أحدا من أصحاب رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم) . اخرجه اللالكائي في « شرح أصول اعتقاد أهل السنة » .

لەوەی باسی شەرەف و ناموسیان بکات، شوێن ڕێگەو ڕێبازیان بکەوێت، شوێن ڕێگەو شوێنەواری ئەوان بکەوێت، ئەوە لە دونیاو لە دوارۆژدا سەبەرزو سەرفرازە.

* هەرکەسێك رقی لێیان بێت، یان جنێویان پێ بدات، یان بە کەمیان بزانێ، یان پشتیان تێ بکات و تەبەڕایان لێ بکات، یان داوای رەزامەندی و لێ خۆشبونیان بۆ نەکات لە خوای پەروەردگار، زمانی بەرەڵا بکات لە هەقیاندا و لە باسی شەرەف و ناموسیاندا واتە زمان درێژی بکات لە بەرامبەریاندا، لەناو خەڵکدا بە خراپە باسیان بکات و تانەو تەشەریان لێ بدات بە دەست و بە ئاماژە بۆ کردن، بە سەر لەقاندن، یان تاوانباریان بکات، ئەوە ئەو کەسە لە تیاچو گومڕاو سەرلێشێواوەکانە، ئەوانە ئەو کەسانەن کە کردەوەو کۆششیان بەفیڕۆ چوو لەژیانی دنیادا، واشیان گومان دەبرد بەراستی ئەوان کارێکی زۆر چاك دەکەن.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە کە واجبە خۆشویستنی کەسوکاری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)؛ لە هاوسەرەکانی و، نەوەکانی و، خزم و کەسە نزیکەکانی ئەوانەی کە باوەڕدار بوون، هەرگیزاو هەرگیز دروست نیە بۆ موسوڵمان خۆشی نەوێن و رقی لێیان بێت، دۆستایەتی کردنیان و سەرخستنیان واجبە، هەروەها واجبە ئیحترام و رێزگرتنیان، بە گەورە گرتنیان، قەدر زانینیان، چاك بوون لەگەڵیاندا، داوای درودو سەلام لە خوای پەروەردگار بۆیان، بەزەیی هاتنەوە پێیاندا، رازیبوون لە سەرجەمیان، لە بەرچاوگرتنی هەق و مافەکانیان: لە پێنج یەك و دەستکەوتی جەنگی دا واتە دەبێ بێ بەش نەکرێن و هەقی خۆیان بدرێتێ، ئەهلی سوننەو جەماعە باوەڕیان وایە کە ئازاردانیان حەرامە، یان خراپ بوون لەگەڵیان بە وتەو یان بە کردەوە، بەرگری کردن لێیان واجبە، بەرگری کردن لە شەرەف و ناموسیان واجبە، هەروەها پاك راگرتنیان واجبە لەو درۆ و بوختانانەی کە دەدرێتە پاڵیان،

دورەپەرێزی لەو کەسەی کە ڕۆدەچێت لە هەقیاندا و تەبەرِا لێ کردنی، هەروەها واجبە رق لێ بوون لەو کەسانەی کە رقی لە خزم و کەسوکاری پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، یان بە خراپ باسیان بکات و ناویان بزڕێنێ و بەسوکی سەیریان دەکات، یان زمان درێژی بکات بەرامبەریان، یان دوژمنایەتیان بکات.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

وەسیەتەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەربارەیان دەپارێزن لەکاتێکدا کە دەفەرموێت: (أُذَكِّرُكُمُ اللَّهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي، أُذَكِّرُكُمُ اللَّهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي)[1].

واتە: لە خوا بترسن لە هەقی کەسوکارمدا، لە خوا بترسن لە هەقی کەسوکارمدا – واتە ڕێزیان بگرن و مافیان بپارێزن و جنێویان پێ مەدەن – سەکایەتیان پێ مەکەن شەرەف و ناموسیان لەکەدار مەکەن – .

هەروەها دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى بَنِي إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى مِنْ بَنِي إِسْمَاعِيلَ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ كِنَانَةَ قُرَيْشًا، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ)[2] [*]. واتە: خوای گەورە نەوەی ئیسماعیلی هەڵبژارد، لەنەوەی ئیسماعیل کینانەی هەڵبژارد، لە کینانەش قورەیشی هەڵبژارد، لە قورەیشیش نەوەی هاشمی هەڵبژارد، لە نەوەی هاشمیش دا منی هەڵبژارد.

* باوەڕیان وایە کە دۆستایەتی کردنیان و خۆشویستنیان لە ئیمان و ئیسلامەتیەوەیە، کە ئەوەش بریتیە لە خۆشویستن بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەمەش لەبەر گەورەیی و قەدر و ڕێز و بەرزی پلەوپایەو پێگەیانە.

---

(١) – رواه مسلم.

(٢) – رواه مسلم.

(*) وكيف لا نحبهم؟ ونحن نصلي ونسلم عليهم بعد رسولنا – صلى الله عليه وسلم – في كل صلاة!.

* دوژمنایەتی کردنیان و رق لێ بونیان و شارەزا نەبوون و لەبەرچاو نەگرتنی هەق و مافیان؛ لە بێ باوەڕی و دووڕوییە، کە ئەوەش تاوانێکی زۆر زۆر گەورەیە.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە کە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەشێکن لە ئال و بەیت ، دایکانی باوەڕدارانن؛ بەدەقی قورئانی پیرۆز، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ٣٢ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ﴾ سورة الأحزاب: ٣٢ - ٣٣.

واتە: ئەی ژنانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئێوە وەك هیچ یەك لەئافرەتانی دیکە نین ئەگەر خۆتان بپارێزن و لەخوا بترسن، کەواتە بەخەمزەو نازەوە قسە مەکەن (وەك ئافەرەتانی رەوشت نزم) نەوەکو ئەوەی کەدڵی نەخۆشە (دەرون نزمە) نیازی خراپ بکات، قسەی چاکو بەجێ بکەن. لە ماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوە، زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخەن (لەناو خەڵکی نامەحرەمدا) وەکو خۆ دەرخستنی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی یەکەم (پێش ئیسلام)، نوێژ بکەن و زەکات بدەن، گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، بەراستی خوا دەیەوێ ئەی ئالو بەیتی (پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)) هەر جۆرە پیسی و گوناهێك لە ئێوە دووربخاتەوە و پاك و خاوێنتان بکاتەوە بەتەواوی.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ﴾ سورة الأحزاب: ٦.

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە خودی بڕواداران بۆ خۆیان لە پێشترە خێزانەکانیشی دایکی باوەڕدارانن.

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴾ سورة الأحزاب: ٣٤.

واتە: بیربکەنەوە لەوەی دەخوێنرێت لەماڵەکانتاندا لەئایەتەکانی خواو دانایی (فەرمودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم))، بەراستی خوا وردبینی ئاگادارە.

هاوسەرەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە ریزبەندی بریتین لە: خەدیجەی کچی خوەیلیدی ئەسەدی، سەودەی کچی زەمعەی کوڕی قەیسی عامری، عائیشەی کچی ئەبو بەکری صدیق، حەفصەی کچی عومەری کوڕی (خطّاب)، زەینەبی کچی خوزەیمەی هیلالی، ئوم سەلەمە هیندی کچی ئەبی ئومەییەی مەخزومی، زەینەبی کچی جەحشی ئەسەدی، جوەیرییەی کچی (حارث)ی کوڕی ئەبی (ضرار)ی خوزاعی، ئوم حەبیبە هیندی کچی ئەبی سوفیان، صەفیەی کچی حویەیی کوڕی (أخطب)، مەیمونەی کچی (حارث)ی هیلالی، کە دواهەمین هاوسەری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە کە خوای گەورە بۆیە بە دایکانی باوەڕدارانی داناون؛ لەبەر گەورەیی هەق و مافیان، ڕێزو حورمەتیان، شەرەفمەندی و بەرزێتی و شکۆمەندی پلەوپایەیان، باوەڕیان وایە کە بە گەورە بگیرێن، داوای ڕەزامەندی و لێ خۆشبونیان بۆ دەکەن لە خوای پەروەردگار، ، ڕازیبوون لێیان، زانینی فەزڵ و

شکۆمەندییان، ئەوانە پاك و بێ خەوشن لەهەموو خراپەیەك، هاوسەری پێغەمبەرن (صلی الله علیه وسلم) لەدونیاو لەدواڕۆژدا، خوای گەورە لەوان رازییەو ئەوانیش لەو رازین، خوای گەورە سزای سەختی ئەو کەسانە دەدات کە ناویان دەزڕێنێ و بەسوکی سەیریان دەکات.

بێگومان چاکترینیان خەدیجەی کچی خوەیلیدە دایکی زۆر لە منداڵەکانیەتی، لەپێش هەموویانەوە موسوڵمان بووە، دوای ئەویش عائیشەی کچی ئەبو بەکری صدیقە؛ زاناترین ئافرەتی ئوممەتە بە ڕەهایی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، جگە لەو هیچ کچێکی تری مارە نەکردووە – ئەوانی تر هەموویان بێوەژن بوون مارەی کردون، هیچ ئافرەتێکی بە ئەندازەی ئەو خۆش نەویستوە، تەنها لەماڵی ئەودا وەحی نیگای بۆ هاتووە، هەر لەماڵی ئەویشدا وەفاتی کردووە، خوای گەورە لەکۆتا ساتی ژیانیداو لە یەکەم ساتی ژیانی دواڕۆژدا لیکی هەردوکیانی کۆکردەوە – واتە ئەو سیواکەی کە خاتو عائیشە بە لیکی نەرمی کردەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێنای بە میدا و سیواکی پێ کرد – لەماڵی عائیشەدا نێژرا، خوای گەورە لەسەروی حەوت ئاسمانەکانەوە بە بێ تاوان ناوزەدی کرد و پاکێتی راگەیاند، ئەوەی لەدوای دابەزینی ئەم ئایەتانەوە بوهتانی بۆ بکات و بە داوێن پاکی نەزانێت، ئەوە بێ باوەڕە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ سورة لنور: ١١.

واتە: بێگومان کەسانێ کە ئەو بوهتانەیان (بۆ عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)) هەڵبەست دەستەیە بوون لەخۆتان (بامونافیقیشیان تیا بوو)، وا مەزانن ئەو (بوهتانە)شەڕو خراپە بۆتان، (وانی یە)بەڵکو خێرو چاکەیە بۆتان بۆ هەر یەك لەوانە هەیە لەتاوان بەو ئەندازەی هەوڵی داوە (لەو بوهتانەدا)،

ئەو کەسەیان کەبەشی گەورەی بوختانەکەی گرتە ئەستۆ (کە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی بوو) ، (لەڕۆژی دواییدا) بۆ ئەوە سزای هەرە گەورە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(فَضْلُ عائِشَةَ عَلَى النساءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطعام)[1].

واتە: فەزڵی عائیشە بەسەر ئافرەتانی تردا وەك فەزڵی تریتی گۆشتاو وایە بەسەر خواردنەکانی تردا.

(١) - رواه البخاري .

## بنچینەی دەیەم

## هەڵوێستی ئەهلی سوننە و جەماعە دەربارەی ئەهلی بیدعەو ئارەزوو

**لە بنچینەکانی عەقیدەی سەلەفی صالح، ئەهلی سوننە و جەماعە:**

ئەوەیە ئەوانە رقیان لە ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزووەو لێیان تورەن؛ ئەوانەی کە لەدیندا شتێکیان داهێناوە لەدین نیە، سەرزەنشت و سەرکۆنەیان دەکەن، خۆیان لە خوای گەورە نزیك دەکەنەوە بە وەسیلەی رق بونیان لە ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزوو، بە وازهێنان لێیان، بەسکردنیان بە خراپە، بە سەرشۆڕکردنیان، بە سەلام لێ نەکردنیان، بە گەورەیان دانانێن ، رێزیان لێ ناگرن.

ئەوانە ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزوویان خۆش ناوێت، هاوڕێیەتیان ناکەن، بەشداری کۆڕ و کۆبونەوە و دانیشتنیان ناکەن، تێکەڵاویان ناکەن، گەواهی و شایەتیدان و گێڕانەوەیان قبوڵ ناکەن، گوێ ناگرن بۆ قسەکانیان، دەربارەی دین وت و وێژ و موناقەشەیان لەگەڵ ناکەن، گوێیەکانیان دەپارێزن لە قسە پروپوچ و ناڕەوا زیان بەخشەکانیان واتە گوێی خۆیان کەڕ دەکەن لە ئاست درۆ و ساختەکاریەکانیان، ئەو قسە پروپوچ و ناڕاوانەی کە بە گویچکەدا تێپەڕیان کرد لەدڵدا جێگیر دەبن و، وەسوەسەی شەیتان دروست دەکەن.

ئەهلی سوننە و جەماعە وادەبینن کە حاڵی ئەوان بەیان بکرێت و رون بکرێتەوە بۆ خەڵك، هەروەها شەڕ و خراپەکانیان ئاشکرا بکرێت، ئوممەتی ئیسلامیان لێ ئاگادار بکرێتەوە، لەو بیدعە گومڕاکەرانەی کە کردویانەو دەیکەن، خەڵکیان لێ بڕەتێنی و دوریان بخەیتەوە لێیان، هەروەها دوریان بخەیتەوە لە کردەوە داهێنراوەکانیان، ناویان بزڕاێنی، بەو سەرپێچیە شەرعیانەی کە هەیانە؛ لە گەورەترین و گرنگترین واجباتەکانە کە ئەهلی سوننەو جەماعە خستویانەتە ئەستۆی خۆیانەوەو بە ئەرکی سەرشانی خۆیانی دەزانن، ئەمانەی کە باسکران لە

جوملەی فەرمانکردنە بە چاکەو ڕێگرتنە لە خراپە، لە جوملەی ئامۆژگاریە: ئامۆژگاری بۆ خوای گەورە، بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، بۆ موسوڵمانان؛ کە ئەوەش بریتیە لەحەقیقەتی ئەم دینە پاك و بێگەردە کە دورە لە هاوبەش دانان بۆ خوا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

(مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إِلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ، وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ؛ ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ، وَيَفْعَلُونَ مَا لا يُؤْمَرونَ؛ فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَيسَ وَرَاءَ ذلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ)(١).

واتە: هەموو پێغەمبەرێ کە خوای گەورە ناردویەتی بۆ ناو میللەتێ، لەپێش مندا، ئەو پێغەمبەرە لە گەلەکەی خۆیدا چەند برادەر و هاوڕێیەکی باشی هەبووە، کە ئەو پێغەمبەرەیان کردووە بە سەرمەشقی خۆیان و ڕەفتاریان بە ڕەفتاری ئەو کردووە، لەپاشدا چەند چینێك لەدوای ئەوان بوون بە جێگەداری ئەوان قسەو ڕەفتاریان لەیەك جیابوو، ئەوەی دەیانوت ڕەفتاریان پێ نەدەکرد، ڕەفتاریان دەکرد بەوەی کە فەرمانیان پێ نەکرا بوو، جا هەرکەسێك بە دەست جیهادیان بکات ئەوە باوەڕدارە، هەرکەسێك بە زمان جیهادیان بکات ئەوە باوەڕدارە، هەرکەسێك بە دڵ جیهادیان بکات ئەوە باوەڕدارە، ئیتر لەمە بترازێ بە ئەندازەی دەنکی تۆوە خەرتەلەیەك ئیمان و باوەڕی نیە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (سَيَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي أُنَاسٌ يُحَدِّثُونَكُمْ مَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ؛ فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ)(٢).

واتە: لە کۆتایی ئوممەتەکەی مندا خەڵکانێ پەیدا دەبن بەشێوەیە شتی واتان بۆ باس دەکەن نە خۆتان و نە باب و باپیرانتان نەیبیستوەو هەرگیز گوێتان لەو

---

(١) – اخرجه مسلم: ٥٠/١ ( ٥٠ ) ( ٨٠ ).

(٢) – رواه البخاري .

شتانە نەبووە، بۆیە ئاگادار بن شوێنیان نەکەون و پێیان نەخەڵەتێن و لێیان دووربکەونەوە.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

دەڵێن بیدعە بریتیە لە: هەموو بیروباوەڕێك یان پەرستشێك کە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) بە دینیان دانانەوە، واتە: بریتیە لە هەر کاروکردەوەیە کە بەڵگەی شەرعی نەهاتووە لەسەر کردنی لە قورئان و سوننەدا، کەواتە بیدعە بریتیە لە ئەو شتەی کە داهێنراوە لەدوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و لەدوای هاوەڵەکانی لەو شتانەی کە هەواو ئارەزوو کردەوەن، هەموو ئەو شتانەی کە لە دیندا داهێنراون و لە دین نیە، لە عادات نیە، لەبەر ئەوە ئەسڵ لە عادات ڕێگەی پێ دراوە.

پوختەی ئەو باسە بیدعە بریتیە:

لە هەرشتێکی داهێنراو لەدیندا لەدوای ئەوەی کە دینی ئیسلام تەواو بووە؛ لە ڕێگەیەکی داهێنراو کە خۆی لەشێوەی شەریعەتی بەرز و پیرۆز پیشان دەدات؛ بەمەبەستی پەرستش و نزیك بوونەوە لەخوای گەورە.

کەواتە بیدعە؛ بەرامبەر بە سوننەتە! هەرچەندە سوننەت ڕێنمویی و ڕزگاربوون و سەرفەرازی و سەرکەوتنەو، ڕێگای راستەو، گەیەنەرە بە ڕەزامەندی خوای گەورە و بەهەشتی هەتا هەتایی.

بیدعەش حەرامە! گومڕاییە بە هەموو جۆرەکانیەوە، گەیەنەرە بە ئاگری دۆزەخ ، بیدعە دورخەرەوەیە لە خوای گەورە، لە بەزەیی خوای پەروەردگار، لە بەهەشتی هەتا هەتایی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي، وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الْمَهْدِيِّينَ الرَّاشِدِينَ؛ تَمَسَّكُوا بِهَا، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ؛ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ)[1].

واتە: ئاگاداربن دەستبگرن بە سوننەتی منەوە، هەروەها دەستبگرن بە سوننەتی خەلیفە راشیدینە رێنمویی کراوەکانەوە، بە توندی دەستی پێوە بگرن، بە خرێکانتان قەپی پێدا بکەن، ئاگاداربن لە شتە داهێنراوەکان لەدیندا، بێگومان شتە شتە داهێنراوەکان لەدیندا بیدعەیە، هەموو بیدعەیەکیش گومڕایی یە.

ئەهلی سوننە و جەماعە: باوەڕیان وایە کە بیدعە لە دیندا دوو جۆرە:

**جۆری یەکەم:** بیدعەیەکی بیروباوەڕی و گوفتار؛ وەکو ئەو بیروباوەڕ و وتانەی ئەو دەستەو گروپ و تاقمە گومڕایانە کە سەرپێچی کاری ئەهلی سوننە و جەماعەن وەك بیدعەی؛ (جَهْمِيَّة، مُعتَزِلة، قدرِيّة، رافِظَة) و هەرکەسێکیش شوێن ئەوان بکەوێ و رێگەو رێبازی ئەوان بگرێتەبەر.

**جۆری دووەم:** بیدعە لە پەرستشەکاندا؛ وەك پەرستشێ کە خوای گەورە داینەنابێ و بڕیاری لەسەر نەدابێ، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) نەیکردبێ و فەرمانی پێ نەکردبێ و دانی پێدا نەنابێ، هاوەڵانیش نەیانکردبێ.

ئەهلی سوننەو جەماعە: باوەڕیان وایە کە بیدعە لە دیندا بە هەموو شێوە و جۆرەکانیەوە حەرامەو گومڕاییەو وەرنەگیراوەو رەتکراوەیە؛ لەبەر فەرمودەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێت: (مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيسَ مِنْهُ؛ فَهُوَ رَدٌّ)[2].

واتە: هەرکەسێك شتێك لەم دین و شەرعەی ئێمە زیاد بکات کە تیایدا نەبێت، ئەوە رەتدەکرێتەوەو لێی وەرناگیرێت.

---

(١) – (صحيح سنن أبي داود) للألباني.

(٢) – مُتَفَقٌ عَلَيْهِ. أخرجه البخاري ٢٤١/٣ ( ٢٦٩٧ ) ، ومسلم ١٣٢/٥ ( ١٧١٨) ( ١٧ ) و( ١٨).

هەروەها لەبەر فەرمودەکەی (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيهِ امرُنا؛ فَهُوَ رَدٌّ)(١).

واتە: هەرکەسێك هەر کاروکردەوەیەك بکات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت و بەپێی شەرع نەبێ ئەوە رەتدەکرێتەوەو لێی وەرناگیرێت.

لەبەر فەرمودەکەی (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت: (فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَخَيْرُ الْهُدَى هُدَى مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ)(٢).

واتە: بێگومان باشترین قسە کتێبەکەی خوای گەورەیە، باشترین رێبازیش رێبازی موحەممەدە، خراپترین کاریش ئەوەیە کە داهێنراوە لەدیندا واتە بیدعەیە، هەموو بیدعەیەکیش گومڕایی یە.

بەڵام وشەی حەرام و قەدەغەکردن لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە؛ جیاوازە بەگوێرەی جۆری بیدعەکە، کە ئەویش دوو جۆرە:

* جۆرێکیان هاوبەش دانانە بۆ خوای گەورە و بێ باوەڕی ئاشکرایە؛ لە بیروباوەڕدا؛ وەك وتەو تێڕوانین و وتارەکانی جەهەمیەو موعتەزیلە.

لە پەرستشەکاندا؛ وەك تەواف و سوڕانەوە بەدەوری گۆڕدا بە مەبەستی نزیك بوونەوە لە خاوەنەکەی، ئاژەڵی بۆ سەردەبڕێ و پێشکەشی دەکات، (نذر) لەسەرخۆی پێویست دەکات، داوای پاڕانەوەی لێ دەکات، هانای بۆ دەبەن و هاواری لێ دەکەن، هەروەها جۆر و وێنەی ئەوانە.

* جۆری سەرپێچی و تاوان تەواوی تەوحیدو یەکخواناسی رەتدەکاتەوە، هۆکار و وەسیلەیەکە بۆ هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە، وەك بینا کردن لەسەر گۆڕ، نوێژکردن و پاڕانەوە لەلای گۆڕدا، جگە لەمانەش لە جۆرەکانی بیدعە.

---

(١) - رواه مسلم.

(٢) - رواه مسلم.

ئەهلی سوننە و جەماعە،

وا دەبینن کە بیدعە لەدیندا: هۆکارێکە لە هۆکارەکانی هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە، ئەویش بە مەبەستی پەرستش و نزیکبونەوە لە خوای گەورە دەکرێت جگە لەوەی کە خوای پەروەردگار بە شەرعی داناوە واتە بە پێی شەرع نیە، **هۆکارەکان هەمان حوکمی مەبەستەکانی هەیە**، پێویستە هەموو بیانو بەهانەیەك کە هۆکار بێت بۆ هاوبەش دانان لە عیبادەتی خوای گەورەدا، یان بێتە هۆکاری داهێنان لەدیندا پێویستە رێی لێ بگیرێ و دابخرێت، لەبەرئەوە دین تەواو بووە لەژیانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، بە دڵنیاییەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەموو کاروبارێکی لەدیندا رونکردۆتەوە: یان بە وتەو فەرمایشتی، یان بە کردەوەی خۆی، یان بە دانپێدانانی، یان سەرەتا بۆ خۆی دیاریکردووە – بۆ نموونە لە وتارێکدا فەرمویەتی ئەوە بکەن، ئەوە مەکەن، ئەوە حەڵاڵە، ئەوە حەرامە – ، یان پرسیاری لێ کراوە و وەڵامی داوەتەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هیچ شتێکی تەرك نەکردووە کە خەڵك پێویستیان پێی بێت لە پەرستشەکانیان و مامەڵەو کرین و فرۆشتنیاندا، ئیللا رونیکردۆتەوە بۆیان بە رونکردنەوەیەکی تەواو هیچ پێویستی بە زیادەو کەموکورتی نەبێت، بەڕاستی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئوممەتەکەی بەجێهێشتوە لەسەر بەڵگەیەکی سپی رون؛ شەوەکەی وەکو رۆژەکەی وایە، کەسێ لێی لانادات ئیللا ئەو کەسە تیاچوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾ المائدة: ٣.

واتە: ئەمڕۆ دینەکەتانم تەواو(کامل)کردووە بۆتان و چاکەو بەهرەی خۆم بەتەواوی ڕشتووە بەسەرتانداو، رازی بووم کە ئیسلام دینتان بێت.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە کە بنچینەکانی ئەهلی بیدعە پێنجن: کە بریتیە لە (خوارج) دەرچوەکان ئەوانەی کە دەرچون لە فەرمانی ئەمیر، (روافض) ڕەتکەرەوەکان ئەوانەی کە ڕەفزی خەلافەتی ئەبو بەکر و عومەریان کرد، (جَهَمیَة)کان ئەوانەی کە شوێن جەهمی کوڕی صەفوان کەوتن،، ئەندازەگیرەکان(قدريّة) ئەوانەی کە دەیانوت قەدەر نیە، (مرجئة) تکاکارەکان ئەوانەی کە دەیانوت هەرچی دەکەیت بیکە گرنگ ئەوەیە لە دڵدا باوەڕت هەبێ؛ لەپاشدا هەر دەستەو تاقمێك لەوانە چەندەها دەستەو تاقمی تری لێ بووەوە، تا حەفتاو دوو دەستەو تاقمەکەی تەواوکردووە؛ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی لەبارەوە داوە، لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (تَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً؛ كُلُّهُمْ فِي النَّارِ إِلاَّ مِلَّةً وَاحِدَةً). قَالَ: مَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (مَا أَنَا عَلَيْهِ وَأَصْحَابِي)[1].

واتە: (ئوممەتەکەی من پارچە پارچە دەبێت بۆ حەفتاو سێ بەش، هەر هەموویان دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە تەنها یەك بەشیان نەبێت، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو کۆمەڵە کامەیە کە ناچنە ناو دۆزەخەوە؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە من و هاوەڵەکانم ئەمڕۆ لەسەرینی).

ئەهلی سوننە و جەماعە:

* باوەڕیان وایە ئەگەر بیدعەیە پێچەوانەی قورئان و سوننە و کۆدەنگی و یەکرایی زانایان نەبێت؛ ئەوە بیدعەی خراپ (سيئة) نیە؛ بەڵکو بیدعەیە لە زمانەوانیدا، دەگونجێ بیدعەی چاك (حسنة) بێت: وەکو چاپکردنی قورئانی پیرۆز، وەکو چۆنیەتی و شێوازەکانی بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری و هۆکارەکانی،

(١) - صحيح سنن الترمذي للألباني.

وەکو ڕێکخستنی لەشکر و سوپا، وەکو دیوانەکان و، وێنەی ئەوانە، یان دەچێتە بابی (مصالح مرسلة)ەوەو، هەرشتێ واجبێ بەو نەبێ ئەنجام نەدرێ ئەو شتەش واجبە.

* باوەڕیان وایە ئەگەر بیدعەیە پێچەوانەی قورئان و سوننە و یەکڕایی زانایانی سەلەفی ئوممەت بێت؛ لە بیروباوەڕ و لە پەرستشەکاندا؛ ئەوە بیدعەیە، گومڕایەتیە، ڕەتکراوەیە بە ڕێککەوتنی تێکڕای موسوڵمانان و، بە سەرجەم شێوە و جۆرەکانیانەوە.

بەڵام باوەڕیان وا نیە کە بیدعە لەدیندا یەك پلەیە، بەڵکو (تفصیل و بیان)درێژەپێدان و ڕونکردنەوەی دەوێ ئەم باسە؛ حوکمی کارەکەو حوکمی ئەو کەسەی کە کارەکە دەکات جیاوازە، جیاوازە بە گوێرەی جیاوازی جۆرەکەی، هەندێ بیدعە ئەنجامدەرەکەی پێی لەدین دەردەچێت، هەندێ بیدعە لەڕیزی تاوانە گەورەکانن، هەندێکیشیان لە تاوانە بچوکەکانن، بەڵام سەرجەمیان بەشدارن لە پێناسەی گومڕایەتی وەلەوەی کە پێچەوانەی قورئان و سوننە و یەکڕایی زانایانە؛ بیدعەی گشتی(کلّي) وەك بیدعەی بەشی(جزئي) نیە، بیدعەی تێکەڵ و ئاوێتەکراو(مرکب) وەك بیدعەی سانا(بسیط) نیە، بیدعەی (حقیقي) وەك بیدعەی (إضافي)دەیخرێتەسەر نیە، نە لە خودی بیدعەکان خۆیاندا، نە لە حوکمی شەرعیاندا، هەندێکیان بیدعەی بێ باوەڕین، هەندێکیان بیدعەی لەسنوردەرچونن؛ لە حوکاندا جیاوازە، هەروەها حوکمی بکەرەکەشیان هەر جیاوازە.

ئا لەم بنەماو قاعیدە شەرعیەوە؛ ئەهلی سوننە و جەماعە یەك حوکم نادەن بەسەر ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزوودا، بەڵکو حوکمەکەیان جیاوازەو لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت بە گوێرەی بیدعەکەی و حاڵەکەی؛ کەسێ کە نەزانەو تەئویل دەکات بەبیروبۆچونی خۆی لێکی دەداتەوە؛ وەك ئەو کەسە نیە کە زانایەو بانگەشە بۆ بیدعەکەی دەکات، زانایەکی (مجتهد)؛ وەك ئەو کەسە نیە کە بانگەواز

بۆ بیدعەکەی دەکات، ئەو کەسەش کە شوێن هەواو ئارەزوو دەکەوێ و بە ئارەزوو دەیکات.

هەر لەبەر ئەوەیە کەسێ کە بیدعەکەی بشارێتەوە مامەڵەی لەگەڵ ناکەن؛ وەك کەسێ کە ئاشکرای دەکات و بانگەوازی بۆ دەکات؛ لەبەر ئەوەی کەسی بانگخواز بۆ بیدعە زیان بەخەڵکی تر دەگەیەنێت، بۆیە پێویستە دەستی پێ لێ هەڵبگیرێت، بە ئاشکرا ئینکاری بکرێ و رێی لێ بگیرێ، باسکردنی غەیبەت نیە، سزادەدرێت بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە لە بیدعەکەی و وازی لێ بهێنێت، ئا ئەمە سزایە بۆ ئەو کەسە تا دەست هەڵدەگرێت لە بیدعەکەی، لەبەرئەوە بە ئاشکرا (منکر)کاری خراپ دەکات بۆیە شایستەی ئەوەیە کە سزابدرێت؛ بۆیە ئەهلی سوننە و جەماعە بۆ هەموو کارێك هەڵوێستی جیاواز وەردەگرن؛ بەپێی رێکخەرە شەرعیەکان(ضوابط الشرعیه) کارەکانیان هەڵدەسورێنن و حوکم دەدەن؛ بە شێوەیەکی ناوەندێتی و دادپەروەرانە بە بێ رۆچون و بەبێ لاگری نە زۆر و نەکەم .*[1]

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

بەبەزەیین بەرامبەر بە سەرجەم ئەهلی بیدعەو ئەو کەسانەی لاساییان دەکەنەوە و تەقلیدیان دەکەن، دوا لە خوای پەروەردگار دەکەن کە هیدایەتیان

* أول بدعة ظهرت في الدين التفريق بين الصلاة والزكاة، وادعاء أن الزكاة لا تؤدى إلا للرسول صلى الله عليه وسلم فتصدى لهم الصديق – رضي الله عنه – وقاتلهم وقضى عليهم قبل أن يستفحل أمرهم، ولو تركهم على ذلك لأصبحت دعواهم ديناً إلى يومنا هذا، وفي عهد عمر ظهرت بعض البدع الصغيرة فأماتها رضي الله عنه ، وفي عهد عثمان حدثت أوائل الفتنة الكبرى وهي الخروج على الإمام الحق بالسيف، وانتهت بدعتهم بمقتله رضي الله عنه ، وكان هذا بداية فتنة الخوارج إلى يومنا هذا ثم توالت البدع؛ فجاءت القدرية، والمرجئة، والرافضة، والزنادقة، والفرق الباطنية، والجهمية، ومنكرو الأسماء والصفات .. إلى غيرها من البدع، وكلما ظهرت البدع كان أهل السنة لهم بالمرصاد، ولا يزال الصراع بين أهل الحق وأهل الباطل باقيا إلى يومنا هذا وإلى يوم الدين، وأهل السنة يكشفون اللثام في كل زمان ومكان عن كل قول أو فعل يخالف القرآن والسنة وإجماع الأمة.

بدات، ئاواتەخوازی ئەوەن کە شوێن سوننەت و هیدایەت و ڕێنمایی و ڕێگای ڕاست بکەون، هەر ئاواتەخواز نین و بەس بەڵکو بۆشیان ڕون دەکەنەوە بە حیکمەت و دانایی و ئامۆژگاریی جوان؛ تا تەوبە دەکەن و وازدەهێنن لە بیدعەکەیان، دەگەڕێنەوە بۆ سەر هەق و ڕاستی و جەماعە، بە ڕواڵەت حوکم دەدەن بەسەریاندا، نهێنیەکانیان دەگێرنەوە بۆ خوای گەورە و بەوی دەسپێرن، ئەگەر بیدعەکانیان بێ باوەڕی نەبێت.

نیشانەکانی ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزوو:

ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزوو چەند نیشانەیەکیان لێ دەردەکەوێت و بەوەدا دەناسرێنەوە، خوای گەورە لە قورئانەکەیدا هەواڵی داوە لە بارەیانەوە، هەروەها پێغەمبەرەکەیشی (صلی الله علیه وسلم) لە سوننەتەکانیدا هەواڵی داوە، ئەمەش وەك هۆشیاریدانە بۆ ئوممەت کە ئاگایان لەو بیدعەچیانەیان بێت و پێیان نەخەڵەتێن، وەك ڕێگری کردنە لەوەی شوێن ڕەفتار و ڕێگەو ڕێبازیان بکەون، ئەمانەش هەندێك لە نیشانانەکانیانن:

نەزانی و نەشارەزایی دەربارەی ئەحکامەکانی دین و مەبەستەکانی شەریعەت، سەیرنەکردنی ئەو شەرعەی کە دابەزێنراوە لەلایەن خوای گەورەوە بە چاوی تەواوەوە؛ واتە شەریعەت بە ناتەواو دەزانن، خۆیان نادەن بەدەست دەقەکانی شەریعەتەوەو ملکەچ ناکەن بۆیان، خۆ نزیك دەکەنەوە لە خوای گەورە بە شتێ کە بە شەرعی دانەناوە، پارچە پارچەیەتی و هەوڵدان بۆ دابەشکردنی ئوممەتی ئیسلام و جیاوازی خستنە نێوانیان و لەتکردنی کۆمەڵی موسوڵمانان، دەمەدەمێ و موناقەشەو بەربەرەکانێی بێ بایەخ دەکەن، شوێنی هەواو ئارەزوو دەکەون، عەقڵ پێش نەقڵ دەخەن، لە سوننەت نەشارەزان، پشت بەو فەرمودانە دەبەستن کە لاواز(ضعیف)ن یان دانراو(موضوع)ن، ئەو فەمودانە ڕەتدەکەنەوە کە لەگەڵ

بیدعەکانیاندا ناگونجێن، ڕۆدەچن لە مەسەلە وێکچوەکان(متشابهات)دا، دژایەتی سوننەت دەکەن بە قورئان، ڕۆدەچن لە بە گەورەدانانی کەسەکان و دەمارگیری بۆ بیروبۆچونەکانیان، شوێن عورف و عادەت دەکەون لەگەڵ ئەو شتانەی کە باون، ڕۆدەچن لە خواپەرستی دا، خۆدەچوێنن بە بێ باوەڕان، ناو و ناتۆرەی خراپ دەنێن لە ئەهلی سوننە، رقیان لە ئەهلی (أثر)ە واتە ئەو کەسانەی کە شوێنکەوتەی سەلەفن، دژایەتی کردنی هەڵگرانی فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و سوکایەتی پێ کردنیان، تەکفیر کردن و بێ باوەڕکردنی ئەو کەسانەی کە پێچەوانەی خۆیانن بەبێ بەڵگە، داوای یارمەتی کردن لە کاربەدەستان و دەسەڵاتداران و خەڵکانی تر لەدژی ئەهلی هەق.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

کۆمەڵێ هەوڵ و کۆششی سوپاسکراویان هەیە لە بەرپەرچدانەوە و ڕەددانەوەیان بۆسەر ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزوو، لە هەموو کات و زەمانێکدا لە کەمیندا بوون بۆیان و بەرپەرچیان داونەتەوە؛ پەردە لەسەر بیدعەکانیان لادەبەو ئاشکرایان دەکەن، وتار و بۆچونە پوچ و ساختەکانیان روندەکەنەوە بۆ خەڵك، پەردە لەسەر درۆکانیان هەڵدەماڵن لەگەڵ ئەو بانگەوازە پروپوچانەی کە دەیکەن.

وتەی ئەهلی سوننەو جەماعە دەربارەی ئەهلی بیدەع و هەواو ئارەزوو زۆر زۆرە، لێرەدا بەکورتی باسی دەکەین ئەوەی کە بگونجێ:

* پێشەوا ئەحمەدی کوڕی سینان (قطّان) رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (لەدونیادا بیدعەچیەك نیە ئیللا ئەو بیدعەچیە رقی لە ئەهلی (حدیث)فەرمودەیە، هەر کەسێ بیدعەیەکی داهێنا؛ شیرینی فەرمودە لەدڵیدا هەڵئەکەنرێ و نامێنێ)[1].

---

(١) – (التذكرة) للإمام النووي.

* پێشەوا ئەبو حاتیم (حنظلي) ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ دەڵێت: (نیشانەی ئەهلی بیدعە ئەوەیە دەکەونە تانەدان و جنێودان بە ئەهلی (أثر) و لەکەدار کردنیان، نیشانەی بێ باوەڕەکان(زنادقە) ئەوەیە بە ئەهلی سوننە دەڵێن ئەمانە حەشەوین ئەم لە فز دێنن بۆ لای ئەو لەفز، دەیانەوێت (آثار)ەکان پوچەڵ بکەنەوە، نیشانەی جەهمیە ئەوەیە ئەهلی سوننە بە (مُشَبِّهَة) ناو دەبەن دەڵێن ئەمانە موشەبیهەن، نیشانەی قەدەریە ئەوەیە کە ئەهلی سوننە بە (مُجبِرَة) ناو دەبەن – واتە خوای پەروەردگار مرۆڤەکان ناچار دەکات کە پەرستشی بۆ بکەن – ، نیشانەی مورجیئە ئەوەیە کە ئەهلی سوننە بەوە تۆمەتبار دەکەن کە ئەوانە کەسانێکی سەرپێچیکار و کەمتەرخەمن، نیشانەی (رافِضَة) ئەوەیە ناوی (ناصِبة) لە ئەهلی سوننە دەنێن – دەڵێن ئەهلی سوننە نەصبی دژایەتی ئال و بەیت دەکەن – ، بەڕاستی ئەهلی سوننە تەنها یەك ناوی هەیە دەبێت بە پاشکۆی ئەویش ئەهلی سوننەیە، هەرگیز ناگونجێ ئەو ناوانە کۆببنەوە لە ئەهلی سوننەتدا)[1].

* پێشەوا ئەبو موحەممەدی بەربەهاری ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (ئەگەر بیستت لە پیاوێ وتی: فلانەکەس (مُشَبِّهَة)یە، فلانەکەس دەربارەی (مُشَبِّهَة) دەدوێ؛ ئەوە تۆمەتباری بکە، ئەوە بزانە کە ئەو کەسە جەهمیە. ئەگەر بیستت لە پیاوێ وتی: فلانەکەس (ناصِبي)ە؛ ئەوە بزانە کە ئەو کەسە (رافِضَة)یە. ئەگەر بیستت لە پیاوێ وتی: باسی تەوحید و یەکخواناسیم بۆ بکە و ڕافەی تەوحید و یەکخواناسیم بۆ بکە؛ ئەوە بزانە ئەو کەسە خەواریج و موعتەزیلی یە. یان وتی: فلانەکەس (مُجبِر)ەیە واتە بەزۆر کارەکانی پێ دەکرێت، یان باسی زۆرلێ کردن(إجبار)ی کرد، یان باسی (عدل) دادپەروەری خوای گەورەی کردو قسەی لەبارەی (إجبار) و

---

(١) – أصل السنة واعتقاد الدين: للإمام الرازي.

(عدل)ەوە دەکرد؛ ئەوە بزانە ئەو کەسە قەدەریەیە واتە بڕوای بە قەدەر نیە؛ لەبەرئەوە ئەم ناوانە داهێنراون و ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزووش دایانهێناون)[1].

* بە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕەحمەتی خوای لێ بێ وترا: لە شاری مەککە لەلای ئیبنو قوتەیلە باسی فەرمودەناسان(أصحاب الحديث)کرا، ئیبنو قوتەیلە وتی: (أصحاب الحديث) قەومێکی خراپن، پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هەستایەوە پۆشاکەکەی خۆی کۆکردەوە، دیوت: (ئیبنو قوتەیلە زندیقە زندیقە زندیقە! هەتا گەیشتەوە ماڵەوە)[2].

خوای گەورە ئەهلی سوننە و جەماعەی پاراستوە، ئەهلی فەرمودەو (أثر)ی پاراستوە، ئەهلی شوێنکەوتەی ڕاستەقینەو قورئان و سوننەت و کردوەی پاراستوە، ئەهلی هەق و ڕاستی ئاشکرای پاراستوە، لەهەموو ئەو عەیبەو ئەنگیانەی کە دراوەتە پاڵیان؛ بەڕاستی ئەوانە هیچ نین تەنها کەسانێکن ئەهلی سوننەی هەقیقین، ژیاننامەیەك جێگەی ڕەزامەندی تەواون، ڕێگەیەکی ڕاست، خاوەنی ئەوپەڕی بەڵگەی بەهێزن، پاسەوان و پارێزەری شەریعەتن، ئەوان کۆمەڵی سەرخراو و ڕزگاربوون، ئەوان کەسانێکی دەرکەوتون و لەسەر هەقن هەتا ڕۆژی قیامەت.

بەڕاستی خوای گەورە یارمەتی داون بۆ شوێنکەوتنی قورئانە گەورەو پیرۆزەکەی خۆی، خوای پەروەردگار هیدایەتی داون بۆ شوێنکەوتنی ڕێ و شوێنی پێغەمبەرە بەڕیزەکەیان (صلى الله عليه وسلم) و کردەوە کردن بە سوننەتەکانی، خوای گەورە سنگ و دڵەکانیانی فراوان کردون بۆ خۆشویستنی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها بۆ خۆشویستنی هاوەڵە بەڕێزەکانی ڕەزای خوایان

(١) - شرح السنة للإمام أبي محمد الحسن بن خلف البربهاري.

(٢) - أصل السنة واعتقاد الدين: للإمام الرازي.

لێ بێ، کە چراکانی روناك کەرەوەی شەوزەنگ و تاریکی بوون، بۆ خۆشویستنی ئەوانەی کە شوێن ئەوان کەوتون بە راستی و بە دڵسۆزی و بە نیازپاکی و بە چاکە، بۆ خۆشویستنی ئەوانەی کە فێری زانستی ئەوان بووەو کردەوەی کردووە بە زانستی ئەوان، شوێن شوێنەوارەکەیان کەوتووە؛ لە پێشەوایانی دین کە گەورە پیاوانن، لە زاناکانی ئوممەت ئەوانەی کە کردەوە دەکەن بەو زانستەی کە هەیانە.

هەرکەسێ هەر کۆمەڵ و گەل و هۆزێکی خۆش ویست ئەوە لەوانە؛ هەروەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: (الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ)[1].

واتە: پیاو لەگەڵ ئەو کەسەیە کە خۆشی ویستوە.

هەرکەسێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵە بەڕێزەکانی رەزای خوایان لێ بێ خۆش بوێت لەگەڵ شوێنکەوتووە گەورەکان و شوێنکەوتەی شوێنکەوتوان لە پێشەوایانی رێنمویی کراو، لە زانایانی شەریعەت و، ئەهلی (حدیث) و (أثر)، لەهەر سێ چەرخ و سەدە گەورەو چاکەکەی یەکەم و، هەر کەسێکیش کە شوێن ئەوان کەوتووە تا ئەم رۆژگارەی ئێستە؛ ئەوە بزانە کە ئەو کەسە خاوەنی سوننەیە[2]*.

---

(١) – رواه البخاري.

• حكم الصلاة خلف أهل البدع: اعلم أن خلاصة أقوال أهل السنة في هذه المسألة ما يلي:

• أن الصلاة لا تجوز خلف الكافر الأصلي والمرتد.

• ترك الصلاة خلف مستور الحال ومن لم تعرف عقيدته، بدعة لم يقل به أحد من السلف.

• الأصل النهي عن الصلاة خلف المبتدع تقبيحاً لبدعته وتنفيراً عنه؛ فإن وقعت صحت.

حكم ترك الصلاة والترحم على أهل البدع:

• إن من مات كافراً أصلياً، أو مرتداً عن دينه، أو كفر ببدعته وأقيمت عليه الحجة بعينه؛ فإنه لا تجوز الصلاة، ولا الترحم عليه، وهذا مجمع عليه.

• من مات عاصياً، أو متلبساً ببدعة لا تخرج من الدين؛ فإنه يشرع للإمام ولمن يقتدي به من أهل العلم ترك الصلاة عليه زجراً للناس وتحذيراً لهم من معصيته وبدعته، ولا يعني تحريم ذلك على الجميع؛ بل الصلاة عليه والدعاء له فرض كفاية، ما دام أنه لم يمت كافراً وصار ممن يحكم عليه بالخلود في النار.

## لە وەسیەت و ئامۆژگاریەکانی پێشەوایانی سەلەف سەبارەت بە هۆشیاریدان و ئاگادارکردنەوە لە ئەهلی بیدەع و هەواو ئارەزوو

* ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی (خطاب) رەزای خوای لیٚ بیٚ دەڵێت: (يَأتِي أناس يُجادلونكُم بشُبُهات القرآن، خُذوهُم بالسنَنِ؛ فإن أصْحابَ السّنَنِ أعْلَمُ بكِتاب اللهِ)[١]. واتە: لەمەودوا کەسانێك دێن بۆ لاتان بە وێکچوەکانی قورئان دەمە دەمیٚ و موناقەشەو قسەتان لەگەڵ دەکەن، ئێوەش بە سوننەتەکان بیانگرن و قسەیان لەگەڵ بکەن، لەبەرئەوە هاوڕێیانی سوننەن(أصْحابَ السّنَنِ) شارەزاترین کەسن بە قورئان.

* (عَبْدُ اللهِ)ی کوڕی عومەر رەزای خوایان لیٚ بیٚ لە وەڵامی ئەو کەسەدا کە پرسیاری لیٚ کرد دەربارەی ئەو کەسانەی کە ئینکاری قەدەر دەکەن و دەڵێن قەدەر نیە، وتی: (إذا لَقيتَ أولئك؛ فأخْبِرْهُم أن ابنَ عُمرَ مِنهُم بَريءٌ، وهُم مِنهُ بُرآء؛ ثلاث مرات)[٢].

واتە: ئەگەر گەیشتی بەو جۆرە کەسانە؛ ئەوا هەواڵیان بدەریٚ بەوەی کە ئیبنو عومەر لێیان بەریيە و دورەپەرێزە لێیان، ئەوانیش لەو بەرین؛ سیٚ جار ئەمەی وتەوە.

* (عَبْدُ اللهِ)ی کوڕی عەباس رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەڵێت: (لا تُجالسْ أهلَ الأهواء؛ فإن مُجالَسَتَهُم مَرضَة للقَلْب)[٣].

واتە: لەگەڵ ئەهلی هەواو ئارەزو و بیدعەچیەکاندا دامەنیشە بەشداری کۆڕ و کۆمەڵیان مەکەن؛ چونکە دانیشتن لەگەڵیاندا دەبێتە هۆکاری نەخۆش خستنی دڵ.

* زانای زاهیدو خواناس (فُضَيل)ی کوڕی (عیاض) رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ دەڵێت:

---

(١) - اخرجه الإمام اللالكائي في (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة)، وابن بطة في: (الإبانة).

(٢) - اخرجه الإمام اللالكائي في (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة)، وابن بطة في: (الإبانة).

(٣) - اخرجه الإمام اللالكائي في (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة)، وابن بطة في: (الإبانة).

(صاحبُ بدعَة لا تأمَنه عَلى دينِك، ولاَ تُشاورهُ في أمْرِك، ولاَ تجلس إليه، ومَنْ جَلَسَ إلى صاحِبِ بدعة أوْرثَهُ اللهُ العَمَى). يعني في قلبه[١].

واتە: لە بیدعەچی ئەمین و دڵنیا مەبە لەسەر دینەکەت، لە کاروبارەکانتدا هەرگیز پرس و راوێژی پێ مەکە، لەلایدا دامەنیشە، هەرکەس لەلای بیدعەچیەکدا دانیشێت خوای گەورە دڵەکەی کوێر دەکات.

* پێشەوا حەسەنی بەصری رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (أبى اللهُ تبَاركَ وتَعالى أنْ يأذَنَ لِصَاحِب هَوى بتَوبة)[٢].

واتە: خوای گەورە مۆڵەتی بیدعەچی و ئەهلی هەواو ئارەزوو نادات تا تەوبە بکات و پەشیمان ببێتەوە.

* (عَبْدُ الله)ی کوڕی موبارەك رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (اللّهُمَ لاَ تَجْعَلْ لِصَاحِبِ بِدْعَة عِنْدي يَدا؛ فَيُحبه قَلْبِي)[٣].

واتە: ئەی خوای پەروەردگار هەرگیز دەستی بیدعەچیەك نەدەیت کە چاکەیەکی بەسەرمەوە هەبێت؛ بە هۆی ئەو چاکەوە دڵەکەم خۆشی بوێت.

* پێشەوای باوەڕداران لە فەرمودەدا سوفیانی (ثوري) رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (مَنْ أصغى سَمْعَهُ إلَى صَاحب بِدْعَة وهُو يَعْلَمُ أنهُ صاحِبُ بِدْعَةٍ؛ نُزِعَتْ مِنْهُ العِصْمَةُ، ووُكِل إلَى نَفْسِه)[٤].

واتە: هەرکەسێ گوێ بگرێت بۆ بیدعەچیەك، لەکاتێکدا کە بیشزانێ ئەو کەسە بیدعەچیە؛ خوای گەورە پارێزراویەتی خۆی لێ دەسێنێتەوە و دەیداتە دەستی خۆی واتە خوای پەروەردگار پارێزگاری لێ ناکات.

---

(١) – أخرجه الإمام اللالكائي في (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة)، وابن بطة في: (الإبانة).

(٢) – أخرجه الإمام اللالكائي في (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٣) – أخرجه الإمام اللالكائي في (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٤) – رواه ابن وضاح في: «البدع والنهي عنها».

* پێشەوا ئەوزاعی رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (لاَ تُمكنوا صاحِبَ بِدْعَةٍ منْ جَدَلٍ؛ فَيورثَ قُلوبَكُم منْ فِتْنَتِهِ ارْتِيابا)[١].

واتە: هەرگیز بوار مەدەن بە بیدعەچی موناقەشەو موجادەلەتان لەگەڵ بکات؛ ئەگینا بە هۆی ئەوەوە دڵەکانتان توشی فیتنەی گومان و دودڵی دەبێت.

* موحەممەدی کوڕی سیرین رەحمەتی خوای لێ بێ دەربارەی بیدعە هۆشیاری دەدات و دەڵێت: (مَا أَحْدَثَ رَجُل بِدْعَة؛ فَرَاجَع سُنة)[٢].

واتە: هیچ پیاوێ نیە بیدعەیەکی لە دیندا داهێنابێ، بگەڕێتەوە سەر سوننە.

* پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (لا تُنْكِحُوا أَهلَ البِدَعِ وَلاَ يُنْكَحُ إِلَيْهِم، وَلا يُسلَّم عَلَيْهِم)[٣]. واتە: ئەهلی بیدەع ژنیان لێ مارە ناکرێت، ژنیشیان لێ داوا ناکرێت، سەلامیشیان لێ ناکرێت.

* پێشەوا شافیعی رەحمەتی خوای لێ بێ خەڵکانێکی بینی دەربارەی کەلام قسەیان دەکرد؛ جا دەنگی بەرزکردەوە بەسەریانداو وتی: (إِما أَنْ تُجاوِرونا بِخَيْر، وَإِمَا أَنْ تَقُوموا عنا)[٤]. واتە: یان ئەوەتا بە چاکی دراوسێیەتیمان بکەن یان ئەوەتا هەستن لەلامان و لێمان دوربکەونەوە.

* پێشەوای ئەهلی سوننە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (إِن أَهلَ البدَعِ والأَهْواءِ؛ لاَ يَنْبَغي أَنْ يُسْتَعانَ بِهِم فِي شَيء مِنْ أُمورِ المُسْلمينَ؛ فإن فِي ذَلِكَ أَعْظَم الضرر علَى الدين)[٥].

---

(١) – رواه ابن وضاح في: «البدع والنهي عنها».

(٢) – اخرجه الإمام مسلم في مقدمة صحيحه.

(٣) – «المدونة الكبرى» للإمام مالك.

(٤) – «مختصر كتاب الحجة على تارك المحجة» نصر بن إبراهيم المقدسي.

(٥) – مناقب الإمام أحمد » لابن الجوزي.

واتە: بە ڕاستی بیدعەچی و ئەهلی هەواو ئارەزووەکان؛ بە هیچ شێوەیە نابێت پشتیان پێ ببەسترێت و داوای یارمەتیان لێ بکرێت لە هیچ شتێکدا لە هیچ کاروبارێکی موسوڵمانان،دا چونکە ئەوە گەورەترین زیانی هەیە بۆ دین.

* هەروەها پێشەوا ئەحمەد دەڵێت: (احذر البِدَعَ كُلَّها، ولاَ تُشاور أَحَدا مِنْ أَهلِ البِدَعِ في دينك)[1].

واتە: (هۆشیاربە دەربارەی هەموو بیدعەکان، لەهیچ شتێکدا پرس و ڕاوێژ بە هیچ کەسێکی بیدعەچی مەکە لە دینەکەتدا.

* پێشەوا (عَبْدُ الرحمن)ی کوڕی مەهدی ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ دەڵێت: (إنه لَيْسَ في أَصْحاب الأَهْواءِ شَر مِنْ أَصْحابِ جَهم؛ يُريدون عَلى أَنْ يَقُولوا: لَيسَ في السَماءِ شَيء: أَرى وَاللهِ أَلّا يُنَاكَحُوا، وَلاَ يُوَارثُوا)[2].

واتە: لەناو ئەهلی هەواو ئارەزوودا نیە خراپتر بێت لە هاوڕێیانی جەهمی کوڕی صەفوان، دەیانەوێ کە بڵێن: هیچ شتێ لە ئاسماندا نیە! واتە خوای پەروەردگار لە ئاسماندا نیە، سوێند بە (الله) قەناعەتم وایە نە ژنیان بدرێتێ و نە بەشە میراتی.

* تابیعی و فەقیە ئەبو قیلابەی جەرمی بەصری ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (لاَ تُجالسوا أَهلَ الأَهْواء؛ فَإنكم إن لَمْ تَدْخلوا فيما دَخلوا فيه لبسوا عَلَيْكُم مَا تَعْرِفون)[3].

واتە: لەگەڵ بیدعەچیەکان و ئەهلی هەواو ئارەزوودا دامەنیشە، موناقەشەیان لەگەڵ مەکە؛ لەبەرئەوە ئەگەر نەچنە سەر ئەوەی کە ئەوان لەسەرینی کە دەیزانن لە دینی هەق لێتان تێك دەدەن و سەرتان لێ دەشێوێنن.

---

(١) - « مناقب الإمام أحمد » لابن الجوزي.

(٢) - « كتاب السنة » لعبد الله ابن الإمام أحمد.

(٣) - رواه إمام ابن بطة في: (الإبانة).

* (تَّابِعيُّ الحُجَّة) ئەیوبی سەختیانی ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ دەڵێت: (إِنَّ أَهلَ الأَهْواءِ، أَهلُ ضلالة، وَلاَ أَرى مَصيرهم إِلا النار)[١].

واتە: بە دڵنیاییەوە ئەهلی هەواو ئارەزوو، خەڵکانێکی گومڕاو سەر لیٚ شێواون، قەناعەتم وایە من سەرەنجامی ئەمانە نابینم تەنها بۆ ئاگر نەبێت.

* قازی ئەبو یوسف ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ دەڵێت: (لا أصلي؛ خَلْفَ جَهميّ، ولا رَافِضِي، وَلاَ قَدَري)[٢].

واتە: هەرگیز نوێژ ناکەم لەدوای جەهمی و (رافض)ی و قەدەریەوە.

* شێخی ئیسلام پێشەوا ئەبو (عثمان) ئیسماعیل صابونی ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ لە کتێبە بە نرخ و بەناوبانگەکەیدا کە بریتیە لە (عقيدة السلف أصحاب الحديث) دەڵێت: (نیشانەی ئەهلی بیدەع بەسەر خاوەنەکانیانەوە ئاشکراو دیارە، لە دیارترین نیشانەیان ئەوەیە زۆر بەتوندی دژایەتی هەڵگرانی فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەکەن و رقیان لێیانە، بە روکەش(حَشويَّة) و نەزان(جَهلة) و روکەش(ظاهرية) و (مُشبهة) ناویان دەبەن، بیروباوەڕیان وایە کە هەواڵەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و فەرمودەکانی دورن لەوەی کە زانستی بن و لەگەڵ زانستدا جیان، ئا ئەو زانستە کە ئەوان مەبەستیانە شەیتان دەیخاتە مێشکیانەوە لە ئەنجامی ئەو عەقڵە خراپەیان، لە ئەنجامی وەسوەسەی ئەو دڵە تاریکەیان)[٣].

* پێشەوا ئەبو موحەممەدی بەربەهاری ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ وتەیەکی زۆر جوانی هەیە کە توانیویەتی بەجوانی لایەنەکانی بیدعە دیاری بکات، لەکاتێکدا لە

---

(١) – رواه إمام ابن بطة في: (الإبانة).

(٢) – أخرجه الإمام اللالكائي في (شرح اصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٣) – انظر: «عقيدة السلف أصحاب الحديث الشيخ الإسلام أبي عثمان الصابوني.

کتێبە بە نرخ و بەناوبانگەکەیدا کە بە (شرح السنة) ناسراوە دەڵێت: (ئەی موسوڵمان ئەوە بزانە! هەرگیز خەڵك بیدعەیەکیان دانەهێناوە ئیللا لەجیاتیدا سوننەتێکی هاو وێنەی وەك ئەویان وازلێ هێناوە، هۆشیاری هەموو ئەو شتە نوێیانە بن کە لە دیندا دەئەهێنرێن، کاروبارە تازە داهێنراوەکان بن، لەبەرئەوە هەموو شتێکی تازە داهێنراو لە دیندا بیدعەیە، هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە، گومڕایی و ئەو کەسانەش کە گومڕان سەرەنجامیان بۆ ناو ئاگری دۆزەخە. هۆشیاربە ئاگات لە بیدعە بچوکەکان بێت؛ چونکە بیدعە بچوکەکان وایان لێ دێ تا گەورە دەبن، بەوشێوەیە هەموو بیدعەیە کە داهێنراوە لەناو ئوممەتدا لە سەرەتادا بچوك بووەو لە هەق چوە، ئەو کەسەی کە چوەتە ناویەوەو بیدعەکەی ئەنجامداوە پێی خەڵەتاوە، لەپاشدا نایانتوانیوە لێی دەرچێ؛ جا گەورە بووەو بۆتە دین و خەڵك لەسەری رۆیشتون و بەو شێوەیە دینداریان کردووە؛ لەکاتێکدا ئەو بیدعەیە پێچەوانەی رێگای راست بووە، بە هۆی ئەو بیدعەوە لەئیسلام دەرچوە، رەحمەتی خوات لێ بێ سەیر بکە هەموو ئەو قسانەی کە دەیبیستی لەلایەن خەڵکانی سەردەمی خۆتەوە پەلە مەکە لە وەرگرتنی، مەچۆ ناو هیچ شتێك لەباسەکەوە، هەتا دەپرسی و سەیردەکەی و سەرنج دەدەی کە ئایا ئەو قسانەی کە ئەو دەیکات هیچ کەسێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قسەی لەو جۆرەیان کردووە، یان هیچ یەکێ لەزانایان کردویانە؟ جا ئەگەر (أثر)ێکت بینی لەو بابەتەدا لەوانە ئەوا دەستی پێوە بگرە، ئیتر ئەوە تێمەپەڕێنە بۆ شتێکی تر، جگە لەوە هیچ شتێکی تر هەڵمەبژێرە بە هۆی ئەوەوە بکەویتە ناو ئاگری دۆزەخەوە).

* پێشەوا موفەسیری قورئان ئەبو موحەممەدی حوسەینی کوڕی مەسعودی کوڕی فەڕائی بەغەوی رەحمەتی خوای لێ بێ لە کتێبە بە نرخەکەیدا کە بەناوی

(شرح السنة)وەیە دەڵێت: (قَدْ مَضت الصحابةُ والتابعونَ وأَتباعُهم وعُلماءُ السُّنَةِ عَلَى هذا مجمعينَ، متفقين على معُاداةِ أَهلِ البِدَعَةِ ومُهاجَرَتهم)[1].

واتە: بێگومان بەردەوام هاوەڵان و شوێنکەوتوان و شوێنکەوتەی شوێنکەوتوان و زانایانی ئەهلی سوننە یەکدەنگ و هاوڕان لەسەر دژایەتی کردنی ئەهلی بیدعەو دەنگ لێ دابڕانیان و واز لێ هێنانیان.

* پێشەوا ئیبنو ئەبی زەمەنەینی ئەندەلوسی رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (ولم يزل أهل السنة يعيبون أهل الأهواء المضلة، وينهون عن مجالستهم، ويُخَوِّفُون فتنتهم، ويخبرون بخلاقهم، ولا يرون ذلك غيبةً لهم ولا طعنًا عليهم)[2].

واتە: بەردەوام ئەهلی سوننە، مرۆڤە بیدعە چیەکان و ئەهلی هەواو ئارەزووە گومڕاکەرەکان عەیبدار دەکەن و سەرشۆڕیان دەکەن، رێگری دەکەن لە دانیشتن لەگەڵیاندا، خەڵك دەترسێنن لەبارەی فیتنەکانیانەوە، هەواڵ دەدەن دەربارەی رەفتاری بیدعەچیەکان، ئەهلی سوننە باوەڕیان وایە کە ئەوە غەیبەت نیە، ئەو ناو زڕاندنی ئەهلی بیدعە تانەدان نیە بۆیان.

* پێشەوا ئیبنو قودامەی مەقدیسی رەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ دەڵێت: (كان السلف ينهون عن مجالسه أهل البدع، والنظر في كتبهم، والاستماع لكلامهم)[3].

واتە: سەلەف رێگریان کردووە لە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی بیدعەدا، رێگریان کردووە لە سەیرکردنی کتێبەکانیان و خوێندنەوەیان، هەروەها لە گوێگرتن لە قسەکانیان.

(١) - «(شرح السنة)» للإمام البغوي.
(٢) - «(شرح السنة)» للإمام ابن أبي زمنين.
(٣) - «(الآداب الشرعية)» للعلامة ابن مفلح.

* پێشەوا شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ زۆر بە ڕون و ئاشکراو بە جوانی حوکمی ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزووی ڕونکردۆتەوە، لە وتە ڕاست و بەناوبانگ و گرنگەکەیدا کە دەڵێت:

(حُكْمي في أَصْحابِ الكَلامِ أَنْ يُضرَبوا بالجريد، ويُحْمَلوا عَلَى الإِبلِ، ويُطاف بهم في العشائرِ والقَبائلِ؛ ويقال هذا جَزاءُ مَنْ تَرَكَ الكتابَ والسنة، وأَخَذَ في الكَلام)[1].

واتە: حوکمی من لەوانەدا کە ئەهلی کەلامن ئەوەیە کە بە لاسکی گەڵای دار خورما لێیان بدرێ، سواری وشتر بکرێن و بەناو تیرەو هۆزەکاندا بسوڕێنرێنەوە، بوترێت: ئەمە سزای کەسێکە وازدەهێنێت لە قورئان و سوننەت و دەست دەگرێت بە کەلامەوە.

* پێشەوا ئەبو (عثمان) ئیسماعیل صابونی نقلێ کردووە لە کتێبە بە نرخ و بەناوبانگەکەیدا (عقيدة السلف أصحاب الحديث) کۆدەنگی و یەکڕایی ئەهلی سوننە و جەماعەی لەسەر پێویستێتی شکاندن و سەرشۆڕکردنی ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزوو، لەدوای ئەوەی کە فەرمایشتە جوانەکانی ئەوانی هێناوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (ئەم ڕستانەی کە چەسپاندومە لەم بەشەدا؛ ئەوە بیروباوەڕی هەر هەموویانە هەندێکیان پێچەوانەی هەندێکیانیان نەکردەوە لەوەدا؛ بەڵکو هەر هەموویان یەکدەنگن لەسەری، ڕێکەوتون لەگەڵ ئەوەدا لەسەر وتەی بە داخ پێدان و تەمێ کردنی ئەهلی بیدەع و سەرشۆڕکردنیان و شکاندیان و بەکەمگرتنیان و دورکەوتنەوە لێیان و لە هاوڕێیەتی کردنیان و تێکەڵاوی کردنیان، نزیك بونەوە لە خوای گەورە بە دورکەوتنەوە لێیان و واز لێ هێنانیان.

* پێشەوا ئیبنو (عبد البَرّ) ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ لە کتێبە بە نرخ و بەناوبانگەکەیدا کە بەناوی (التمهيد)ەوەیە دەڵێت: (زانایان کۆدەنگ و یەکڕان لەسەر ئەوەی کە بۆ موسوڵمان دروست نیە لەسێ ڕۆژ زیاتر دەنگ لە برا

(١) – «(شرح السنة)» للإمام البغوي.

موسوڵمانەکەی دابڕێت؛ تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێ کە ئەو کەسە بترسێ بەهۆی قسە لەگەڵ کردنی و سەردانیەوە خۆشی خراپ بێت و ببێتە هۆی تێکدانی دینەکەی، یان ببێتە هۆی زەرەر و زیان بۆ دین و دنیای، ئەگەر بەو شێوەیە بوو، بۆی هەیە لێی دوربێ خوای پەروەردگار مۆڵەتی داوە بە دورکەوتنەوە لێی، کەوێتەوە، بێگومان لەوانەیە دابڕان و پچڕانی پەیوەندی بە شێوەیەکی جوان چاکترە لە پەیوەندی و تێکەڵی زیان بەخش.

# بنچینەی پانزەیەم

## بەرنامەو پرۆگرامی ئەهلی سوننەو جەماعە سەبارەت بە هەڵسوکەوت و رەوشتی جوان

لە بنچینەکانی عەقیدی سەلەفی صالح، ئەهلی سوننەو جەماعە:

ئەوانە فەرمان دەکەن بە چاکەو، رێگری دەکەن لە خراپە[1]، باوەڕیان وایە چاکێتی و بەردەوامی و دامەزراوی ئەم ئوممەتە رەحم پێ کراوە؛ بەردەوامە بە ئەنجامدانی ئەم دروشمە موبارەك و پیرۆزە، بێگومان ئەمە دروشمەش لە گەورەترین دروشمەکانی ئیسلام و دینە، هۆکاری سەرەکی پاراستنی کۆمەڵی موسوڵمانان و جەماعەی ئیسلام و یەکێتی دەوڵەتی موسوڵمانانە، لە گرنگترینی ئەو شتانەیە کە پێغەمبەران هێناویانە سەلامی خوایان لەسەر بێ، لەو کاروبارانەیە کە ناگونجێ ژیانی گرۆی ئادەمی بەبێ ئەوە دامەزرێ و رێك راوەستێ، خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴿١١٠﴾ ﴾ سورة آل عمران: ١١٠.

واتە: ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا هێنرابێتنە دی، فەرمان بەچاکە دەدەن و، رێ لە خراپەو ناڕەوا دەبەستن، باوەڕیشتان بە خوا هەیە.

ئەهلی سوننەو جەماعە باوەڕیان وایە کە فەرمان کردن بە چاکەو، رێگری کردن لە خراپە، لە پێویسترینی واجباتەکانە لەسەر ئوممەت؛ بە وتەو بە کردەوە، هەموو موسوڵمانێك بە گوێرەی توانای خۆی دەبێت فەرمان بکات بە چاکەو، رێگری

---

(١) - ويشترط في تغيير المنكر شروط منها: * ان يكون الناهي عن المنكر عالماً بما ينهي عنه. * ان يتأكد بأن معروفاً قد ترك وان منكراً قد ارتكب. * ان لا يغير المنكر بمنكر. * والا يؤدي تغيير هذا المنكر إلى منكر اكبر منه.

بکاتله خراپە، لەمەدا دەبێت بەرژەوەندی لەبەرچاو بگیرێت، لە هەموو کاتێکدا فەرمان دەکەن بەچاکەو، رێگریش لەخراپە دەکەن وەك غیرەتێك لە بەرامبەر شکاندنی قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە، وەك رێگریەك لە بەرامبەر بەزاندنی سنورەکانی خوای پەروەردگار، کە ئەوەش بریتیە لە جیهادو تێکۆشان لەدژی ئەو کەسانەی کە خاوەنی جەور و ستەم و کردەوەی ناشیرین و بێ ئابڕوین؛ ئەو کەسەی کە هەڵسێ بە ئەنجامدانی ئەو کارە پاداشت دراوەیە، ئەو کەسەیشی کە وازی لێ بهێنێت سزا دراوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ سورة آل عمران: ١٠٤.

واتە: دەبێ لەنێو ئێوەدا کۆمەڵێك بن، فەرمان بەچاکە بدەن و رێ لە خراپە ببەستن، هەر ئەوانەش رزگار دەبن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَيْسُوا۟ سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ سورة آل عمران: ١١٣ – ١١٤.

واتە: هەموو (نامەدارەکان) چون یەك نین، لەناو خاوەن نامەکاندا دەستەیەکی راست و رێك هەن ئایەتەکانی خوای گەورە دەخوێنن لەکاتەکانی شەودا و لەکاتی سەجدەبردنیاندا. بڕوایان هەیە بە خوای گەورە و بەڕۆژی دوایی و، فەرمان دەدەن بە چاکەو، بەرگری دەکەن لەهەرچی خراپەیە، پێشبڕکێ دەکەن لەهەموو چاکەکاندا، ئەوانە لە کۆمەڵی چاکانن.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ؛ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ)[1].

(١) - اخرجه مسلم، ١/٥٠ ( ٤٩ ) (٧٨) .

واتە: هەركەسێك لە ئێوە خراپەیەكی بینی ئەوە با بەدەستی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی بە زمانی هەوڵ بدات بیگۆڕێت، جا ئەگەر نەیتوانی ئەوە بەدڵی، ئەمەش لاوازترینی باوەڕهێنانە.

ئەهلی سوننەو جەماعە باوەڕیان وایە كە وازهێنان لەم دروشمە گەورەیە فەرمان كردن بە چاكەو، رێگری كردن لە خراپە، هۆكارێكە بۆ دابەزینی سزای خوای پەروەردگار، هێنانەدی نەفرەتی خوای پەروەردگارە بەسەر ئەو كەسانەدا، وازلێهێنانی لەگرنگترین هۆكارەكانە كە دەبێتە هۆی بڵاوبونەوەی خراپەكاری و لادان و گۆڕانكاری لەژیانی ئوممەتدا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴾ سورة الأعراف: ١٦٥.

واتە: ئەنجا كاتێ ئەوەی پێی ئامۆژگاری كرابوون لەبیریان چوو، ئەوانەی بەرگرییان دەكرد لە خراپە و تاوان رزگارمان كردن، ئەوانەش كە ستەمیان كرد سزامان دان بەسزایەكی زۆر خراپ بەهۆی دەرچوونیان لە فەرمانی خوا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾ سورة المائدة: ٧٨ - ٧٩.

واتە: نەفرین كرا لەوانەی بێ بڕوابوون لەبەرەو نەوەی ئیسرائیل لەسەر زمانی داوود و عیسای كوڕی مەریەم، ئەو نەفرینەش لەبەر ئەوە بوو سەرپێچیان كردو، هەمیشە دەست درێژیان دەكرد. ئەوانە بەرگری یەكترییان نەدەكرد لەهەر كارێكی بێزراوی بێ شەرعی كەدەیانكرد، بێگومان زۆر بەدبوو ئەوەی كەئەیانكرد.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە دەبێ لەکاتی فەرمان کردن بە چاکەو، ڕێگری کردن لە خراپەدا سۆز و بەزەیی و نەرمونیانی پێش بخرێت، بانگەوازی خەڵك بکرێت بۆ لای دینی خوای گەورە بەلێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴾ النحل: ١٢٥.

واتە: (خەڵك) بانگ بکە بۆ ڕێبازی پەروەردگارت بەلێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین، لەگەڵیان بدوێ (موجادەلە بکە) بەچاکترین شێوە.

هەروەها باوەڕیان وایە ئارامگرتن لەسەر ئازاردانی خەڵك واجبە لەکاتی فەرمان کردن بە چاکەو، ڕێگری کردن لە خراپەدا، ئەمەش کارکردنە بەم فەرمایشتە پیرۆزەی خوای گەورە:

﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴾ سورة لقمان: ١٧.

واتە: ئەی کوڕە شیرینەکەم نوێژ بەجێ بێنەو، فەرمان بکە بەچاکە و، بەرگری بکە لەخراپە، خۆگر و بەئارام بە لەسەر هەر بەڵاو ناخۆشییە کە تووشت دێ، بێگومان ئەوە لەوکارە گەورانەیە کە خوا پێویستی کردووە.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

کاتێ کە هەڵئەسن بە ئەنجامدانی واجبی فەرمان کردن بە چاکەو، ڕێگری کردن لە خراپە، لە هەمان کاتدا پابەند دەبن بە بنچینەیەکی ترەوە کە بریتیە لە پارێزگاریکردن لە جەماعەتی موسوڵمانان و یەکێتییان، پێکەوە گرێدانی دڵەکان و نزیککردنەوەیان لە یەك، یەکدەنگی، نەهێشتن و دورکەوتنەوەیان لە پارچە پارچەی و دەستە دەستەیی و ناکۆکی و دوبەرەکی.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە ئامۆژگارکردنی هەموو موسوڵمانێك واجبە بەشێوەیەکی چاك، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (الدِّينُ النَّصِيحةُ). قلنا: لِمَنْ؟ قَالَ: (لِلهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأئِمَّةِ المُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ)[1]. واتە: دین هەر هەمووی ئامۆژگاری و دڵسۆزییە، وتیان: بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا!. فەرمووی: بۆ خوای گەورە، بۆ کتێبەکەی و بۆ پێغەمبەرەکەی و بۆ پێشەوای موسڵمانان و، بۆ هەموو موسڵمانێ.

باوەڕیان وایە هاوکاری و کۆمەکی یەکتری لەسەر چاکە و پارێزگاری واجبە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾ ﴾ سورة المائدة: ٢.

واتە: کۆمەکی یەکتری بکەن لەسەر چاکە و پارێزکاری، کۆمەکی یەکتر مەکەن لەسەر تاوان و دەست درێژی و، لە خوا بترسن بێگومان خوا تۆڵەی بەتینە.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

پارێزگاری دەکەن لە ئەنجامدانی دروشمەکانی ئیسلام و دین، وەك هەستان بە ئەنجامدانی نوێژی جەماعەت و هەینی و، هەردوو جەژنەکەو، نوێژەبارانەو، حەج و، جیهاد و تێکۆشان لەگەڵ فەرمانڕوای موسوڵماناندا ئیتر چاکەکار بن یان خراپەکار بن؛ وەك پێچەوانە هەڵسوکەوتێك بۆ بیدعەچیەکان و ئەهلی هەواو ئارەزوو.

ئەهلی سوننەو جەماعە پێشبڕکێ دەکەن لە ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکاندا، لە سەرەتاو یەکەم کاتی خۆیاندا هەڵئەسن بە ئەنجامدانیان بە کۆمەڵ لە مزگەوتدا، چونکە یەکەم کاتی نوێژ چاکترە لە کۆتا کاتی نوێژ جگە لە نوێژی خەوتنان

---

(١) – أخرجه مسلم: ٥٣/١ ( ٥٥ ) ( ٩٥ ).

بەمەرجێ بە کۆمەڵ بکرێت نەك بە تەنیا، فەرمان دەکەن بە گەردنکەچی و ئارامی لە نوێژەکاندا، ئەمەش وەك کارکردنێ بە فەرمایشتی خوای گەورە:

﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴾ سورة المؤمنون: ١ - ٢.

واتە: بەڕاستی سەرەفرازو سەرکەوتوون ئەو ئیماندارانەی کە لەنوێژەکانیاندا دڵیان بەسراوە بەخوای خۆیانەوە و بەخشوعەوە نوێژەکانیان دەکەن.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

ئامۆژگاری خۆیان و خەڵك دەکەن بەوەی کە کۆشش بکەن بەرەهایی لە گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورەدا، پەرستشی خوای پەروەردگار، ئامۆژگاری موسوڵمانان دەکەن بە ئەنجامدانی شەونوێژ و زیندوکردنەوەی شەو بە نوێژکردن و قورئان خوێندن؛ لەبەرئەوە ئەوە سوننەتی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، لەبەرئەوەی کە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) کە بە شەونوێژ کردن و بەردەوامبون لەسەری؛ لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەندە لە شەونوێژدا بەپێوە راوەستا بوو هەتا هەردوو پێکانی قلیش قلیش بوون و ئاوسابوون، دایکە عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە بۆ وادەکەی لەکاتێکدا کە خوای کەورە لەگوناهی لەمەو پێش و لەمەو دواشت خۆش بووە؟ فەرمووی: (أَفَلَا أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ عَبْدًا شَكُورًا)[1]. واتە: ئایا پێم خۆش نەبێ کە بەندەیەکی سوپاسگوزار بم.

(١) – مُتَّفَقٌ عَلَيهِ ، اخرجه: البخاري: ١٦٩/٦ ( ٤٨٣٧ ) ، ومسلم: ١٤١/٨ ( ٢٨٢٠ ) ( ٨١ ).

ئەهلی سوننە و جەماعە:

لەباردۆخی تاقیکردنەوە و بەڵاو کارەساتدا جێگیر و دامەزراون، ئەوەش بە ئارامگرتن دەبێت لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا، بە سوپاسگوزاری دەبێت لەکاتی خێر و خۆشیدا، بە رازیبوون بە تاڵی و ناخۆشی قەزای خوای پەروەردگار دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ سورة الزمر: ١٠.

واتە: بەڕاستی تەنها خۆگرو ئارامگران پاداشتی خۆیان بەتەواوەتی وەردەگرنەوە بەبێ شومار.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (إِنَّ عِظَمَ الْجَزَاءِ مَعَ عِظَمِ الْبَلَاءِ، وَإِنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ قَوْمًا ابْتَلَاهُمْ؛ فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَى، وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السَّخَطُ)[١].

واتە: بەدڵنیاییەوە گەورەیەتی پاداشت لەگەڵ گەورەیەتی بەڵادایە واتە هەتا بەڵاکە گەورەتر بێت پاداشتەکەش گەورەتر دەبێت، بەڕاستی ئەگەر خوای گەورە گەلێکی خۆش ویست تاقییان دەکاتەوە و بەڵایان دێنێ بەسەردا، جا هەرکەسێ بە بەشی خودا رازی بێت ئەوە خوای گەورە لێی رازی دەبێت، هەرکەسێ ناڕازیش بوو ئەوە خوای گەورەش لەو تورەو ناڕازی دەبێ.

ئەهلی سوننەو جەماعە داوای بەڵاو ناخۆشی ناکەن لە خوای گەورە، هەرگیز ئاوات بۆ ئەوە ناخوازن، لەبەرئەوەی نازانن دەتوانن خۆڕاگر بن یان نا؟ بەڵام ئەگەر توشی بەڵا هاتن و تاقیکرانەوە ئەوە خۆراگر دەبن و ئارامی لەسەر دەگرن، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (لاَ تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، وَسَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ)[٢].

---

(١) – أخرجه البخاري: ١٠٩/٧ ( ٥٤٧٠ )، ومسلم ١٧٤/٦ ( ٢١٤٤ ) ( ٢٣ ) .

(٢) – أخرجه البخاري: ٢٢/٤ (٢٩٦٥) و(٢٩٦٦) ، ومسلم: ١٤٣/٥ (١٧٤٢) (٢٠).

واتە: ئاواتەخواز مەبن لە گۆڕەپانی جەنگدا بگەن بە دوژمن، داوای پارێزراویەتی سەلامەتی بکەن لەخوای گەورە، جا ئەگەر پێیان گەیشتن ئەوە خۆگر و بە ئارام بن، بزانن کە بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندایە.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

هیچ کاتێ بێ هیواو نائومێد نابن لە رەحمەتی خوای گەورە لەکاتی تەنگانەو بەڵاو ناخۆشیدا؛ لەبەرئەوەی خوای گەورە ئا ئەوەی حەرام کردووە لەسەر باوەڕداران، بەڵکو لەکاتی تەنگانەو بەڵاو ناخۆشیدا بە ئومێدی دەرو لێ کردنەوەی نزیك و سەرخستنی دڵنیایی واتە دڵنیان کە خوای پەروەردگار سەریان دەخات، لەبەرئەوە ئەهلی سوننەو جەماعە متمانەیان بە بەڵێن و سەرخستنی خوایی هەیە، باوەڕیان وایە لەپاش هەموو تەنگانەو ناخۆشیەك ئاسانی و خۆشی و ئاسودەیی دێت، لە هۆکاری ئەو تەنگانەو ناخۆشیە دەکۆڵنەوەو دەگەڕێن بە شوێنیا لەدەرونی خۆیاندا لەپێش هەموو شتێکەوە، باوەڕیان وایە ئەو تەنگانەو بەڵاو ناخۆشی و نەهامەتیانە توشیان نابێ تەنیا بە هۆکاری ئەوە نەبێ کە خۆیان ئەنجامیانداوە لە سەرپێچی و گوناهو تاوان واتە هۆکارەکانی بۆ کاروکردەوەکانی خۆیان دەگەڕێننەوە، هەروەها باوەڕیان وایە دەکونجێ سەرخستنی خوایی دوابکەوێت بەهۆی کەوتنە ناو گوناهو تاوانەوە، یان کەمتەرخەمی لە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەیدا (صلی الله علیه وسلم)، یان کەمتەرخەمی لە شوێنکەوتنی سوننەتدا، یا کەمتەرخەمی کردن لە کردەوەکردن پێی، لەبەر فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێت:

﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ ﴾ سورة الشورى: ٣٠.

واتە: هەر بەڵاو نەهامەتیەکتان تووش بووبێ ئەوە بەهۆیی کردەوەیی خراپی خۆتانەوەیە.

ئەهلی سوننەو جەماعە لەکاتی تەنگانەو بەڵاو ناخۆشی و سەرکەوتنی دیندا پشت نابەستن بە هۆکارەکانی سەرزەوی و، فریودەرە دونیاییەکان و سوننەتە کەونیەکان، هەرچەندە پشت بە هۆکارە دونیاییەکان نابەستن بەڵام لێشی بێ ئاگانین ئەوەندە هەیە لەڕووی دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە هەروەك چۆن شەرعە کاربەجێ و حەکیمەکەمان فەرمانی پێ کردوین، بەڵام لەپێش ئەوەدا باوەڕیان وایە لە خوا ترسان و داوای لێخۆشبون کردن لەخوای گەورە بەوەی لە تاوانەکان و سەرپێچیەکانیان ببورێت، پشتبەستن بە خوا، سوپاسکردن لەکاتی ئاسودەیی و خۆشگوزەرانی دا؛ لەهۆکارە گرنگەکانی دەرووی خێر لێ کردنەوەی خێران لەدوای ناخۆشی و نەهامەتی.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

باوەڕیان وایە کە لەم ژیانەدا لەدین و دونیاکەیاندا لەبەردەم تاقیکردنەوەی خواییدان خوای پەروەردگار تاقیان دەکاتەوە ئایا ئارام دەگرن یان نا؛ باوەڕیان وایە ئەو بەڵاو ناخۆشیانەی کە توشیان دەبێت هۆکارێکە بۆ سڕینەوەی گوناهو تاوانەکانیان و بەرزبوونەوەی پلەوپایەو پاداشتیان، ئەهلی سوننەو جەماعە لە ژیانی دونیادا نامۆ و غەریبن و دەڕۆن بەرەو ماڵی پاشەڕۆژ جێی حەسانەوەی هەمیشەیی، ژیانی دونیا بۆ ئەوان وەك زیندانێك وایە بە بەراورد لەگەڵ بەهەشت و نازو نیعمەتەکانی دواڕۆژی هەتا هەتایی؛ دونیا زیندانە بۆ دڵەکانیان، بۆ جەستەیان بەو شتانەی کە لەناو دونیادا رازاوەتەوە، بەو شتانەی کە توشی بەڵاو فیتنەیان دەکات، بەو هەواو ئارەزوانەی کە تیایدایە، بەو سەرپێچی و تاوانانەی کە رازێنراوەتەوە بۆیان، مەگەر ئەوەی کە پەروەردگاریان بۆی بە ڕەوا داناون لەوشتانەدا؛ ئەوانە سەرزەنشت ناکرێن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴾ سورة الأحزاب: ١١.

واتە: لەوێدا ئیمانداران تاقی کرانەوەو راوەشێنران بەڕاوەشاندنێکی توند.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (مَا يَزَالُ الْبَلَاءُ بِالْمُؤْمِنِ وَالْمُؤْمِنَةِ فِي نَفْسِهِ وَوَلَدِهِ وَمَالِهِ؛ حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ وَمَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ)(١).

واتە: بەردەوام پیاو باوەڕدار و ئافرەتی باوەڕدار خۆی و منداڵەکانی و ماڵ و سامانەکەی توشی بەڵاو مەینەتی دەبن، هەتا دەگاتەوە بە خوای خۆی و گوناهی نامێنێ.

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ، وَجَنَّةُ الْكَافِرِ)(٢). واتە: دونیا زیندانی باوەڕدارەو، بەهەشتی بێ باوەڕە.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

دەترسن لەسزای ناشکوری ئەو نازو نیعمەتەی کە خوا بەسەریدا رشتون، بەوەی ئینکاری بکەن و دانی پێدا نەنێن، هەڵئەسن بە بەجێهێنانی مافی ئەو ناز و نیعمەتە، بۆیە دەیانبینی لەهەموو کەس سورترن لەسەر سوپاسکردنی خوای گەورە، زۆر بەردەوامن لەسەری، سوپاسی خوای گەورە دەکەن لەسەر هەموو ناز و نیعمەتێك ئیتر گەورەبێ و یان بچوك بێت، لەبەرئەوەی راچڵەکان و ترسان لە خوای گەورە لەسیفەتی بەرزیانە، لەبەر بەهێزی ئەو باوەڕەیانە کە بە خوای خۆیان هەیانە، لەبەر ئەوەی هەست دەکەن بەوەی کە خوای گەورە چاودێرە بەسەریانەوە، هەروەك بڵێی وەستاون لەبەردەم خوای گەورەدا، لەبەرئەوەی ترسان لە گەورەیەتی خوای پەروەردگار هەرگیز لە دڵەکانیاندا جیانابێتەوە، باوەڕیان وایە کە خوای گەورە دەوڵەمەندە، غەیری ئەویش هەر هەمووی فەقیر و هەژارن و پێویستیان بە بەزەیی ئەو هەیە، ئەو خاوەنی بە توانا و بە دەسەڵاتە،

(١) - (صحيح سنن الترمذي: ٢٣٩٩) للألباني.
(٢) - أخرجه مسلم: ٨/٢١٠ ( ٢٩٥٦ ) (١).

غەیری ئەویش هەر هەموو بێ دەسەڵات و بێ توانان، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (انْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْكُمْ، وَلا تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ فَوْقَكُمْ، فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ لا تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْكُمْ)(١).

واتە: بە بەردەوامی سەیری لەخۆتان خوارتر بکەن، سەیری سەرووی خۆتانەوە مەکەن، لەبەرئەوەی ئەگەر وانەکەن لەوانەیە ئەو نازو نیعمەتانەی کە خوای گەورە داویەتی پێتان لەبەرچاوتان بکەون و بەکەمی بزانن.

ئەهلی سوننە و جەماعە:

کاتێ کە بە تەنیا یادی خوای تاك تەنیایان کرد؛ دڵەکانیان رادەچڵەکێ و ترسی لێ دەنیشێت، دەرونیان دەهەژێت، حاڵیان پەشێو دەبێ و، تەزوو دێت بە جەستەیانداو، دەنگیان ملکەچ دەبێ، لەبەر بەگەورەدانانی فەرمانەکانی خوا، وەکو رێز و شکۆداری بۆ خوای گەورە، وەك عیززەتێ بۆ گەورەیی دەسەڵاتی، وەك هۆشیاریدانێ لە ئێش و ئازاری سزای سەختی، کاتێك یادی تەواوی میهرەبانی و دڵسۆزی خوای گەورە و سۆز و بەزەیی بەرامبەر بە بەندەکانی و پاداشتی زۆر و نەبڕاوەی و گەورەیی بەخشینی بکەنەوە، دڵەکانیان دڵنیاو ئارام دەبێ بە هیواو ئومێدی لێ خۆشبونی خوای پەروەردگار، پێستیان نەرم دەبێت، سینەیان ئاسودەو فراوان دەبێت، دەرونیان ئاسودە دەبێت و خۆشی و شادی دەکەوێتە دڵەکانیانەوە؛ کاتێك کە باسی خوا کرا دڵەکانیان دەترسێت و ترسی لێ دەنیشێت بە باسکردنی دەسەڵاتی و زاڵبوونی و سزای، کاتێ کە باسی سۆز و بەزەیی و پاداشتی زۆر و نەبڕاوەی دەکرێت دڵیان ئارام دەبێ، ئەمەش حاڵی خواناسانە کە لەسزای سەختی دەترسن، خوای گەورە دەفەرموێت:

---

(١) – اخرجه: البخاري ١٢٨/٨ ( ٦٤٩٠ )، ومسلم ٢١٣/٨ ( ٢٩٦٣ ) ( ٨ ) و( ٩ ).

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ سورة الأنفال: ٢ - ٤.

واتە: بێگومان بڕواداران تەنها کەسانێکن کە کاتێك باسی خوا کراو ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت و ترسی لێ دەنیشێت، کاتێکیش ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بڕوایان زیاد دەبێت، هەر پشت بەپەروەردگاری خۆیان دەبەستن. ئەوانەن کە بەڕاستی نوێژەکانیان بەجێ دەهێنن، لەو رزق و ڕۆزیەی پێمان داوون (لە پێناوی خوادا) دەیبەخشن. هەر ئەوانەن بڕوادارانی ڕاستەقینە پلەی بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان و، لێ خۆش بوونی (تاوانەکانیان) و، ڕۆزی پەسەندو چاکیان بۆ هەیە.

**ئەهلی سوننە و جەماعە:**

خۆیان دەڕازێننەوە بە ئاکار و رەوشت و کردەوە جوانەکان، بە وتەو کردەوە جوانەکان؛ یەکتریان خۆش دەوێت، بەزەییان بە یەکتردا دێتەوە، کەموکوڕی یەکتر دادەپۆشن، دۆستایەتی و دوژمنایەتی ناکەن تەنها لەسەر بناغەی دین نەبێت، ئەوان چاکترین کەسن لەڕووی ئاکار و رەوشتی بەرزەوە، لە هەموو کەس سورترن لەسەر خاوێنکردنەوەی دەرونیان بە گوێڕایەڵی کردنی خوای پەروەردگار ، تەواوترینی مرۆڤەکانن لەڕووی رەوشت و هەڵسوکەوت و رەفتاریانەوە، قسە ناکەن ئیللا قسەی خێر و چاکە نەبێت هەروەها سود بگەیەنێ بە خەڵك.

بەگشتی؛ ئەهلی سوننەو جەماعە هەڵبژێردراون لەناو دروستکراوەکانی خوادا، لەبەندە چاکەکان و لە دۆستەکانی خوای پەروەردگارن، لەدوای پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ، لە تایبەتمەندێتی بیروباوەڕ و ئاکار و

ڕەوشتی جوانیان؛ ئەوانە هیچ کاتێ گۆڕان بە سەریاندا نایەت بە تێپەڕبونی کات و شوێن و سەردەم.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (أَكْمَلِ المُؤمِنينَ إِيمَاناً؛ أَحْسَنَهُمْ خُلُقاً)[١].

واتە: تەواترینی ئیمانداران لەڕوی ئیمانەوە؛ ئەوانەن کە زۆر ڕەوشتیان جوان و چاك و پەسەندە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (إِنَّ مِنْ أُحِبِّكُمْ إِلَيَّ وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَحْسَنَكُمْ أَخْلَاقًا)[٢].

واتە: خۆشەویسترین کەسێك لە ئێوە لای من و نزیکترین کەسێك لە ئێوە لە من کە دابنیشێت لە کۆڕ و مەجلیسی مندا لەڕۆژی قیامەتدا ئەوانەن کە زۆر ڕەوشتیان جوان و چاك و پەسەندە.

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(مَا مِنْ شَيْءٍ يُوضَعُ فِي الْمِيزَانِ أَثْقَلُ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ، وَإِنَّ صَاحِبَ حُسْنِ الْخُلُقِ لَيَبْلُغُ بِهِ دَرَجَةَ صَاحِبِ الصَّوْمِ وَالصَّلَاةِ)[٣].

واتە: هیچ شتێك نیە بخرێتە سەر تای تەرازووەوە قورستر بێت لە ئاکار و ڕەوشتی بەرز و جوان، بە دڵنیاییەوە کەسێك کە خاوەنی ئاکار و ڕەوشتی بەرز و جوان بێت بەوە دەگاتە پلەی کەسێك کە بەردەوام خاوەنی ڕۆژوو و نوێژ بێت.

(١) – (صحيح سنن الترمذي: ١١٦٢) – تحقيق الألباني: حسن صحيح، الصحيحة (٢٨٤).

(٢) – (صحيح سنن الترمذي: ٢٦٤٩) للألباني.

(٣) – (صحيح سنن الترمذي) – تحقيق الألباني: صحيح، الصحيحة: ( ٨٧٦ ) ، الإرواء: ( ٩٤١ ).

## لەڕەوشتە جوانەكانی سەلەفی صالّح،
## ئەهلی سوننە و جەماعە

* زۆر نیازپاك و دلّسۆزن لە زانست و كردەوەیاندا، زۆر دەترسن خۆیان لە ریا(رياء)، لەبەرئەوەی ئەوان دینەكەیان پیادە دەكەن لەبەر خوای گەورە، بە تەنیا (الله) دەپەرستن، هیچ كەسیّ ناكەن بە شەریك و هاوەڵی ئیتر ئەو كەسە هەر چیەك بیّ و لەهەر پلەوپایەیەكدا بیّت، نیەتەكانیان پاك دەكەنەوە بۆ خوای گەورە بە تاك و تەنیا، لە هەموو خلّتەو پیسیەكی هاوبەش بۆ خوا دانان و پیس و چەپەڵی (رياء) و ناوبانگ و شۆرەت و شوێنكەوتنی هەواو ئارەزوو، لەبەرئەوەی هەر خوای گەورە بە تاك و تەنیا شیاوە بۆ پەرستش و گوێڕایەڵی كردن.

نیازپاكی و دلّسۆزی لە دیندا بۆ خوای گەورە بەجیّ نایەت تەنها بەدوو كاری زۆر گەورە نەبێت؛ كە بریتین لەمانە:

* دەبێت كاروكردەوە زۆر بە پاكی تەنها لەبەر خوای گەورە بێت، واتە: داماڵینی دلّسۆزی لەهەر شتێكی تر واتە دلّسۆزی تەنها بۆ (الله) بێت.

* دەبێت كاروكردەوە هاورێك بێت لەگەڵ شەرعی خوای گەورەدا، واتە: جێبەجێكردن و هێنانەدی شوێنكەوتنی راستەقینە واتە دلّسۆزی بۆ خواو شوێنكەوتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

بەڕاستی خوای گەورە فەرمانی كردووە بە نیازپاكی و دلّسۆزی لە وتەو لە كردەوەدا، هۆشیاری داوە سەبارەت بە (رياء) و هاوەڵ بۆ خوا دانان:

﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ سورة النساء: ١٤٦.

واتە: جگە لەوانەی دەگەڕێنەوە و خۆیان چاك دەكەن و دەست دەگرن بە (دینی) خواوەو دینەكەیان پاك وخاوێن دەكەن بۆ خوا، جا ئەوانە(ی ئەو مەرجانەیان بەجیّ هێنا) لەگەڵ ئیمانداراندا دەبن، بیّ گومان لەداهاتوو دا خوا دەیبەخشیّ بە ئیمانداران پاداشتێكی زۆر گەورە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴾ سورة البينة: ٥.

واتە: (لەگەڵ ئەوەشدا) کە فەرمانیان پێ نەدرا بوو مەگەر بەوەی کە پەرستشی خوا بکەن بەدڵسۆزی و ملکەچی بۆ بکەن و خۆیان بەدوور بگرن لە هەموو بیروباوەڕێکی خواروخێچ، نوێژ بکەن و زەکات بدەن، ئەمەیە دینی راست.

* خۆیان دەڕازێننەوە بەئارام گرتنێکی جوان لەڕێگەی خوای گەورەدا لەسەر ئەو نازو نیعمەتانەی کە رژاندویەتی بەسەریاندا لە روکەش و لە ئاشکردا، ئارام دەگرن لەسەر ئەو بەڵاو نەهامەتی و ناخۆشیانەی کە لەژیانی دونیادا دێتە رێیان، ئارام دەگرن لەسەر ئارەزووەکانی نەفس، ئارام دەگرن لەسەر گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە، ئارام دەگرن لەسەر هەستان بە ئەنجامدانی پێویستێتی پەرستش بۆ خوای پەروەردگار، ئارام دەگرن لەسەر کۆسپ و تەگەرەکانی بەردەم بانگەواز بۆ دینی خوای گەورە، ئارام دەگرن لەسەر تێکۆشان لە رێگەی خوای گەورەدا، ئارام دەگرن لەسەر ئەو ماندوبوون و ئازار و مەینەتیانەی کە دەوری داون و دێتە رێگایان لەو پێناوەدا، لەکاتێکدا کە بێ توانایە لە هەڵگرتنی ئەو بارە ئیلا کەسانی هەڵبژێردراو نەبێت؛ مەگەر کەسانێك کە خوای گەورە خۆی رەحمی پێ کردبن.

ئەهلی سوننەو جەماعە چاك دەزانن کە ئارام گرتن لەڕێگەی خوای گەورەدا؛ لە سیفەت و رەوشتی پێغەمبەرانن سەلامی خوایان لەسەر بێ، رێڕەوی سەرکەوتنی بانگەوازیان بووە لە گەیاندنی نامەو پەیامەکانی خوای گەورەدا لەگەڵ شەرعەکەی و فەرمانەکانی و حوکم و بڕیارەکانی، دەزانن کە ئارام گرتن زەروری و پێویستیەکی بەردەوامە بۆ بەندە هەتا بگات بە هیواو ئاواتەکانی و سەرکەوتنی مەبەستەکانی؛ لەبەرئەوەی ئەوان هەوڵیان بۆ بەهەشتێکە پڕە لە نازو نیعمەتی نەبڕاوە، ئەوەش بریتیە لە کاڵاو شمەکی گرانبەهای خوای گەورە، جا بۆیە پێویستی بە نرخ و

بەهایەکی گران هەیە؛هەرکەسێ ئارام بگرێت سەردەکەوێ و بەدەستی دەهێنێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ سورة آل عمران: ٢٠٠.

واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە خۆگربن و (لەخۆگری دوژمن) خۆگر تر بن و لەسەنگەردا ئێشك بگرن و، لە خوای گەورە بترسن بۆ ئەوەی ڕزگار بن.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ﴾ الأحقاف: ٣٥.

واتە: کەواتە خۆگربە (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) هەروەکو پێغەمبەرانی خۆڕاگری بەهێز دانیان بەخۆداگرت.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ سورة البقرة: ١٥٣.

واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە پشت ببەستن بە خۆڕاگرتن و نوێژکردن، بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵ خۆڕاگرانە.

* ئەهلی سوننەو جەماعە قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە لەلایان زۆر گەورەیە، زۆر بە پەرۆشن ئەگەر سنوری قەدەغەکراوەکانی خوای گەورەیان شکاند، حوکم و بڕیاری خوای گەورەیان زۆر خۆشدەوێت، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدان کە دینی خواو شەرعەکەی سەربخەن، خۆیان بە تەواوی داوەتە دەست شەرعە کاربەجێکەی خوای گەورە لەهەموو گەورە و بچوکێکدا، حورمەت و ڕێزی موسوڵمان لەلای ئەوان زۆر گەورەیە، زۆر بەگەورەگرتنی (حرومات)ی موسوڵمانان، هەمیشە خێر و چاکەیان پێ خۆشە بۆیان، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾ سورة الحج: ٣٢.

واتە: هەر کەس دروشمەکانی (دینی) خوا بەگەورە راگرێ، جا بەڕاستی ئەو کارە لە خوا ترسی دڵەکانیانەوەیە (تەقواکارن).

لەبەرئەوەی تەنیا لە خوای گەورە دەترسن، لە غەیری ئەو ناترسن، نەرمی نایان گرێ لەجێبەجێ کردنی بڕیارەکانی خوای گەورەدا، راستگۆن لەگەڵ خوای گەورەدا لەسەر ئەو بەڵێن و پەیمانەی کە داویانە پێی بۆ سەرخستنی دین؛ بە وتەو بە کردەوە.

لە گەورەترین سیفەتەکانی ئەهلی سوننەو جەماعە ئەوەیە؛ خۆشەویستیەکی زۆر بە هێزیان هەیە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەشێوەیە کە خۆشەویستی هیچ کەسێ بەو ئەگات ئیتر هەر کەسێ بێت لەهەر پلەو پایەیەکدا بێت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ، وَوَلَدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)[1].

واتە: هیچ کەسێك لە ئێوە ئیمانی تەواوی نیە هەتا منی لەخۆی و لەباوکی و لەمنداڵەکەی لەهەموو کەس زیاتر خۆش نەوێت.

* هەوڵدەدەن وازبهێنن لە دووڕویی بەشێوەیە خێر و چاکەیان لەنهێنی و لە ئاشکردا وەك یەك بێ، کاروکردەوەی خۆیان بە کەم دەزانن چونکە خۆیان هەستاون بە ئەنجامدانی ئەو کارە، هەمیشە کاروکردەوەکانی دوارۆژ دەخەنە پێش کاروکردەکانی دونیاوە.

* دڵیان زۆر نەرمە، زۆر دەگرین لەسەر ئەو کەمتەخەمیەی کە هەیانە لە هەقی خوای گەورەدا، تا بەڵکو خوای پەروەردگار رەحمیان پێ بکات، لێیان خۆش بێت، لە هەڵەو تاوانەکانیان ببورێت.

---

(١) – رواه البخاري: (١٥).

* زۆر پەند وەردەگرن و دەگرین و گرنگی دەدەن بە کاروباری مردن بەتایبەتی لەکاتێکدا کە جەنازەیە دەبینن، یان لەکاتێکدا کە بیردەکەنەوە لە مردن و ئازار و ناخۆشیەکانی سەرەمەرگ و سەرەنجام و عاقیبەتی خراپ، هەتا دڵیان رادەچڵەکێ.

* زۆر خۆیان بەکەم دەزانن؛ هەرکەسێ لەوان هەتا لە خوای گەورە نزیکتر بێتەوە زیاتر خۆی بەکەم دەزانێت.

* تەوبەو پەشیمانی و زۆر گەڕانەوە بۆلای خوای پەروەردگار، بە شەو و بە رۆژ داوای لێخۆشبون دەکەن لە خوای گەورە؛ لەبەرئەوەی ئەوان ئاگادارن بەسەر نەفسی خۆیاندا کە پارێزراو نین لەئەنجامدانی تاوان تەنانەت لە گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورەو پەرستشەکانیاندا؛ بۆیە داوای لێخۆشبون دەکەن لە کەموکورتیەکانیان تیایدا، چاودێری کردنی خوای گەورە تیایدا، هیچ کاتێك بە هیچ شتێ لە کاروکردەوەکانیان لەخۆ بایی نابن، زۆر رقیان لە خۆدەرخستن و ناوبانگ دەرکردنە، بەڵکو باوەڕیان وایە کە کەمتەرخەمیان ئەنجامداوە لە گوێڕایەڵی و پەرستشەکەنیاندا، جگە لەو تاوانانەی کە ئەنجامیانداوە.

* زۆر هەوڵ دەدەن لە خوا بترسن، هیچ کەسێ لەوان بانگەشەی ئەوە ناکات کە کەسێکی خاوەن تەقوایە.

* زۆر دەترسن لە عاقیبەت و سەرئەنجامی خراپ لە کۆتایی ژیانیاندا.

* لە خوای گەورە زۆر دەترسن و هیچ کاتێ بێ ئاگا نین لە یادکردنی.

* هیچ کاتێ دڵخۆش نابن بە رازاوەیی و خۆشیەکانی ژیانی دونیای لەناوچو، دونیاو ئەوەشی کە تێیدایەتی زۆر بێ نرخە بەلایانەوە، زۆر بەتوندی خۆی و فیتنەو هەڵخەڵەتێنەرەکانی رەتدەکەنەوەو لێی دوردەکەونەوە، ئەو کارەشیان لەبەر تەواوی عەقڵ و ژیریانە.

* زۆر گرنگی نادەن بە کۆشك و تەلار و باڵەخانەی نایاب و بەهادار؛ تەنها ئەوەندە نەبێت کە پێویستیان پێی بێت، ئەویش بەبێ زیادە مەسرەفی و ڕۆچون و ڕازاندنەوە، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:
(وَاللهِ مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إلاَّ مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إصْبَعَهُ هَذِهِ فِي الْيَمِّ، فَلْيَنْظُرْ بِمَ يَرْجِعُ)[1].
واتە: سوێند بە خوای گەورە ئەم دونیا بەچاو دوارۆژەوە وەك ئەوە وایە یەکێ لەئێوە پەنجەی خۆی بکات بەناو ئاوی دەریادا؛ با سەیر بکات چەندە ئاو هەڵدەگرێ، جا ئەندازەی ئەو تەڕییە چەندە بەچاو دەریاکەوە دونیاش ئەوەندەیە بەچاو دوارۆژەوە.

* هیچ کاتێ ڕازی نین بەو هەڵەیەی ڕوبەڕوی دین بکرێتەوە، یان توشی موسوڵمانان بێت، بەڵکو بە توندی ڕەتی دەکەنەوە، (عذر)پۆزش بۆ ئەو کەسە دەهێننەوە کە ئەو قسەیەی کردووە، ئەگەر شایانی ئەوە بێت (عذر)پۆزشی بۆ بهێنرێتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە نەنگی برا موسوڵمانەکانیان زۆر داپۆشن، زۆر بە توندی موناقەشە لەگەڵ نەفسی خۆیاندا دەکەن لە مەقام و پێگەی وەرع دا، حەزناکەن شەرمگەی هیچ کەسێ لەموسوڵمانان دەربکەوێت، سەرقاڵ نابن بە عەیبەو نەنگی خەڵکەوە بەڵکو لەجیاتی ئەوە سەرقاڵ دەبن بە عەیبەو نەنگی خۆیانەوە و زیاتر خەریکی چاککردنی عەیبەکانی خۆیانن، بەردەوام لە هەوڵ و کۆششدان بۆ داپۆشینی عەیبەو نەنگی خەڵکانی تریش، نهێنیەکان دادەپۆشن، هیچ کاتێ ئەوەی کە دەیبیستن لە هەقی کەسێکی موسوڵماندا بەکەسی ڕاناگەیەنن، وازدەهێنن لە دوژمنایەتی خەڵك لەبەر هەواو ئارەزووی نەفس؛ تەنها لەکاتێکدا نەبێت کە دین پێویستی بکات واتە لەبەر خوا، زۆر لەگەڵیان هەڵدەکەن، هەوڵ دەدەن ڕوو بە ڕووی هیچ کەسێ نەبنەوە بە خراپە، دوژمنایەتی هیچ کەسێ لە

---

(١) – رواه مسلم: (٢٨٥٨).

موسوڵمان ناكەن، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ)(١). وفي رواية مسلم: (نَمَّامٌ).

واتە: ناچێتە بەهەشتەوە كەسێ كە دووزمانی بكات.

* دەرگای غەیبەتكردن لە دانیشتنەكانیاندا دادەخەن، زمانی خۆیانی لێ دەپارێزن؛ هەتا دانیشتنەكەیان نەبێتە كۆڕی تاوان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُۚ﴾ سورة الحجرات:١٢.

واتە: لەپاشملە بەخراپە باسی یەكتری مەكەن؛ ئایا كام لەئێوە پێ ی خۆشە كەگۆشتی برا (دینیەكەی) بخوات؟ بەمردوویی، بێگومان قێزتان لێ ی دێتەوەو پێتان ناخۆشە.

* زۆر بە حەیاو بە شەرمن، زۆر بە ئەدەبن، زۆر خۆیان شیرین دەكەن لە بەرچاوی خەڵك، زۆر ئارام و لەسەرخۆ و بە ویقارن، ئاكار و رەوشتیان زۆر جوانە، كەم دەدوێن و قسە كەم دەكەن، كەم پێدەكەنن، زۆر بێدەنگن، كاتێ كە قسەدەكەن بە حیكمەت و دانایی زۆر بە هێواشی و بە پێی پێویست دەدوێن بۆ ئەوەی بەرامبەرەكەیان بە ئاسانی تێ بگات و نەبنە زەحمەت بۆی، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

(مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ)(٢).

واتە: هەركەسێ كە باوەڕی بە خوای گەورەو بە رۆژی دوایی هەیە با قسەی چاك بكات، یان بێدەنگ بێت.

هەروەها دەفەرموێت: (مَنْ صَمَتَ نَجَا)(٣).

---

(١) – متفق عليه. أخرجه البخاري: ٢١/٨ (٦٠٥٦) ، ومسلم: ٧٠/١ (١٠٥) (١٦٧).

(٢) – متفق عليه. أخرجه البخاري: ١٢٥/٨ (٦٤٧٥) ، ومسلم: ٤٩/١ (٤٧) (٧٤) .

(٣) – ( صحيح سنن الترمذي: ٢٥٠١) تحقيق الألباني: صحيح، الصحيحة (٥٣٥).

واتە: هەرکەسێ بێدەنگ بێت سەرفرازو سەرکەوتووە.

* زۆر لێبوردەن بەرامبەر بەو کەسانەی کە ئازاریان داون بە لێدان یان بە ماڵ بردن، یان بە باسکردنی شەرەف و ناموس، یا وێنەی ئەوانە، وەك وەڵامدانەوەیە بۆ فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێت:

﴿ وَٱلْكَـٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ سورة آل عمران: ١٣٤. واتە: ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوە و دەبوورن لەخەڵك، خواش چاکەکارانی خۆش دەوێت.

* بێ ئاگانین لە دوژمنایەتی کردنی دوژمنی گەورەی نەوەکانی ئادەم شەیتان و یارمەتیدەرانی لە شەیتانەکانی جنۆکەو ئادەمی، بەردەوام لە هەوڵ و کۆششدان بۆ زانینی فرو فێڵ و پیلانەکانی.

* وەسوەسەیان نیە لە کاتی ئەنجامدانی پەرستشەکاندا؛ وەك دەستنوێژ و نوێژ و غەیری ئەوانیش، لەبەرئەوە هەموو ئەوانە لە کاروکردەوەکانی شەیتانن.

* زۆر پرسیار دەکەن دەربارەی حاڵ و کاروباری هاوڕێکانیان بۆ ئەوەی هەواڵیان بزانن، لەبەرئەوەی ئەگەر پێویستیان بە یارمەتی هەبوو لە خواردن و پۆشاك و ماڵ و سامان بۆیان جێبەجێ بکەن.

* خێر و چاکەی زۆر دەکەن بەو شتانەی کە لە پێویستی خۆیان زیادە؛ بەبێ زیادە ڕەوی و زیادە مەسرەفکردن و بە بەبێ ئەوەی دەستیان بقونجێنن بە شەو بە ڕۆژ، بە نهێنی و بە ئاشکرا، بەدەم هاوەڵ و خزمەکانیانەوە دەڕۆن و پێویستیەکانیان بۆ جێبەجێ دەکەن و دڵیان خۆش دەکەن.

* ئەگەر خوای گەورە ماڵی حەڵاڵی پێ بەخشین زیادەڕەوی و ئیسراف تێدا ناکەن، لەبەرئەوەی خوای گەورە کەسانێ کە مەسرەفی زیادە دەکەن خۆشی ناون.

* بە خراب باسکردنی پیسکەیی و چروکی؛ خاوەنی پیاوتی و سەخاوەت و بەخشندەیی زۆرن، ماڵ و سامانی خۆیان سەرف دەکەن، ڕوو خۆشن و دڵی برا

موسوڵمانەکانیان ڕادەگرن لەکاتی سەفەردا، لەکاتی نیشتەجێ بوندا، لەبەرئەوەی ئا ئەو کارە بەرز و شکۆمەندانە؛ دەبێتەهۆی پتەوکردنی نێوان موسوڵمانان لەسەرخستنی دیندا، کە ئامانجی هەرە گەورەیانە.

* زۆر خۆشحاڵ دەبن بە چاکەکردن لەگەڵ برا موسوڵمانەکانیان هەوڵی زۆر دەدەن بۆ هێنانەدی تەبایی و برایەتی لەنێوان برا موسوڵمانەکانیاندا، دڵیان خۆش بکەن و خۆشی و شادی بخەنە دڵ و دەروونیانەوە، لەمەشدا براکانیان پێش خۆیان دەخەن لەو شتەی کە خۆیان پێیان خۆشە.

* زۆر ڕێزدەگرن لە میوان خۆیان هەڵئەسن بە خزمەتکردنی مەگەر (عذر)ێکی شەرعییان هەبێ، لەبەرئەوەی ئەو کارە لە باوەڕهێنانەوەیە بە خوای گەورە، لەپاشدا باوەڕیان وا نیە کە ئەو خزمەت و میواندارییە بەس بێ، هەمیشە گومانی چاکیان پێ دەبات.

* وەڵامی برا موسوڵمانەکەی خۆیان دەدەنەوە لەکاتێکدا کە دەعوەتی دەکەن بۆ سەر سفرەو خوانێ، مەگەر کەسێك خۆراکەکەی حەرام بێت، یان تایبەت بێت بە دەوڵەمەندەکانەوەو هەژارەکانی لێ بێبەش کردبێ، یان بۆ بۆنەو ناونان و زەماوەندێ بانگ کرا بێت لەو شوێنەدا گوناهو ناشەرعی تێدا بێت لەوکاتەدا ناچێت بۆ ئەو شوێنە.

* زۆر بە ئەدەبن لەگەڵ منداڵدا چ جای لەگەڵ گەورەدا، زۆر بە ئەدەبن لەگەڵ کەسێکدا کە دوورەو نایناسن چ جای لەگەڵ کەسێکی نزیکدا، هەروەها لەگەڵ کەسێکی نەزاندا چ جای لەگەڵ کەسێکی زانادا.

* بەردەوام هەوڵ دەدەن بۆ چاککردنی نێوان موسوڵمانان؛ چونکە ئەو کارە بریتیە لە باشترین دەرگاکانی خێر، بریتیە لە لوتکەو ترۆپکی چاکە، لەبەرئەوەی چاککردنی نێوان موسوڵمانان ئەو پیلانانەی کە شەیتان دایڕشتوە بۆ تێکدانی موسوڵمانان هەڵیدەوەشێنێتەوە و مەبەستەکانی شەیتان کە هەوڵ دەدات

رقەبەرایەتی و دوژمنایەتی بخاتە نێوان موسوڵمانانەوە و نێوانیان تێك بدات ئەو کەسە بە چاککردنی نێوانیان پیلان و مەبەستەکانی شەیتان پوچەڵ دەکاتەوە.

* ئیرەیی و حەسودی بردن بە خەڵك قەدەغەدەکەن؛ لەبەرئەوەی حەسودی بردن تۆوی دووبەرەکی و رق و کینە دەچێنێت، هەروەها ئیمان لاوازی بەدوای خۆیدا دەهێنێت، هۆکارە بۆ خۆشویستنی دونیاو ئەو لەناو دونیادایە بەبێ مەبەستێکی شەرعی، لەبەرئەوەی کەسێ کە حەسود بێ باوەڕی تەواوی بە قەدەری خوای گەورە نیە، لەکاتێکدا کە حەسودی بە خەڵك دەبات بە خەڵك لەسەر ئەو شتەی کە خوای بەرز و بڵند پێی بەخشیون.

* فەرمان کردن بە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا، چاك بوون لەگەڵیان و و ڕێزگرتنیان، هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیان، بەخشینی ماڵ و سامان پێیان، ئازار نەدانیان، هەڵنەشاخان پێیاندا بە تایبەتی لەکاتی پیربونیاندا؛ لەبەرئەوەی چاك بون لەگەڵ دایك و باوك ڕەزامەندی خوای بەرز و بڵند بەدوای خۆیدا دەهێنێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴾ سورة الإسراء: ٢٣ - ٢٤.

واتە: پەروەردگارت بڕیاری داوە کە هیچ شتێ نەپەرستن بێجگە لە ئەو، لەگەڵ دایك و باوکتان چاکەبکەن، ئەگەر یەکێکیان (باوکت و دایکت) یان هەردووکیان لای تۆ پیربوون قسەی ناخۆشیان پێ مەڵێ تەنانەت ئۆفیش، وەتێیان مەخوڕە و پێیاندا هەڵمەشاخێ، (بەڵکو) ووتەی نەرم و شیرینیان (لەگەڵدا) بەکاربێنە. باڵی خۆ بەکەم زانینیان بۆ ڕابخە لەبەر بەزەیی و میهرەبانیت پێیان، بڵێ ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکە، هەرچۆنێ ئەوان منیان پەروەردە کرد بەمنداڵی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ ﴾ سورة الأحقاف: ١٥.

واتە: ئێمە ئامۆژگاری ئادەمیمان کرد بە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکی دا دایکی بە ناڕەحەتی و ئازارەوە هەڵی گرتووە، بەئازار و ناڕەحەتیش بوویەتی.

* فەرمان کردن بە چاك بوون لەگەڵ دراوسێ و بەجێهێنانی مافەکانیان و، نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی لەگەڵ بەندەکان و، بەجێهێنانی مافی پەیوەندی خزمایەتی و، سەلام لەیەکتر کردن و، بەزەیی هاتنەوە بە هەژار و کەمدەست و هەتیو و ڕێبواردا.

* قەدەغەکردنی فەخرو شانازی کردن و، فیزکردن و لوت بەرزی و خۆ بەگەورە زانین و، بە خۆ سەرسامبون و زۆرداری و بەدڕەوشتی و، دەستدرێژی کردنە سەر دروستکراوان بە ناهەق، فەرمان دەکەن بە پابەندبوون بە دادپەروەری لەهەموو شتێکدا.

* سوکایەتی نەکردن بە شتێ لە کاروکردەوە گەورەکان و وتەکان؛ کە شەرع هانی خەڵکی داوە بۆ ئەنجامدانیان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (لاَ تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ)[1].

واتە: ئەوەی پێی بوترێت چاکە بەکەمی مەزانەو بەسوك مەیگرە، با ئەوەیش بێ بەڕووی گەش و ڕووی خۆشەوە بگەی بە برای موسوڵمانی خۆت.

* قەدەغەکردنی گومانی خراپ، (جاسوسی) سیخوڕی کردن، شوێنکەوتنی عەورەت و عەیبەکانی موسوڵمانان، لەبەرئەوەی ئەو کارە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان تێك دەدات، ناکۆکی دەخاتە نێوان براکان بەینیان تێك دەدات، خراپەکاری و ئاژاوە دەڕوێنێ.

(١) - اخرجه مسلم: (٢٦٢٦).

* هیچ کاتێ لەسەر نەفسی خۆیان تورە نابن لە خەڵك، چونکە لە تورەبوون تێگەیشتون، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ سورة آل عمران: ١٣٤.

واتە: ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوە و دەبوورن لەخەڵك، خواش چاکەکارانی خۆش دەوێت.

ئەمانەو جگە لە وانەش؛ لە ئاکار و رەوشتی پێغەمبەرایەتی کە زۆر بەرزو پیرۆز بووە، لەسەر خاوەنی بێت کە پێغەمبەر موحەممەدە باشترین درودو تەواترین سەلام[1].

(١) – * الدعوة إلى منهج السلف الصالح؛ تهدف إلى بناء جيل موافق للجيل الأول الذي تربى على يد رسول الله صلى الله عليه وسلم وقد مدح الله رسوله بقوله: {وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ} وليس المقصود مجرد الموافقة في العقائد – وإن كانت العقائد هي الأصل الأول والأهم – ولكن المقصود أن نوافقهم في كل أمر من أمور ديننا العظيم، لأن منهج السلف الذي ندعو الناس إليه ليس علماً في الذهن المجرد وإنما يشمل منهجهم في العقيدة والتصور والسلوك والأخلاق، ومع الأسف أننا نجد – في عصرنا الحاضر – أن هذا الأمر المهم من منهج السلف لم يأخذ حقه من الاهتمام والعناية والتربية. وقد قال النبي صلى الله عليه وسلم : ((إنما بعثت لإتمم مكارم الأخلاق)) فالسلف اقتدوا برسول الله صلى الله عليه وسلم وتخلقوا بأخلاقه وامتثلوا أوامره، وكانوا كما قال تعالى: {كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ} وإذا أردنا النجاة فعلينا بما كان عليه سلفنا الصالح رضوان الله عليهم أجمعين.

## بەشێك لە ئامۆژگاریەكان و وتەكانی پێشەوایانی ئەهلی سوننە و جەماعە لە شوێنكەوتن و رێگری لە داهێنان.

١ – هاوەڵی پایەبەرز (مُعاذ)ی كوڕی جەبەل رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (أَيها النَّاس عَليكُم بالعِلْم قَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ، أَلا وإِن رَفْعَهُ ذهابُ أَهْلِه، وَإياكُمْ وَالبِدَع والتَبَدع والتنطع، وَعَليكُم بأمْرِكُم العَتيق)[1].

واتە: ئەی خەڵكینە ئاگاداربن دەست بە زانستەوە بگرن پێش ئەوەی بەرزبكرێتەوە و هەڵگیرێتەوە، ئاگاداربن هەڵگرتنەوەی زانست بریتیە لە رۆشتن و نەمانی ئەهلی زانست واتە زانایان، هۆشیاربن لە داهێنان لەدیندا بەناوی دینەوە، هەروەها لەوانەی كە بەردەوام خەریكی ئەنجامدانی بیدعەن، هەروەها هۆشیاربن دەربارەی رۆچون و زیادەڕەوی لەدیندا، دەست بگرن بە ئیسلامە راستەقینەكەوە.

٢ – هاوەڵی پایەبەرز (حذيفة)ی كوڕی یەمان رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (كلّ عبادة لم يَتَعبدْ بها أَصْحابُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلِه وَسَلَّمَ فلاَ تَتَعبَّدوا بها؛ فإن الأَوَّلَ لَم يَدع للآخِر مَقالا؛ فاتَّقوا اللهَ يا مَعْشَر القرّاء، خُذوا طَريقَ مَنْ كان قَبلكُم)[2].

واتە: هەر پەرستش و عیبادەتێ كە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەنجامیان نەدابێت ئێوەش مەیكەن، چونكە ئەو كەسانەی كە لەپێش ئێوەوە بوون هیچ شتێكیان نەهێشتۆتەوە بۆ ئەوانەی دوای خۆیان – واتە هەموو شتێكیان رونكردۆتەوە ئیتر پێویست بەوە ناكات هیچ كەسێ شتی تازە دابهێنێت لە دیندا، ئەی هەڵگرانی قورئان ئەی كۆمەڵی خوێنەوار و خاوەن زانستی لەخوا بترسن و خۆتان لەبیدعە بپارێزن، رێگەو رێبازی ئەوانەی پێش خۆتان بگرن – بێگومان مەبەستی لە رێگەی ئەهلی سوننەو جەماعەیە –.

(١) - (البدع والنهي عنها) لابن وضاح .

(٢) - رواه ابن بطة في : (الإبانة).

٣ – هاوەڵی پایەبەرز (عبد الله)ی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (مَنْ كان مُستنّا فَلْيَستن بمَنْ قَدْ مَاتَ أولئكَ أصْحابُ مُحمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كانوا خَيرَ هذه الأمَّة ، وأبَرها قُلوبا ، وأعْمقَها عِلْما ، وأقَلّها تكلفا ، قَوم اختارَهُمُ اللهُ لِصُحْبَة نَبيه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ونَقلِ دينه فَتَشبَّهوا بأخلاقِهم وطَرائِقهم؛ فَهُمْ كانوا عَلَى الهَدْي المُستقِيم)[1].

واتە: هەرکەسێ شوێن سوننەت و ئاکارو ڕەوشتی جوان دەکەوێت با شوێنی ئەوە بکەوێ کە مردووە؛ ئەوانەش هاوەڵانی پێغەمبەر بوون (صلی الله علیه وسلم) کە باشترین کەسی ئەم گەلە موسوڵمانە بوون، خاوەنی دڵ و دەروونێکی پاك و چاك بوون، زانیارییەکی قوڵیان هەبوو، تەکلیفیان کەم بوو، خوای گەورە هەڵیبژاردن بۆ هاوڕێیەتی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) و گەیاندنی دینەکەی، بۆ ئەوەی گەورەیی و فەزڵیان بزانن، شوێن پێیان هەڵگرن و لەسەر ڕێگە و ڕێبازیان بڕۆن، چونکە ئەوانە لەسەر ڕێگای هیدایەتی ڕاستەقینە بوون.

هەروەها دەڵێت: (اتَّبعوا ولا تَبْتَدعوا فَقَدْ كُفيتُم؛ عَلَيْكُم بالأَمرِ العَتيق)[2].

واتە: ئێوە شوێن شوێنەوارەکانی ئێمە بکەون داهێنان لەدیندا مەکەن چونکە ئەوەتان بەسە کە بۆ ئەوان بەس بووە؛ دەست بگرن بە ئیسلامە ڕاستەقینەکەوە، شوێن ڕێگەی ئەهلی سوننەو جەماعە بکەون و بیدعە لەدیندا دامەهێنن)[3].

٤ – هاوەڵی شەرعزان و پایەبەرز (عبد الله)ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: (لاَ يَزالُ النَّاسُ عَلَى الطَّرِيقِ؛ ما اتبَعوا الأَثَرَ)[4].

---

(١) – أخرجه البغوي في : (شرح السنة).

(٢) – أخرجه الدارمي في : (سننه).

(٣) – أخرجه الدارمي في : (سننه).

(٤) – رواه اللالكائي في : (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

واتە: بە بەردەوامی خەڵك لەسەر رێگە راستەکەی ئیسلامن تا ئەو کاتەی شوێن شوێنەواری ئەم ئیسلامە دەکەون.

هەروەها دەڵێت: (كل بِدْعَة ضَلالَة؛ وإنْ رآها الناس حَسَنَة)[١].

واتە: هەموو بیدعەیە گومراییە با خەڵکیش بە چاکی بزانن.

٥ - هاوەڵی پایەبەرز و بەرێز ئەبو (درداء) رەزای خوای لێ بێ دەڵێت:

(لَنْ تضل مَا أَخَذْتَ بالأَثَر)[٢].

واتە: هەرگیز گومڕا نابیت مادەم دەست بگریت بە ڕێوشوێنی پێشینەوە.

٦- پێشەواو خەلیفەی باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو (طالب) رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (لَو كانَ الدِّينُ بالرأي، لَكانَ باطنُ الخُفين أَحَقَّ بالمَسْحِ منْ ظاهِرِهما، وَلَكِنْ رأيتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ عَلَى ظاهِرِهما)[٣].

واتە: ئەگەر دین بە راو بۆچون بوایە، ئەوە ژێری خوفەکان شایستەترە مەسح بکرێن نەك سەری خوفەکان، بەڵام من بۆ خۆم پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) بینی بەشی سەرەوەی خوفەکانی مەسح دەکرد.

٧ - (عبد الله)ی کوڕی عەمری کوڕی عاص رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت:

(مَا ابْتُدِعَتْ بدْعَةٌ؛ إلا ازْدادَتْ مضيا، وَلاَ نُزِعَت سنةٌ؛ إلَّا ازْدادَت هَرَبا)[٤].

واتە: هیچ بیدعەیەك دانەهێنراوە، ئیللا جێگەی خۆی کردۆتەوە لەناو موسوڵماناندا واتە موسوڵمانانێکی زۆر خۆیان پێوە خەریك کردووە، هیچ سوننەتێکیش وازی لێ نەهێنراوە لەلایەن موسوڵمانانەوە ئیللا ئەو سوننەتە خۆی دورخستۆتەوە بۆتە شتێکی نامۆ لەناو موسڵماناندا.

---

(١) - رواه اللالكائي في : (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٢) - رواه ابن بطة في : (الإبانة).

(٣) - رواه ابن أبي شيبة في ( المصنف).

(٤) - رواه ابن بطة في : (الإبانة).

٨ – عابسی کوڕی ڕەبیعە دەڵێت: پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)م بینی ڕەزای خوای لێ بێ بەردە ڕەشەکەی ماچ دەکردو دەیفەرموو: (إِنِّي أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لَا تَضُرُّ وَلَا تَنْفَعُ وَلَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَبِّلُكَ مَا قَبَّلْتُكَ)[١].

واتە: سوێند بە خوای گەورە دەزانم کە تۆ بەردێکی نە زیان دەگەیەنیت و نەسودیش دەگەیەنیت، ئەگەر پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) نەدیایە ماچی دەکردی ئەوە هەرگیز ماچم نەدەکردی.

٩ – پێشەواو خەلیفەی دادپەروەر عومەری کوڕی (عبد العزیز) ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (قِفْ حَيْثُ وَقَفَ القوم ، فَإِنَّهُم عَنْ عِلْمٍ وَقَفوا ، وببَصر نافذ كفوا ، وهُم عَلَى كَشْفِها كانوا أقْوَى ، وبالفضْلِ لَو كان فيها أَحْرى ، فلئِن قُلتم : حَدَثَ بَعدَهُم ؛ فما أَحْدَثَهُ إلا مَنْ خالفَ هَدْيَهُم ، ورَغِبَ عَنْ سُنتِهم ، وَلَقَدْ وصفوا منه ما يشفي ، وتَكلَّموا منهُ بما يَكْفي ، فما فوقهُم مُحسر وما دُونَهُم مُقصر ، لقد قصرَ عَنْهُم قَومٌ فَجفَوْا وتجَاوزَهُم آخرون فغلَوْا ، وَإنهم فيما بين ذلك لَعَلى هُدى مُستقَيم)[٢].

واتە: لەسەر ئەوە بووەستە کە پێغەمبەری خوا هاوەڵانی لەسەر ڕاوەستان ئەوان چۆن لەسەر دین ڕاوەستابون تۆش بەو جۆرە ڕابووەستە، لەبەرئەوەی ئەوان بە زانستەوە ڕاوەستان، لەبەرئەوەی ئەوان بە تێڕوانینێکی زۆر وردەوە دەستیان گرتۆتەوە لەوەی بە شتێ دینداری بکەن لەدیندا نەبێت، ئەوان زۆر لەبەرتر و بەهێزتربون لەسەر دەرخستن و ئاشکراکردنی ئەگەر کارەکە چاکەی تێدا بوایە، زۆر شیاوتر بوون لەسەر بەدەستهێنانی ئەو فەزڵ و چاکەیەی کە تێیدابووە واتە ئەگەر چاک بوایە ئەوان ئەو کارەیان دەکرد نەك بیدعەچیەکان، جا ئەگەر ئێوە بڵێن: ئەمە شتێکە لەدوای ئەوانەوە داهێنراوەو پەیدا بووە؛ ئەوە بە دڵنیاییەوە بزانە کەسانێك دایانهێناوە کە بە پێچەوانەی ئەوانەوە هەڵسوکەوتیان کردووە، پشتیان

(١) – رواه البخاري ومسلم.

(٢) – أورده ابن قدامة في : (لمعة الاعتقاد الهادي إلى سبيل الرشاد)..

لە ڕێ و شوێنی ئەوان کردووە کە بریتین لە هاوەڵان و شوێنکەوتوانی ئەوان لە چاکەدا، ئەوان بە جۆرێ باسیان کردووە کە چارەسەری تەواو بێت، ئەوەندەش لەبارەیەوە دواون کە بەس بێت واتە بە گوێرەی پێویست لێی دواون، جا ئەوەی لەسەروی ئەوانەوە بێت زیان بەخشە نەك سود بەخش، هەرکەسێ لەخوار ئەوانەوە بێت ئەوە کەمتەرخەمە، کەسانێك لەوان کەمتریان کرد لە دینداریدا کەمتەرخەم بوون، خەڵکانێکیش بەوەی ئەوان لەسەری بوون ڕازی نەبون ڕۆچون، کەسانێکیش لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵەدا بوون لەسەر ڕێگەی هیدایەت و ڕێنماییەکی ڕاست و دروست بوون.

١٠ – پێشەوای پایەبەرز و بەڕێز ئەوزاعی دەڵێت: (عَلَيْكَ بآثارِ مَنْ سَلف وإِنْ رَفَضَكَ الناس ، وإيَّاكَ وآراءَ الرجال وإنْ زَخْرَفُوها لكَ بالقَول؛ فإِنَ الأمْرَ يَنْجلي وأَنتَ عَلى طريقٍ مُستقيم)[1].

واتە: پێویستە لەسەرت دەست بگریت بە ڕێوشوێنی پێشینەوە ئەگەر خەڵکیش ڕەفزت بکەن و پشتت تێ بکەن، ئاگاداری بیروبۆچونی پیاوان بە هەرچەندە بە قسەی لوسیش بۆت بڕازێننەوە؛ بێگومان کارەکە ئاشکراو ڕوونە و تۆش لەسەر ڕێگەی ڕاستی.

١١– ئەیوبی سەختیانی کە یەکێکە لە شوێنکەوتوان (تابعي الثقة) دەڵێت:

(مَا ازْدَادَ صَاحِبُ بِدْعة اجْتِهادا؛ إلا ازْدادَ مِن اللهِ بُعْدا)[2].

واتە: هیچ خاوەن بیدعەیە زیاتر خۆی ماندو ناکات لەو بیدعەیەی کە دەیکات تێبکۆشێ(إجتهاد) بکات؛ ئەوە بە دڵنیاییەوە زیاتر لە خوای گەورە دوردەکەوێتەوە بەو بیدعەیەی کە دەیکات.

---

(١) – أخرجه الخطيب في : (شرف اصحاب الحديث).

(٢) – (البدع والنهي عنها) لابن وضاح .

١٢ - زانای پایەبەرز و شەرعزان حەسانی کوڕی (عطِيَّة) کە یەکێکە لە شوێنکەوتوان دەڵێت: (مَا ابْتَدَعَ قومٌ بِدْعةً في دينهم؛ إلا نُزِعَ مِنْ سُنتِهِم مثلُها)[1].

واتە: هیچ کۆمەڵێ بیدعەیان لە دینەکەیاندا دانەهێناوە؛ ئیللا بە وێنەی ئەو بیدعەیە سوننەتێك لەناویاندا هەڵکەنراوەو لابراوە.

١٣- پێشەوای خواناس خۆپارێز لە گوناهو تاوان موحەممەدی کوڕی سیرین رەحمەتی خوای لێ بێ کە یەکێکە لە شوێنکەوتوان دەڵێت: (كانوا يَقولون: ما دامَ عَلَى الأَثَرِ؛ فَهُوَ عَلَى الطَّرِيقِ)[2].

واتە: پێشینانی ئەم ئوممەتە دەیانوت: مادەم ئەو کەسە لەسەر سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ڕێوشوێنی پێشینە چاکەکانە؛ ئەوە لەسەر ڕێگە راستەکەیە.

١٤ - پێشەوا (حافظ) سوفیانی (ثوري) رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت:

(البِدْعَةُ أَحَب إلى إبْليسَ مِن المعصيَة، المعصيَةُ يُتَابُ منها، والبِدْعَةُ لا يُتَابُ منها)[3].

واتە: بیدعە لەلای شەیتان خۆشەویسترە لە تاوان، چونکە تاوان تەوبەی لەسەر دەکرێت، بەڵام بیدعە تەوبەی لەسەر ناکرێت.

١٥ - پێشەوا (حافظ الغازي) (عبد الله)ی کوڕی موبارەك رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (لِيَكُنِ الذي تَعْتَمِدُ عَليه الأَثَر، وَخُذْ مِن الرَّأْيِ مَا يُفسِّر لكَ الحديث)[4].

واتە: با ئەوەی کە پشتی پێ دەبەستی لەدینەکەتدا سوننەت و ڕێوشوێنی پشین بێت، راوبۆچون ئەوەندە وەربگرە کە فەرمودەت بۆ رون بکاتەوە.

---

(١) - أورده ابن قدامة في : (لمعة الاعتقاد الهادي إلى سبيل الرشاد).

(٢) - أورده ابن قدامة في : (لمعة الاعتقاد الهادي إلى سبيل الرشاد).

(٣) - أخرجه البغوي في : (شرح السنة).

(٤) - اخرجه البيهقي في : (سنن الكبرى).

١٦- پێشەوا شافیعی رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (كلُّ مَسْأَلَة تَكَلَّمْتُ فيها بخلافِ السنة، فَأنا راجعٌ عنها، في حَياتي وبَعْدَ مماتي)[1].

واتە: هەر بابەتێك كە قسەم لەبارەیەوە كردبێت بە پێچەوانەی سوننەتەوە، ئەوە من لێی پاشگەز دەبمەوە لە ژیانمداو لەدوای مردنیشم.

لە رەبیعی كوڕی سولەیمانەوە هاتووە: كە پێشەوا شافیعی رۆژێ فەرمودەیەكی دەگێڕایەوە، پیاوێ پێی وت: ئەی باوكی (عبد الله) ئایا خۆت دەستی پێوە دەگریت و پەیڕەوی لێ دەكەیت؟ وتی: (مَتى ما رَوَيتُ عَن رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَديثا صحيحا، فَلم آخذْ بِهِ، فأشهدكُم أن عَقلي قَدْ ذهَب)[2].

واتە: هەركاتێ فەرمودەیەكی راست و دروستم لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) گێڕایەوەو خۆم دەستم پێوە نەگرت و پەیڕەوم نەكرد، ئەوە شایەتی دەدەم كە عەقڵم تێك چووە.

١٧ - لە نوح (الجامع)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: بە ئەبو حەنیفەم رەحمەتی خوای لێ بێ وت: چی دەڵێی دەربارەی ئەو كەسانەی كە زانستی كەلام باس دەكەن دەربارەی (الأعراض والأجسام)؟ واتە دەربارەی خوای گەورە بە جۆرێ قسە دەكەن كە پێچەوانەی عەقیدەی راست و دروستە، ئەبو حەنیفە وتی: (مقالاتُ الفَلاسفة، عَليكَ بالأثرِ وطريقةِ السلفِ، وإياكَ وكل محدثة، فإنها بدعة)[3].

واتە: ئەوە قسەو قسەڵۆكی فەیلەسوفەكانە، ئاگاداربە تۆ شوێن فەرمودە و رێوشوێنی پێشین بكەوە، هۆشیاربە لە هەموو ئەو شتانەی كە دائەهێنرێن، چونكە بیدعەیە، بیدعەش گومڕایی یە.

---

(١) - أخرجه الخطيب في : (الفقه والمتفقه).

(٢) - رواه ابن بطة في : (الإبانة).

(٣) - أخرجه الخطيب في : (الفقه والمتفقه).

١٨- پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (السنَّة سَفينةُ نوح مَن رَكبَها نجَا، ومَن تَخَلَّفَ عنها غَرِقَ)[1].

واتە: سوننەت کەشتی نوحە هەرکەسێ سواری ببێ ڕزگاری دەبێ، هەرکەسێ دوا بکەوێت ئەوە غەرق دەبێ و دەخنکێ.

هەروەها دەڵێت: (لو كان الكَلامُ علما لَتكلّم فيه الصَّحابةُ والتابعُون كما تَكلموا في الأَحكامِ؛ ولكنهُ باطل يَدُل عَلَى باطِل)[2].

واتە: ئەگەر کەلام - قسەی یۆنان و ڕۆمان - زانست بوایە ئەوا هاوەڵان و شوێنکەوتوان لێی دەدوان و قسەیان تێدا دەکرد، هەروەك چۆن دەربارەی ئەحکامەکان و شەریعەتی ئیسلامەوە قسەیان کردووە، بەڵام کەلام پوچ و بەتاڵە بەڵگەیە لەسەر پوچ و بەتاڵیەتی.

لە ئیبنو ماجیشونەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: گوێم لێ بوو پێشەوا مالیك دەیوت: (مَن ابْتَدَعَ في الإِسلام بدعة يَراها حَسَنة؛ فَقَدْ زَعَمَ أَن مُحَمّدا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خانَ الرّسالَةَ؛ لأَن اللهَ يقولُ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾. فما لَم يَكُنْ يَوْمَئذ دينا، فَلا يكُونُ اليَوْمَ دينا)[3].

واتە: هەرکەسێ لە ئیسلامدا بیدعەیە دابهێنێ و پێی چاك بێ، ئەوە گومانی وایە کە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ناپاکی و خیانەتی کردووە لە پەیامەکەی خوای گەورە، لەبەرئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ سورة المائدة: ٣. واتە: ئەمڕۆ دینەکەتانم تەواو (کامڵ) کردووە بۆتان.

ئەوەی ئەو ڕۆژە دین نەبووبێت، ئەمڕۆش دین نیە.

---

(١) - (مفتاح الجنة في الإحتجاج بالسنة) لسيوطي.

(٢) - (شرح السنة) للإمام البغوي.

(٣) - (الاعتصام) للإمام الشاطبي.

١٩- پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پێشەوای ئەهلی سوننە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (أصولُ السنَّة عنْدَنا: التمسك بما كان عَليه أَصْحاب رَسُول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآله وَسَلَّمَ والاقْتداءُ بهم ، وتَرك البدَع ، وكل بدعة فهيَ ضَلالة)[1].

واتە: بنچینەکانی سوننەت لەلای ئێمە: دەستگرتنە بەوەوە کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسەری بوون، شوێنکەوتنی ئەوانەو، وازهێنانە لە بیدعەکان، هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە.

٢٠ – پێشەوا حەسەنی بەصری کە یەکێکە لە شوێنکەوتوان ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (لو أَن رجُلا أَدركَ السلفَ الأَولَ، ثم بُعثَ اليومَ ما عَرَفَ من الإسلام شيئا). واتە: ئەگەر پیاوێ بگەیشتایە بە پیاوانی پێشینی یەکەم واتە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەمڕۆ زیندو بکرایەتەوە هیچ شتێکی لە ئیسلام نەدەناسیەوە واتە هیچ شتێکی ئیسلام وەك خۆی نەماوەتەوە. وتی: لەپاشدا دەستی خستە سەر کوڵمی ئینجا وتی: (إلَّا هذه الصلاة). واتە: تەنها ئەم نوێژە نەبێ وەك خۆی ماوەتەوە، جا وتی: (أَما والله ما ذلكَ لمن عاشَ في هذه النكراء ولم يدرك هذا السلف الصالح؛ فرأى مبتدعا يدعو إلى بدعته، ورأى صاحبَ دنيا يدعو إلى دنياه؛ فعصمهُ الله من ذلكَ، وجعلَ قلبهُ يحنّ إلى ذلك السَّلف الصالح يَسْأَلُ عن سبيلهم، ويقتص آثارهم، ويَتّبعُ سبيلهُم، ليعوض أَجرا عَظيما؛ فكذلك فكونوا إن شاء الله)[2].

واتە: سوێند بە (الله) ئەوەی لەناو ئەم خراپەکاری و بگرەو بەردەیەدا ژیابێ و، نەگەیشتبێ بە سەلەفە صاڵحەکان؛ بیدعەچیە دەبینێ بانگەواز بۆ بیدعەکەی خۆی دەکات، دونیا ویستێ دەبینێ بانگەواز بۆ دونیاکەی خۆی دەکات، خوای گەورە ئەو کەسەی لەوە پاراستوە، دڵەکەی بەلای سەلەفە صاڵحەکاندا لادەدات و دەگەڕێ بە

(١) – رواه اللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٢) – (البدع والنهي عنها) لابن وضاح.

شوێن ئەوانداو دەربارەی ڕێگەو ڕێبازیان پرسیار دەکات، بەدوای شوێن پێی ئەواندا دەگەڕێت، شوێن ڕێگەو ڕێبازی ئەوان دەکەوێت، ئەوە پاداشتێکی گەورە بەدەست دەهێنێ لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، دەی ئێوەش هەر بەو شێوەیە بن ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت.

٢١ – پێشەواو زانای خواناس و زاهید (فضیل)ی کوڕی (عیاض) ڕەحمەتی خوای لێ بێ چەند جوانی وتووە لەکاتێکدا کە دەڵێت: (اتبعْ طُرقَ الهُدی ولا يَضرك قلَّةُ السالكينَ، وإياكَ وطُرقَ الضلالة ، ولا تغتر بكثرة الهالكين) [1].

واتە: شوێن ڕێگەکانی ڕێنموییی و هیدایەت بکەوە کەمی شوێنکەوتوانی زیانت لێ نەدات، ئاگاداربە نزیکی ڕێگەکانی گومڕایی نەبیتەوە، مەخەڵەتێ بە زۆری ئەو خەڵکانەی کە تیاچوون بەوەی شوێن ڕێگەکانی گومڕایی گەوتون.

٢٢– کەسێك دەربارەی بابەتێ پرسیاری کرد لە هاوەڵی شەرعزان (عبد الله)ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ ئەویش بە پێی قورئان و سوننەت وەڵامی کەسەکەی دایەوە، کابرا پێی وت: باوکی تۆ ڕێگری لەوە دەکرد، (عبد الله)ی کوڕی عومەر وتی: (أأمْرُ رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآله وَسَلَّمَ أَحَق أنْ يتبعَ، أو أمرُ أبي؟!)[2]. واتە: ئایا فەرمانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شیاوترە بەوەی کە شوێنی بکەوین یان فەرمانی باوکم؟!.

* بەردەوام (عبد الله)ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ یەکێك بوو لەو هاوەڵانەی کە شوێنکەوتنی سوننەتی زۆر بەتوندی گرتبوو، زۆر بەتوندی ئینکاری بیدعەکانی دەکرد، جارێ گوێی لە پیاوێ بوو پژمی وتی: (الحمد لله، والصلاة والسلام علی رسول الله). ئەویش پێی وت: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەم شێوەیە فێری نەکردوین، بەڵکو دەفەرموێت: (إذا عَطَسَ أحَدُكُمْ؛ فَلْيَحْمد الله) ولم يَقلْ: وليُصل عَلَی

---

(١) – (الاعتصام) للإمام الشاطبي.

(٢) – (زاد المعاد) لابن القيم.

رَسُولِ اللهِ)[١]. واتە: ئەگەر کەسێ لە ئێوە پژمی با بڵێت: (الحمدلله). نەیفەرموو: سەڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

٢٣ – (عبد الله)ی کوڕی عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەربارەی ئەو کەسەی کە بەرەنگاری سوننەتی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دەکرد بە وتەی ئەبو بەکر و عومەر، وتی: (يُوشكُ أَنْ تَنزلَ عَليكُم حِجارة من السماءِ؛ أَقولُ لَكُم: قالَ رسولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قالَ أَبو بكر وعُمر)[٢].

واتە: نزیکە بەرد لە ئاسمانەوە ببارێت بەسەرتاندا! من بە ئێوە دەڵێم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وا دەفەرموێت، ئێوە دەڵێن: ئەبو بەکر و عومەر وا دەفەرمون.

* سوێند بە (الله) ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ راستی وتووە لەکاتێکدا کە وەسفی ئەهلی سوننە دەکات و دەڵێت: (النظرُ إلى الرَّجُلِ من أَهْل السُّنة؛ يَدْعو إلى السنة، ويَنهَى عن البدعةِ)[٣].

واتە: سەیرکردنی پیاوێك کە لە ئەهلی سوننە بێت، هەر تەماشاکردنەکەی بانگەوازە بۆلای سوننەت، رێگری کردنە لە بیدعە.

٢٤ – پێشەواو (حافظ) سوفیانی (ثوري) رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت:

(إذا بَلغكَ عن رجُلٍ بالمشرق؛ أنه صَاحبُ سُنة، فابعثْ إليه بالسلام؛ فقد قل أَهل السنَّة)[٤].

واتە: ئەگەر هەواڵت پێ گەیشت وتیان پیاوێ لە رۆژهەڵات لە ئەهلی سوننەیە، ئەوا سەلامی بۆ بنێرە؛ بێگومان ئەهلی سوننەت کەمبونەتەوە.

(١) – أخرجه الترمذي في : «سننه»، بسند حسن.

(٢) – رواه عبد الرزاق في : «المصنف» بسند صحيح.

(٣) – رواه اللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٤) – رواه اللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

٢٥ – ئەیوبی سەختیانی کە یەکێکە لە شوێنکەوتوان ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (إِنِّي لأُخبَرُ بموتِ الرجُلِ من أهلِ السنة؛ فكأنِّي أَفقدُ بعضَ أعضائي)[1].

واتە: واتە: کاتێ کە هەواڵی مردنی پیاوێ لە ئەهلی سوننەم پێ دەدرێ، وەك ئەو وایە کە هەندێ لە ئەندامەکانی جەستەم لەدەست بدەم.

٢٦ – پێشەواو خواناس (فضیل)ی کوڕی (عیاض) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (إنَ لله عبادا يُحْي بهم البلادَ؛ وهُم أَصْحابُ السنة)[2].

واتە: بە دڵنیاییەوە خوای گەورە هەندێ بەندەی هەیە وڵاتەکانی پێ دەبوژێنێتەوە ئاوەدانی دەکاتەوە، کە ئەوانەش ئەهلی سوننەن.

٢٧ – پێشەوای تێکۆشەرانی ڕێگەی خوای گەورە (عبد الله)ی کوڕی موبارەك ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (اعْلَمْ- اي أَخي- أَن الموتَ اليومَ كرامة لكلِّ مسلم لقيَ اللهَ عَلى السنة ، فإنا لله وإِنَّا إِليه راجعون؛ فإِلَى اللهِ نَشكو وَحْشَتَنا، وذهابَ الإِخوان، وقلةَ الأعوانِ، وإِلى الله نَشكو عَظيمَ ما حل بهذهِ الأمةِ من ذهاب العلماء، وأَهل السنة ، وظُهور البدع)[3].

واتە: بزانە ئەی برای خۆم، مردن لەم ڕۆژگارەدا ڕێزو کەرامەتە بۆ هەموو موسوڵمانێ کە لەسەر ڕێگەی سوننەت بمرێت و بگات بە دیداری خوای گەورە، لەلایەن خوای گەورەوە هاتوین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە، سکاڵای خۆمان بۆلای خوای گەورە بەرزدەکەینەوە لە نامۆیی و ڕۆیشتن و نەمانی برایان و کەمی ئەو کەسانەی کە یارمەتیدەرن لەسەر شوێنکەوتنی سوننەت، هەروەها سکاڵای خۆمان بۆلای خوای گەورە بەرزدەکەینەوە لەوەی بەسەر ئەم ئوممەتەدا هاتووە لە ڕۆیشتن و نەمانی زانایان و ئەهلی سوننەو، دەرکەوتنی بیدعە.

(١) – رواه اللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).
(٢) – رواه اللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).
(٣) – (البدع والنهي عنها) لابن وضاح.

٢٨- پێشەوای فەرمودەناس قوتەیبەی کوڕی سەعید ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (ئەگەر پیاوێکت بینی ئەهلی فەرمودەی خۆش دەویست؛ وەك: یەحیای کوڕی سەعیدو، (عبد الرحمن) کوڕی مەهدی و، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و، ئیسحاق کوڕی راهویە ... ناوی چەند کەسێکی تری هێنا، ئەوە بزانە ئەو کەسە لەسەر سوننەتە، هەرکەسێکیش پێچەوانەی ئەوانە جوڵایەوە ئەوە بزانە ئەو کەسە بیدعەچییە)[1].

٢٩ - پێشەوا شافیعی راستی فەرموو لەکاتێکدا کە وەسفی ئەهلی سوننە دەکات و دەڵێت: (إذا رأيتُ رَجُلا من أصْحاب الحديث، فكأنِّي رأيتُ رَجُلا من أصْحاب رسُولِ الله)[2].

واتە:کاتێ کە سەیری کەسێ لە هەڵگرانی فەرمودە دەکەم واتە فەرمودەناس، وا ئەزانم یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەبینم.

٣٠ - پێشەوای پایەبەرز ئەوزاعی دەڵێت: (العلم ما جاء عن أصحاب محمد، وما لم يجيء عن واحد منهم فليس بعلم)[3].

واتە: زانست ئەوەیە کە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) هاتووە، ئەو زانستەی کە لە یەکێ لەوانەوە نەهاتبێ ئەوە زانست نیە.

٣١ - ئیبراهیمی کوڕی نەخەعی (حافظ) و فەقیهی عیراقی کە یەکێکە لە پێشەوایانی شوێنکەوتوان ڕەحمەتی خوای لێ بێ چەند جوانی وتووە دەربارەی شوێنکەوتن و بیدعە دانەهێنان لە دیندا لەکاتێکدا کە دەڵێت: (لو أن أصْحابَ مُحَمّدٍ مَسَحُوا عَلَى ظُفرٍ لما غَسَلته؛ التماس الفضل في اتِّباعهمْ)[4].

---

(١) - رواه اللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٢) - اخرجه الخطيب في : (شرف أصحاب الحديث).

(٣) - جامع بيان العلم وفضله للإمام ابن عبد البر.

(٤) - رواه ابن بطة في : (الإبانة).

واتە: ئەگەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مەسحی سەر نینۆکەکانیان بکردایە ئەوا منیش هەرگیز ئەم دەشۆردن؛ لەبەر فەزڵ گەورەییان و شوێنکەوتنی سوننەتدا.

٣٢ – قەتادەی کوڕی دیعامەی بەصری (حافظ) کە یەکێکە لە پێشەوایانی شوێنکەوتوان رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (شیاوترین کەسانێ کە ئێوە بە راستگۆیان بزانن و شوێنیان بکەون بریتین لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەوانەی کە خوای گەورە هەڵیبژاردن بۆ هاوڕێیەتی پێغەمبەرەکەی و، پیادەکردنی دینەکەی)[1].

٣٣ – هاوەڵی پایەبەرز (عبدالله)ی کوڕی مەسعود رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى اطَّلَعَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ؛ فَاخْتَارَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَعَثَهُ بِرِسَالَتِهِ، وَانْتَخَبَهُ بِعِلْمِهِ، ثُمَّ نَظَرَ فِي قُلُوبِ النَّاسِ بَعْدُ؛ فَاخْتَارَ أَصْحَابًا جَعَلَهُمْ أَنْصَارَ دِينِهِ، وَوُزَرَاءَ نَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[2].

واتە: خوای گەورە سەیری دڵی بەندەکانی کرد؛ موحەممەدی (صلی الله علیه وسلم) هەڵبژاردو کردی بە پێغەمبەر و نامەی بۆ رەوانە کرد، لەپاشدا سەیری دڵی خەڵکەکانی کرد؛ هاوەڵانی هەڵبژاردو کردنی بە هاوڕێی دینەکەی و، وەزیری پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم).

هەروەها دەڵێت: (اتَّقُوا اللهَ عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ؛ فَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُنْ لِيَجْمَعَ أُمَّةَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الضَّلَالَةِ حَتَّى يَسْتَرِيحَ بَرٌّ، أَوْ يُسْتَرَاحَ مِنْ فَاجِرٍ)[3].

واتە: لەخوا بترسن و دەستبگرن بە کۆمەڵی موسوڵمانانەوە، لەبەرئەوە هەرگیز خوای گەورە ئوممەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لەسەر گومڕایی

---

(١) – (المسند) إمام أحمد: ج٣، ص ١٣٤، (مسند أنس بن مالك).

(٢) – رواه اللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٣) – رواه اللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

کۆناکاتەوە، ئارام بگرن هەتا چاکەکار دەمرێ و دەحەوێتەوە، یان خراپەکار دەمرێ لەدەستی دەحەوێنەوە.

٣٤ – ئەیوبی سەختیانی کە یەکێکە لە شوێنکەوتوان رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: (إن من سعادة الحدث والأعجمي؛ أن يوفقهما الله تعالى لعالم من أهل السنة)[1].

واتە: خۆشبەختی کەسێ کە تازە موسوڵمان بێ و بێگانە بێ بەزمانی عەرەبی لەوەدایە کە خوای گەورە سەرکەوتوی بکات بیانخاتە بەردەستی زانایە لە ئەهلی سوننە.

٣٥ – پێشەوا مالیك رەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ قاعدەیەکی گەورەو گرنگی داناوە پوختەی هەموو ئەوانەیە کە باسکران لە وتەی پێشەواکان دەڵێت: (لَنْ يَصْلُحَ آخرُ هَذهِ الأمةِ إلاَّ بما صَلُحَ بِهِ أوَّلها؛ فَمَا لَمْ يَكُنْ يوْمئذ دينا لاَ يَكُونُ اليَوم دِينا)[2].

واتە: کۆتایی ئەم ئوممەتە چاك نابێ تەنها بەوە نەبێ کە سەرەتای پێ چاك بوو؛ ئەوەی ئەو کاتە دین نەبوبێت، ئەم رۆژگارەش هەرگیز دین نیە.

* * ئەمە بریتیە لە چەپکێ گوڵی بۆنخۆش لە وتەکانی هەندێ لە پێشەواکانی سەلەفی صالح؛ لە ئەهلی سوننەو جەماعە کە جێگەی ئیعتیبارن؛ لە فەرمان کردنیان بە شوێنکەوتنی سوننەت، رێگری کردنیان لە داهێنان لە دیندا، ئەوانە ئامۆژگارترین کەسن، چاکەکارترین کەسن بۆ گەلەکەیان، زاناترین کەسن کە چاکسازی و، رێنمایی و، سەرفرازی و رزگاربوونیان بۆ گەلەکەی خۆیان دەوێت لە دونیاو لە دوارۆژدا، وەسیەت و ئامۆژگاری ئوممەتەکەیان دەکەن بە چەند شتێك:

(١) – رواه اللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

(٢) – انظر: «الشفا» للقاضي عياض، ج ٢، ص ٨٨.

* بە دەستگرتن بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەوە (صلى الله عليه وسلم)، بە دەستگرتن بەوەوە کە هاوەڵە بەڕێزەکان لەسەری بوون خوای گەورە لە هەر هەموویان رازی بێت.

* هۆشیاریان دەدایە گەلەکەیان سەبارەت بە داهێنراوەکان لە دینداو بیدعەو شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو، گەلەکەیان ئاگادار دەکردەوە لە ڕێگەو ڕێبازی ئەهلی هەواو ئارەزوو گومڕایی و بێ باوەڕی.

* هەواڵ دەدەن وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فێری کردن بەوەی کە ڕێگەی ڕزگاری و سەرفرازی و سەرکەوتن و بەختەوەری و سەربەرزی و شکۆمەندی لە دونیاو دوارۆژدا بریتیە لە: دەستگرتن بە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و و پشتیوانی کردنی، دەستگرتن بە ڕێنموییە بەڕێزەکەیەوە، بە ڕێگەو ڕێبازە ڕاستەکەیەوە لەهەموو گەورەو بچوکێکدا، کە ئەمەش کارکردنە بەم فەرمایشتانەی خوای گەورەوە:

﴿ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾ سورة الزمر: ٥٥.

واتە: شوێن چاکترین شتێ بکەون کە نێردراوەتە خوارەوە بۆتان لە پەروەردگارتانەوە، بەر لەوەی لەناکاودا سزاتان بۆ بێت کە ئێوە هەر هەستی پێ نەکەن.

﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ سورة الحشر: ٧.

واتە: ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێ ی دان وەریبگرن، ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بێنن و لە خوا بترسن بێگومان خوای گەورە سزای سەختە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴾ سورة الأنفال: ٢٤.

واتە: ئەی ئەوانەی کەبڕواتان هێناوە وەڵامی خوا و پێغەمبەر بدەنەوە کاتێك کە بانگتان دەکەن بۆ لای ئەو (دینەی) کە زیندوتان دەکاتەوە، بشزانن بەڕاستی (ویستی) خوا دەبێتە بەربەست لەنێوان ئادەمی و دڵی دا (واتە ئەو پەڕی دەسەڵاتی هەیە بەسەر دڵی بەندەکانیدا)، بەڕاستی هەر لای ئەو کۆ دەکرێنەوە (لەڕۆژی دوایی دا).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴾ سورة محمد: ٣٣.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە فەرمان بەرداری خواو پێغەمبەربن و کردەوە (چاکە)کانتان هەڵمەوەشێننەوە.

## مەرجەکان و ڕێکخەر(ضوابط)ەکانی بانگەوازکردن بۆ عەقیدەی ئەهلی سوننە وجەماعە

**بزانە برای موسوڵمان:** بانگەوازکردن بۆ عەقیدەی سەلەفی صالح؛ ئەهلی سوننەو جەماعە نابێ و ڕاناوەستێ؛ تەنها بەم سێ مەرجانە نەبێت:

**یەکەم – پارێزراویەتی بیروباوەڕ:** دەبێت بیروباوەڕ هاوڕێك و تەبا بێت لەگەڵ بیروباوەڕی پێشینە چاکەکانی ئەم ئوممەتە موسوڵمانەدا؛ هەروەها لەگەڵ یەکخواناسی لە پەروەردگارێتی و لە پەرستراوێتی و لە ناوەکان و سیفەتەکانی خوای گەورەو پەروەردگاردا، لەهەموو بابەت و مەسەلەکانی تری بیروباوەڕ و، باسەکانی باوەڕهێناندا.

**دووەم – پارێزراویەتی پەیڕەو و پرۆگرام:** واتە: تێگەیشتن لە قورئان و سوننە لەبەر ڕۆشنایی ئەو بناغەو بنەماو قاعیدانەی کە ئەوان دایان ناوە.

**سێیەم – پارێزراویەتی کردەوە،** واتە: هیچ داهێنانێ نەکەین لە کردەوە و پەرستشەکاندا؛ بەڵکو دەبێت هەموو کردەوەکانمان ساغ لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بێت ، ڕێك و تەبا بێت لەگەڵ شەرع و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) ئیتر ئەو کارە بریتی بێ لە بیروباوەڕ، یان کردەوە و ڕەفتار بێ، یا وتەو گوفتار.

گەیاندنی ئیسلامی ڕاستەقینە، فێرکردنی خەڵك بە دینێکی پاك و دور لە هەموو شیرك و خورافەتێك، بڵاوکردنەوەی (توحید)یەکخواناسیی ساغ و پوخت؛ بریتیە لە بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە، ئەم کارەش بریتیە لە بەڕێزترین و باشترینی کاروکردەوەکان سودمەندترینیانە، بریتیە لە بەرزترین پەرستشەکان و پیرۆزترینیان، بریتیە لە گەورەترین تایبەتمەندترین تایبەتمەندێتی نێردراوان و پێغەمبەرانە سڵاوی خوای گەورەیان لەسەربێت، لە دیارترین کاری گرنگ و ئامانج و

مەبەستی دۆستانی خوای گەورەو هەڵبژێردراوانیەتی لە بەندەچاکەکان و لەخوا ترسەکان؛ ئەوانەی کە خوای گەورە وەسفی کردون لەم فەرمایشتە پیرۆز و بەرێزەیدا.

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ فصلت: ٣٣.

واتە: کێ ووتەی چاکترو بەجێترە لەوکەسەی (خەڵك) بۆلای خوا بانگ دەکات، وەکاری چاکە دەکات و دەڵێ بێگومان من لەپێری موسڵمانانم.

بانگخوازان بۆلای خوای گەورە؛ لە هەموو کەس زیاتر کۆڵ و ئەرکی سەرشانیان قورسترە، گەورەترینی کەسن کە خەڵکانی زۆر شوێنیان بکەوێت، زۆرترین بەرپرسیارێتیان لە ئەستۆدایە، ئەوەش لەبەرئەوەیە لەبەرزترینی پلەکاندان، پێگەو پلەوپایەیان زۆر بەرزە، ئەوان هەستاون بە جێبەجێ کردنی کاری پێغەمبەران کە بریتیە لە بەرزترین و بەرێزترینی کارەکان؛ بەڵکو بریتیە لە گەورەترین و بەرزترین مەبەست و ئامانج لەم ژیانەدا؛ چۆن وا نەبێت؟ لەکاتێکدا کە بانگەوازکردنە بۆ لای پەرستشی خوای تاقانەو بێ هاوەڵ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴾ سورة الأنبياء: ٢٥.

واتە: ئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لەمن هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە، کەواتە تەنها من بپەرستن.

بانگخوازان بۆلای خوای گەورە؛ بریتین لە کۆمەڵێکی پاك و ساغ و هەڵبژێردراو لە پیاوەکانی ئوممەت، لەبەرئەوە هەڵسانیان بە بانگەوازکردن بۆلای خوای گەورە پێویستی دەکات بە جۆرێ بێ کە نموونەیەکی بەرزو بێ وێنە بن بۆ ئەوەی خەڵك بیانکەنە سەرمەشق بۆ خۆیان لەهەموو هەڵسوکەوتو رەفتارێکیاندا، خوای گەورە دەربارەی گەورەی بانگخوازان و پێشەوایان (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا ﴾ سورة الأحزاب: ٢١.

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقی و پێشەوایەتی چاك بۆ کەسێ بەهیوای خواو (پاداشتی) ڕۆژی دوایی یە، زۆر یادی خوا دەکات.

ئا لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەرکەکانی بانگخوازان زۆر زۆر گەورەیە بە ئەندازەی هەست کردنیان بەرپرسیارێتی؛ ئەوانە پارێزەری چاکەکانن، دەستپاك وئەمینداری ئاکار و رەوشتە جوانەکانن، چاودێرن بەسەر هەڵسوکەوتی خەڵکەوە، بریتین لەو ئاوێنەیەی کە موسوڵمانان خۆیانی تێدا دەبیننەوە، بۆیە دەبێت لەسەریان لەهەموو کردەوەو وتەکانیاندا سەرمەشقی باش بن بۆ کۆمەڵگاکانیان، شوێنەواری پەیامەکەیان لە ژیانیاندا رەنگ بداتەوە، هەنگاوەکانیان رەنگدانەوەی بیروباوەڕیان بێت، چونکە بەردەوامی و دامەزراوی بانگخواز و بەهێزی پەیوەندی بە خوای گەورەوە و ئاکار و رەوشتی جوانی رەنگدانەوەی کەسایەتی ئیسلامی راستەقینەیەتی، دڵەکان بۆلای خۆی رادەکێشێ و ئەوەش دەبێتە هۆکاری بانگەوازکردن بۆلای باوەڕهێنان و پێشەنگ و سەرمەشقی چاك، دایکی باوەڕداران عائیشە رەزای خوای لێ بێ چەند گەورە و چەند جوان وەسفی پێشەواو گەورەی بانگخوازانی (صلى الله عليه وسلم) کردووە لەکاتێکدا کە پرسیاری لێ کرا دەربارەی رەوشتی، وتی: (كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ)[1]. واتە: ئاکار و رەوشتی بریتی بوو لە قورئان.

وەك ئەوەی بەو وەسفەی کە کردی کەسایەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نموونەیەکی هەستیار بێت لەوەی کە قورئانی پیرۆز بانگەوازی بۆ دەکات – واتە قورئانێکی زیندو بو بە هەڵسوکەوت – لە ئاکار و رەوشتە بەرز و جوانەکان و

(١) – رواه مسلم: اللالكائي في: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة).

چاکەکان لە هەڵسوکەوت و رەفتارەکاندا، پێویستە بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام سەرمەشق و پێشەنگی چاك هەبێ، دەبێ وێنەیەی بەرز هەبێ بۆ ئەوەی چاوەکان تەماشای بکەن، دڵەکانیش بەلای خۆیدا رابکێشێت؛ هەتا لەوەوە ئیسلامە راستەقینەکە وەر بگیرێت و خەڵك چاوی لێ بکەن، ئەوەش رویداوە لە بانگخوازەکان لە پێشینە چاکەکانمان لەکاتێکدا کە ئیسلامیان هەڵگرت و گەیاندیان بە جیهان دەچونە هەر شوێنێك بەرەوشتی بەرزیان دەبونە پێشەنگی چاك و خەڵك لەسەردەستی ئەوان موسوڵمان دەبون.

ئەو کەسەی کە سەرمەشق و پێشەنگی چاکە خۆی تەرخان کردووە بۆ هەستان بە کاری گرنگی بانگەواز بۆلای خوای گەورە؛ پێویستە لەسەری خۆڕازاندنەوەی بە ئاکار و رەوشتە بەرز و جوانەکانی ئیسلام لەهەموو کاروبارێ لە کاروبارەکاندا، دەبێ لەهەموو کردەوەو وتەکانیدا زۆر هۆشیار بێت و دەست بگرێت بەو لایەنەوە، چونکە ئەوانەی کە لەدەورو بەرینی هەمیشە بە چاوی رەخنەوە بۆی دەڕوانن و پشکنین بۆ رەفتارەکانی دەکەن، حساب بۆ هەموو هەڵسان و دانیشتنێکی دەکەن، لەبەرئەوەی ئەو بانگخوازە لەبەرچاوی ئەوان سەرچاوەی شوێنکەوتن و کردنە پێشەنگ و سەرمەشقە.

خوای گەورە واجبی کردووە لەسەر ئوممەت کە لەنەوەکانی کۆمەڵێ ئامادە بکات بۆ هەستان بەکاری بانگەوازکردن بۆ لای دینی هەق و راستەقینە، جا پێکهێنان و ئامادەکردن هەروا کارێکی ئاسان نیە، بەڵکو پێویستی بە هێز و توانای چڕو پڕ هەیە، پێویستی بە قوربانیدان و لەخۆبوردەیی بەردەوام هەیە، لەبەرئەوە پێویستی بە خۆ فێرکردن و هەڵبژاردن و وردەکاری هەیە بۆ کەسێ کە هەڵەسێ بە گەیاندنی ئەو کارە گرنگ و پڕپایەخە، بۆیە ئەوەندە بەس نیە کە ئەو کەسە خاوەن زانست بێت، یان وتاربێژ بێت و بەس، هەروەها ئەوەندە بەس نیە کە لەسەخۆ و روخۆش و زمان شیرین و خۆ خۆشەویستکار بێت لەلای خەڵك؛ هەردەبێ ئەم هەموو

سیفەتانەی تێدا کۆبێتەوە، بەڵکو هەموو سیفەتێی پەیامبەرێتی کە یارمەتی دەدات و ئامادەی دەکات بۆ جێبەجێکردنی پەیامەکەی هەستان بە واجب و ئەرکەکانی بە تەواوەتی و بەبێ کەموکورتی.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فێریکردوین کە چۆن بانگەواز بکەین و بیگەیەنین بە خەڵك، لە ژیان و بەسەرهات پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) کۆمەڵە وانەیەك و کۆمەڵە پەندو ئامۆژگاریەکی زۆر هەیە بۆ کەسێ کە بیەوێت؛ پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی کە بانگەواز دەکەن بۆ لای عەقیدەی پێشینە چاکەکان؛ شوێنی بەرنامەو پرۆگرامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەون لە بانگەوازکردندا، بیکەنە سەرمەشقی خۆیان، پێویستە جێگیر بێت لەسەر بنچینەکانی، بێگومان لە بەرنامەو پرۆگرامی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بەیانی شیفابەخش و رونکردنەوەی تەواو دەستدەکەوێت بۆ بەرنامەو شێوازی بانگەوازکردن بۆلای خوای پەروەردگار؛ دەوڵەمەندو بێ پێویستیان دەکات لەهەموو ئەو شتانەی کە خەڵك دایانهێناوە لەو بەرنامە داهێنراوانەی کە پێچەوانەن بۆ بەرنامەو ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

جیهانی ئەمڕۆ بەتەواوی هەر هەموویان چاوەڕێی بانگخوازانێکی دڵسۆز و نیازپاکن، چاوەڕێی زانایانێکی لەخوا ترسن کە شارەزان لە بەرنامەی پێغەمبەران لە کاری بانگەوازکردندا، کە دەڕۆن لەسەر رێوشوێنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، زۆر هەوڵدەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام و رێنماییەکانی، ئامانج و مەبەستی سەرەکیان لەژیانی دونیایاندا بریتیە لەکاری بانگەوازکردن، ئەو کارە بەرز و شکۆمەندە دەکەنە هۆکار و وەسیلەیە خۆیانی لە خوای گەورە پێ نزیك دەکەنەوە، تا زەوی رۆشن بکەنەوە بەو بانگەوازەی کە دەیکەن بۆ دینی هەق و راستەقینەو بانگەوازی یەکخواناسیی پاك و بێ خوش؛ وەك چۆن پێشینە چاکەکانیان رۆشنیان کردەوە، ئەوانەی کە خەڵکیان رزگار کرد لە تاریکیەکانی بێ

باوەڕپیەوە بۆ روناکیەکانی باوەڕهێنان، دونیایان پڕکردبوو لە دادپەروەری و زانست و زانیاری و شارستانیەتی، ئەوان بەو شێوەیە بوون کە خوای گەورە دەفەرموێت: باشترین گەلێك بوون بۆ خەڵك هێنرابێتنەدی؛ خاوەنی بەختەوەری و خۆشبەختی و گەورەیی و رابەرایەتی بوون، بە باوەڕ و دڵسۆزی و ئیخلاص و شوێنکەوتنی هەق؛ پشتی رۆم و فارسیان شکاند کە لەو کاتەدا دوو ئیمپراتۆریەتی گەورەی جیهان بوون و خاوەنی هێز و دەسەلات بوون، عەرشی کیسراکانی فارس و قەیسەرەکانی رۆمیان هێنایە لەرزە بە ئیمان و نیازپاکی و شوێنکەوتنی هەقیان.

بۆیە لێرەوە پێویستە لەسەر بانگخوازی هەق و راست؛ بەو شێوەیە بانگەواز بکات بۆ لای خوای گەورە کە پێشینە چاکەکانمان کردیان، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی جیاوازی کردنی کات و سەردەم و شوێن.

بە دەستپێکردن لەم دەستپێکردن و دەروازە شەرعیەوە و بۆ تێگەیشتنێکی راست و دروست؛ هەوڵمدا باسی هەندێ لە مەرجەکان و رێکخەرەکانتان بۆ بکەم یان ئەو کارانەی کە پێویستە بانگخوازان هەستن بە پەیڕەوکردنی و لەبەرچاوی بگرن؛ بەڵکو هۆکارێکی بە سودبێ لەو چاکسازییەی کە بانگخواز بە هیوایەتی بەدەستی بێنێ و جێبەجێی بکات، هەر لەخوای گەورەوەیە یارمەتیدان و هەروەها داواکردن.

## رێکخەرەکان و هۆکاراکانی بانگخوازان

١ – بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە رێگەیەکە لەرێگەکانی سەرکەوتن و سەرفرازی دونیاو دوارِۆژ؛ هەروەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (فَوَالله لأَنْ يَهْدِيَ اللهُ بِكَ رَجُلاً وَاحِداً خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ)[1]. واتە: سوێند بە (الله) ئەگەر بە هۆی تۆوە خوای گەورە هیدایەتی کەسێك بدات؛ ئەوە لە گەلە وشتری سور چاکترە بۆت.

بە بانگەوازکردن خێر و پاداشت بەدەست دەخەیت، خێر و پاداشت لەسەر ئەوە نەوەستاوە ئەوکەسەی بانگی دەکەیت بۆلای خوای پەروەردگار بێت بەدەم بانگەوازەکەتەوەو وەلامت بداتەوە ئەو بەس بانگەوازی لەسەرە، ئەوکەسەی بانگخوازە داوای ئەوەی لێ نەکراوە سەرکەوتنێ بۆ ئیسلام جێبەجێ بکات ! ئەوە کار و فەرمانی خوای گەورەیەو بەدەستی ئەوە، بەڵکو بانگخوازداوای ئەوەی لێکراوە کە هەوڵ و تەقەلای خۆی بدات لەو رێگەیەدا بەس.

خۆئامادەکردن مەرجە بۆ بانگخواز، سەرکەوتن لەلایەن خواوەیە، بانگەوازکردن وێنەیەکە لە وێنەکانی جیهادو تێکۆشان، لەگەڵ جەنگکردن بەشداری دەکات لە مەبەست و سەرەنجامدا بەلام سەرخستن بەدەست خوای پەروەردگارە.

٢– جەختکردنەوەی لەسەر بەرنامەی سەلەفی ئەم ئوممەتە موبارەکەو قوڵکردنەوەی و زیاتر چەسپاندنی لەناخی خۆتدا و لە بانگەوازکردنەکەتدا زۆر پێویستە کە شارەزای بیت وەك ئەوان بانگەواز بکەیت؛ کە خۆی لە بەرنامەی ئەهلی سوننەو جەماعەدا دەبینێتەوە، کە ناسراوە بە نێوەندگیرێتی و، گشتگیرێتی و، بەدادو نەزۆر و نەکەم و، دورکەوتنەوە لە رۆچون و کەموکوری.

---

(١) – مُتَّفَقٌ عَلَيهِ، أخرجه البخاري: ٥/١٧١ ( ٤٢١٠ )، ومسلم: ٧/١٢١ ( ٢٤٠٦ ) ( ٣٤ ).

دەستپێکردن لەم دەروازە زانستە شەرعیەوە؛ کە پابەندە بە قورئان و سوننەتی راست و دروستەوە: بە فەزڵی خوای گەورە پارێزراوە لەوەی بانخوازەکە تیابچێت، بریتیە لە رۆشناییەك بۆ ئەوکەسەی کە بە خۆگریەوە سوورە لەسەر رۆیشتن لەسەر رێگەی پێغەمبەران و نێرداراوان سەلامی خوای گەورەیان لەسەر بێت.

٣ – سووربوون لەسەر دۆزینەوەی کۆمەڵی موسوڵمانان، سووربوون لەسەر یەك وتەییان لەسەر هەق، وەك دەستگرتن بە وتەی ئەم کەسەوە کە دەڵێ: (كَلِمةُ التَّوحيدِ أساسُ توحيد الكلمة). واتە: وتەی (لا اله الا الله) یەکخواناسی بناغەو بنچینەی یەك وتەییە، لەگەڵ دورکەوتنەوە لەهەر شتێ کە ببێتەهۆی پارچە پارچەی کۆمەڵی ئیسلامی ئەمرۆ لە تاقم تاقمێنەی سەرزەنشتکراو کە یەك وتەیی موسوڵمانانی پارچە پارچەکردووە، دڵەکانی لەیەکتر دورخستۆتەوە، ریزەکانیانی لەت و پەت کردووە، هێزیانی لاواز کردووە.

تێگەیشتنی راست و دروستی بۆ هەر کۆڕ و کۆبونەوەیەك بانگەوازکردن بۆلای خوای گەورە بریتیە لە: (کۆمەڵێك لە موسوڵمانان، نەك کۆمەڵی موسوڵمانان).

٤ – پێویستە دۆستایەتی کردن بۆ دین بێت، نەك بۆ کەسەکان، هەرچەندە پایەبەرز بن، چونکە هەق هەردەمێنێت، بەڵام کەسەکان نامێنن و دەرۆن، هەق بناسە ئەوکاتە خەڵکەکانیشی دەناسیت.

٥ – بانگەوازکردن بۆ هاوکاری کردنی یەکتر و هەرشتێ پەیوەندی بەو بابەتەوە بێت، دورکەوتنەوە لە شوێنەکانی جیاوازی و ناکۆکی و هەرشتێ کە دەبێتەهۆی جیاوازی؛ بەوەی شەرع رێگەی دابێت. پێویستە یارمەتی یەکتر بدەین و یەکتر سەربخەین، لەوەدا کە رامان لەسەری جیاوازە ئامۆژگاری خێری یەکتر بکەین،

بەمەرجێ ئەو شتە خیلاف و جیاوازی هەڵبگرێت و ئەوەندەی کە بوار هەبێت تێیدا، لەگەڵ لەڕەگ و ریشەوە هەڵکێشانی رقەبەریاتی و دورکەوتنەوە لێی.

ئەسڵ لەنیوان کۆمەڵە ئیسلامیەکاندا میانڕەوەکاندا: بریتیە لە مامەڵەکردن و یەکگرتن؛ ئەگەر ئەوە نەگونجا؛ یارمەتیدان و هاوکاریکردن هەبێت، ئەگەر ئەوەش نەگونجا پێویستە پێکەوە ژیان هەبێت، ئەگەرنا چوارەمیان تیاچوونە.

٦ – دورکەوتنەوە لە دەمارگیری بۆ هەر کۆڕ و کۆمەڵێك کە تاکی موسوڵمان هەواداریەتی و خۆی دەداتە پاڵی و ئینتیمای بۆی هەیە، پێشوازیکردن و خۆشحاڵ بوون بە هەر هەوڵ و کۆشش و کارێکی چاك کە خەڵکانی تر ئەنجامی ئەدەن، مادەم لەگەڵ شەرعدا بگونجێت و شەرع پەسەندی بکات، دورکەوتنەوە لە رۆچون و لاگری.

٧ – جیاوازی لە لقەکانی شەریعەتی لێبوردەیی؛ پێویستی دەکات ئامۆژگاری کردنی یەکتر و گفتوگۆکرن و سنگ فراوانی، نەك دەمەقاڵەو قسەوتن بەیەکتر و کوشتنی یەکتر.

٨ –رەخنە لەخۆگرتن، بەخۆداچونەوەی هەمیشەیی، راستکردنەوەی بەردەوام.

٩– فێربونی ئەدەبی خیلاف و جیاوازی، چەسپاندنی بنچینەکانی گفتوگۆکردن و قوڵکردنەوەی، داننان بە گرنگیێتی ئەو دوانەدا، پێویست و زەرورەتی بەدەستخستنی ئامرازەکانی ئەو دوانە ئەدەبی خیلاف و بنەڕەتی گفتوگۆکردن.

١٠– دوربوون لە گشتاندن لە حوکم و بڕیارداندا، هۆشیاریدان لە بەلاو نەهامەتی و کۆسپەکانی، لەکاتی حوکمدان بەسەر کەسەکاندا پێویستە دادپەروەر بێت نەك بە هەواو هەوەسی خۆی، لە ئینصاف و ویژدانەوەیە حوکم و بڕیار بە پێی مانا نەك بەپێی پێکهاتە – واتە کەسەکە زەربی سفر نەکەی – .

١١ – جیاوازیکردن لە نێوان مەبەست و هۆکاردا! بۆ نموونە: بانگەوازکردن بۆلای خوای گەورە مەبەست و ئامانج و داواکراوێکی شەرعییە، بەڵام هەر بزوتنەوە و کۆڕو کۆمەڵ و گردبوونەوە و بەڕێوەبەرایەتیەك و جگە لەمانەش بریتین لەهۆکارە رەواو شەرعیەکان.

١٢ – جێگیربوون لەسەر مەبەستەکان و ئامانجەکان، نەرمی لە گرتنەبەری هۆکارەکان؛ بە پێی ئەوەی کە شەرع رێگەی دەدات.

١٣ – لەبەرچاوگرتنی کاروبارە سەرەکیەکان و، رێکخستنی کاروبارەکان بە پێی گرنگیان، ئەگەر هات و نەدەکرا بابەتێکی لاوەکی یان بەشێکی بچکۆلە پەیرەوبکرێت، ئەوە پێویستە لەشوێن و کات و بارودۆخی گونجاوی خۆیدا پەیرەوبکرێت.

١٤ – بنیاتنان لەسەر ئەزموونەکانی ئەو کەسانەی کە هاتون و رۆشتون، ئاڵوگۆڕکردنی ئەزموونەکان لەنێوان بانگخوازاندا؛ کارێکی زۆر گرنگە؛ بانگخواز لە هیچەوە دەست پێ ناکات، ئەو یەکەم کەس نیە بەرەنگاربوبێتەوەو بێتە پێشەوە بۆ خزمەتکردنی ئەم دینە، کۆتا کەسیش نیە؛ لەبەرئەوە نەبووەو ناشبێ کەسێ کە لەسەروی ئامۆژگاری و رێنماییەوە بێت، یان کەسێ هەموو راستیەك لەلای خۆی قۆرخ بکات، یان بە پێچەوانەوە.

١٥ – رێزگرتنی زانایانی ئوممەت ئەو زانایانەی کە دانپیانراوبون و ناسراوبون بە شوێنکەوتنیان و چاکی بیروباوەڕیان، ئەو زانایانەی کە دەستیان گرتوە بە سوننەتەوەو رێوشوێنی پێشینە چاکەکانیان گرتوە، پێویستە موسوڵمانان زانست لە زانایانی ئەهلی سەننەو جەماعە وەربگرن، شوێن پێیان هەڵگرن، رێزیان بگرن، زمان درێژی نەکەن بەرامبەریان، پێویستە دەست هەڵگرن لە باسکردنی شەرەف و ناموسیان، نابێ گومان لە نیەتیاندا بکرێت، نابێ تۆمەت بدرێتە پاڵیان، بەڵام نابێ دەمارگیریی بۆیان؛ لەبەرئەوەی هەموو زانایەك راستی دەپێکێ و هەڵەش دەکات،

هەڵەکە دەگەڕێنرێتەوە بۆ خاوەنەکەی لەگەڵ مانەوەی فەزڵ و ڕێزی، مادەم تێکۆشکار(مجتهد) بێت.

١٦- گومانی باش بردن بە موسوڵمانان، قسەکانیان بە شێوەیەکی باش لێکبداتەوە، نەنگی و هەڵخلیسکانەکانیان داپۆشێت، لەگەڵ بێ ئاگانەبوون لە ڕونکردنەوەی ئەو نەنگی و هەڵخلیسکانە بۆ خاوەنەکەی بەو ڕێکخەر و مەرجانەی کە شەرع دایناوە.

١٧ – ئەگەر کەسێ چاکەکانی زۆرتر بوو با باسی خراپەکانی نەکرێت مەگەر لەبەر بەرژەوەندیەکی دانپێدانراو بێت؛ بەڵام ئەگەر خراپەکانی زۆرتر بوو باسی چاکەکانی ناکرێت؛ لەترسی ئەوەی نەوەکا خەڵکی نەزان شوێنی بکەون.

١٨ – پێویستە دەربڕین(لفظ)ە شەرعیەکان بەکاربهێنین؛ لەبەر وردی و ڕێکیان، دورکەوتنەوە لە دەربڕین(لفظ)ە نامۆو بێگانەو خوارخێچەکان، بۆ نموونە: وشەی ڕاوێژ(الشُّورى) بەکاربهێنین، نەك دیموکراتی(الدِّيمقراطيّة).

١٩- هەڵوێستی ڕاستەقینە بەرامبەر بە مەزهەبە فیقهیە دانپێدانراوانەی کەهەن؛ بریتیە لە سامانێکی فیقهی گەورەی گرنگ و بەسود کە لەلایەن هەزاران زانا لێکۆڵینەوەی لەسەرکراوەو، پێویستە لەسەرمان لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین و شیکاری بکەین، سود وەگرین لە چاکی لێ وەرگرتنەکانی؛ دەمارگیریمان نەبێ بۆی، ڕەتی نەکەینەوە بەگشتی، دورکەوینەوە لە ڕاوبۆچونە لاواز و (شاذ)ەکانی، پێویستە ئەوەی هەقە لێ وەربگرین لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، تێگەیشتنی پێشینی ئوممەت.

٢٠ – دیاریکردنی هەڵوێستێکی ڕاست و دروست سەبارەت بە ڕۆژئاوای کافر و ئەو شارستانیەتیەی کە هەیەتی! بە شێوەیە سود وەربگرین لە زانستە ئەزموونیەکانی، بە پێی ڕێکخەر و یاساو ڕێسای دینە گەورەو شکۆمەندەکەمان و قاعیدە حەکیم و کاریەجێکانی.

٢١ – دانانان بە گرنگی راوێژ(الشُّوری)دا لەکاری بانگەواز بۆلای خوای گەورەدا، هەروەها دانانان بە زەرورەتی فێربون و شارەزابوونی بانگخواز لە فیقهی راوێژکردن.

٢٢– شوێنکەوتنی رێگەی پەروەردگار بەلێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین، ئەم ئایەتەی خوای گەورە بکرێتە تەرازوی بانگەواز، بکرێتە حیکمەت و کاربەجێی و لەسەر رۆشتنی: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴾ سورة النحل: ١٢٥.

واتە: (خەڵك) بانگ بکە بۆ رێبازی پەروەردگارت بەلێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین و لەگەڵیان بدوێ (موجادەلە بکە) بەچاکترین شێوە.

٢٣ – پێویستە بانگخواز پێشەنگی و سەرمەشقی چاك بێ؛ لەبەرئەوەی بانگخواز ئاوێنەی بانگەوازەکەیەتی، نموونەی وتەبێژی بانگەوازەکەیەتی.

٢٤ – خۆرازاندنەوە بە ئارام گرتنێکی چاك و پەسەند، فێربوونی ئاداب و ئەحکامەکانی ئارام گرتن، لەبەرئەوەی لە سیفەتی پێغەمبەران و نێردراوانە سەلامی خوایان لەسەر بێ، شوێنی خولگەی سەرکەوتنی بانگەوازەکەیانە.

٢٥ – دورکەوتنەوە لە توندڕەوی و رۆچونی پێوانە نەکراو واتە لە قورئان و سوننەتدا جێی نابێتەوە، هۆشیاریدان لە کۆسپ و بەڵاکانی، لە بەرهەم و سەرەنجامە خراپەکانی، کارکردن بە ئاسانکاری و لەسەرخۆیی لە سنورێکدا کە شەرع رێی پێ داوە.

٢٦ – موسوڵمان فێرخوازی هەقە، ئازایەتی و مەردایەتیش لە هەقدا داواکراوێکی پێویست و زەروریە لە بانگەوازکردن بۆلای خوای گەورەدا، جا ئەگەر توانای وتنی هەقت نەبوو، خۆ دەتوانی قسەی ناهەق و پرچ و بەتاڵ نەکەی.

٢٧ – هۆشیاریدان لە خاوبونەوەو ساردبونەوە لە بانگەواز، لە بەرهەم و سەرەنجامە خراپەکانی لەژیانی بانگخوازدا، بێ ئاگانەبوون لە لێکۆڵینەوە لە هۆکارەکانی و ڕێگە چارەکانی.

٢٨– ئاگاداربوون لە پڕوپاگەندەی درۆو هات و هوت، لە برەوپێدانی، لەو شوێنەوارە خراپانەی کە دروست دەبێ لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامی دا، بێ ئاگانەبوون لە شوێنکەوتنی سەرچاوەکانی ئەو پڕوپاگەندە درۆیە، هەروەها بێ ئاگانەبون لە ڕێگەچارەکەی، فێڵ و تەڵەکەکانی ڕەت بکرێنەوە.

٢٩ – پێوەری چاکبون بریتیە لە تەقوا، چاکی بیروباوەڕ، کردەوەی چاك، دورەپەرێزی و خۆلادان لە هەموو دەمارگیریەکی نەفامیانە؛ لە دەمارگیری بۆ هەرێم، یان بۆ تیرە و هۆز، یان بۆ کۆمەڵ و تایفەگەری، یا بۆ دەستەو تاقم.

٣٠ – ئەسڵ لە بانگەواز بۆلای خوای گەورەدا بریتیە لە بانگەوازکردن بە ئاشکرا، بەڵام بانگەوازکردن بە نهێنی ئەندازەی خۆی وەردەگرێت؛ بەگوێرەی کات و سەردەم و شوێن و بارودۆخ.

٣١ – بەرنامەی زۆرباش لە بانگەوازکردندا: بریتیە لە پێشکەشکردنی هەقیقەتەکانی ئیسلام و بەرنامەکەی لە سەرەتاوە – نەك بانگخواز شوبهەکان بێنێ و ڕەدی بداتەوە – لەپاشدا پێویستە پێوەری هەق بە خەڵك بدرێ بۆئەوەی هەق و ناهەق لێك جیابکاتەوە، بریتیە لە خەڵك بانگ کردن بۆلای بنچینەو بنەماکانی دین، پێویستە بانگخواز خەڵك فێری یەکخواناسی پوخت بکات، بە پێی عەقڵ و ژیرییان بیاندوێنێ و قسەیان لەگەڵ بکات، بیناسێنێ بە ناخ و دڵ و دەرونیان، ئەمەش هۆکارێکی زۆر گرنگە بۆ هیدایەتدانیان بۆ هەق، بە ئیزنی خوای گەورەو پەروەردگار.

٣٢ – دەستگرتنی بانگخوازە ڕاستگۆکان و، ئەو کۆمەڵە ئیسلامیە دڵسۆز و نیازپاکانە؛ بە بەردەوامی دەستگرتن بە دینی خوای گەورەوە لە شتێکدا،

پێشکەشکردنی توانایی بەشەری، داواکردنی یارمەتیدان لەلایەن خوای گەورەوە، دڵنیاییەکی تەواو و باوەڕهێنانی راستگۆیانە بەوەی کە خوای گەورەو پەروەردگار خۆی سەرەوکاری رێی بانگەواز دەکات، کارەکانی ئاراستە دەکات، بانگخوازەکان و ئەوانەی پێی هەڵەسن جێگیر دەکات لەسەری، بەڕاستی دین و کاروبارەکان هەر هەمووی هەر بەدەستی خوای گەورەیە.

**ئەی برای موسوڵمانی خۆشەویست بزانە:** ئەم رێکخەرو سودانەی کە دەستمان کەوت؛ بریتیە لە بەرهەم و ئەزموونی زۆرێك لە زانا کارکەرەکان و بانگخوازە دڵسۆز و نیازپاکەکان بۆلای خوای گەورە، بەدڵنیاییەوە چاك بزانە ئەو بانگخوازانەی کە بانگەواز دەکەن بۆ لای خوای گەورە؛ ئەگەر بەچاکی لەم قاعدە و یاساو رێساو رێکخەرانە تێبگەن، کاریشی پێ بکەن، ئەوە بەدڵنیاییەوە لەوەدا خێرو چاکەی زۆری تێدایە بۆ رێگەو رێڕەوی بانگەواز.

با بانگخوازە راستگۆکانی دینی ئیسلام چاك بزانن؛ بەڕاستی چاکی بۆ ئەوان نیە، سەرکەوتن بۆ بانگەوازەکەیان نیە، سەرکەوتن و پشتگیری کردنی خوای گەورە لە کارەکەیاندا نیە، هەروەها ئەو هەنگاوەنەی کە دەنرێت هیچ پتەویەکی تێدا نیە ئیللا بە دەستگرتن بە دینی خوای گەورەوە نەبێت، بە پشتبەستن بە خوای گەورەو داواکردنی کۆمەك و یارمەتی لەو نەبێت لەهەموو کاروبارێکدا ئیتر بچوك بێت یان گەورە، داواکردنی سەرکەوتن و پشتگیری کردن و پتەکردنی هەنگاوەکان و نیازپاکی بۆ خوای گەورە لەهەموو کاروبارێکدا دبێ تەنها لە خوای پەروەردگار بکرێت، خۆ دارنین لە شوێنکەوتنی هەواو هەوەس و ئارەزوو بە هەموو جۆر و شکڵ شێوەکانیەوە، هەموو کارەکان تەنها بۆ خوای گەورە بێت.

## پەرتووکە دانراوەکان دەربارەی بیروباوەڕی سەلەفی صالح ئەهلی سوننەو جەماعە

بەڕاستی پێشەوایان و زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعە پەرتووکی زۆریان داناوە دەربارەی بیروباوەڕی سەلەفی صالح، گرنگی زۆریان داوە بە بنەماکانی ئەو زانستە، بەلگەشیان هێناوەتەوە لە قورئان و سوننەت و وتەکانی پێشەوایانی هاوەلان و شوێنکەوتوانیان و ئەوانەی شوێن ئەوان کەوتن لە چاکەدا، ڕەدی ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزوویان داوەتەوە، عەیبەو نەنگیەکانیان دەرخستوون، وتە پوچ و ساختەکانیان ئاشکرا کردووە، بیربۆچونەکانیان وەك تۆزی بەر با لێکردووە، بە حەق رووبەڕوی ناهەق و باتلّ بونەتەوە، بە زانست رووبەڕوی نەزانی بونەتەوە،، بە سوننەت رووبەڕوی بیدعە بونەتەوە، ئەهلی بیدعەو هەواو ئارەزوویان لە چەکەکانیان داماڵیون، هەقیان دەرخستوەو سەرخستوە، باتلّ و ناهەقیەکانیان پوچەلّ کردۆتەوە، هەموو ئەم شتانەشیان تەنها لە پێناوی پاراستنی دینی پاك و ساغ کردووە.

شتێکی بەجێ و بە کەلکە لێرەدا باسی هەندێ لەو دانراوانە بکەم کە بوونەتە سەرچاوە لە دانانی ئەم پەرتووکەدا (الوجین)، تا تۆی — برای موسوڵمانی بەڕێز و خۆشەویست — لەسەر بەلگەو، بەرچاوڕوونی و، زانست و زانیاری بیت لە بیروباوەڕەکەتدا، تا بزانی بیروباوەڕەکەت لەکوێوە وەرگرتوە و سەرچاوەکانی کامانەن.

هەروەها تا بزانی کە بەڕاستی ئەم بیروباوەڕە (عەقیدەی سەلەفی صالح) بنچینەیە لە دینی هەقدا، ئەو تەحریفات و گۆرانگاریانەی کە هاتونەتە ناویەوە لە چاخ و سەدە دواییەکاندا وەك سەردەمی ئێمەو سەردەمانێك کە لەپێش ئێمەوە بوون؛ ئەوە نامۆیە بەو بیروباوەڕە راستەی کە پێشینە چاکەکانمان وەریان گرتوە

– هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان و ئەوانەی شوێن ئەوانیش کەوتون بە راستگۆیانەو بە نیازپاکی و چاکە – لە خاوەنی ئەم شەریعەتە خاوێن و بەرز و شکۆمەندە، پێغەمبەری ئەم دینە گەورە (صلی الله علیه وسلم).

بەڕاستی کۆمەڵێکی زۆر لە پێشەوایانی ئەم ئوممەتە و زانایان لەدانراوەکانیاندا دانیان ناوە بە (بیروباوەڕی سەلەفی صاڵح)دا؛ لەوانە بۆ وێنە بە کورتی بە بێ ئەوەی کە درێژەی پێ بدرێت:

١- كتاب السنة: الإمام أحمد بن حنبل رحمه الله – ٢٤١هجري.
٢- كتاب السنة: عبد الله ابن الإمام أحمد – ٢٩٠هجري.
٣- كتاب السنة: أبو بكر بن يزيد الخلال – ٣١١هجري.
٤- كتاب السنة: الحافظ أبو بكر بن أبي عاصم – ٢٨٧هجري.
٥- كتاب السنة: محمد بن نصر المروزي – ٢٩٤هجري.
٦- شرح السنة: الإمام إسماعيل بن يحي المروزي – ٢٩٤هجري.
٧- شرح السنة: الإمام حسن بن علي البربهاري – ٣٢٩هجري.
٨- شرح السنة: الإمام الحسين بن مسعود البغوي – ٤٣٦هجري.
٩- الشريعة: الإمام أبو بكر محمد بن الحسين الآجري – ٣٦٠.
١٠- أصل السنة واعتقاد الدين: الإمام حسن بن علي البربهاري – ٣٢٩هجري.
١١- صريح السنة: الإمام أبو جعفر محمد بن جرير الطبري – ٣١٠هجري.
١٢- شرح مذاهب أهل السنة ومعرفة شرائع: أبو حفص بن شاهين – ٢٧٩هجري.
١٣- شرح السنة: الإمام أبي عيسى السُلمي – ٢٧٩ هجري.
١٤- أصول السنة: الإمام ابن أبي زمنين الأندلسي – ٣٩٩ هجري.
١٥- الإعتقاد الإمام الشافعي. رواية أبي طالب العُشاري – ٢٠٤ هجري.
١٦- كتاب النزول الإمام الحافظ علي بن عمر الدارقطني – ٣٨٥هجري.
١٧- كتاب الصفات الإمام الحافظ علي بن عمر الدارقطني – ٣٨٥هجري.
١٨- كتاب الرؤية الإمام الحافظ علي بن عمر الدارقطني – ٣٨٥هجري.
١٩- كتاب التوحيد وإثبات صفات الرب: الإمام ابن خزيمة – ٣١١هجري.

٢٠- مقدمة ابن أبي زيد القيرواني في العقيدة: عبد الله القيرواني – ٣٨٦هجري.

٢١- الإبانة عن شريعة الفرقة الناجية: ابن بطة العكبري الحنبلي – ٣٨٧هجري.

٢٢- اعتقاد أئمة الحديث: الإمام أبو بكر الإسماعيلي – ٣٧١هجري.

٢٣- الإبانة عن أصول الديانة للإمام أبي الحسن الأشعري – ٣٢٠هجري.

٢٤- رسالة إلى أهل الثغر للإمام أبي الحسن الأشعري – ٣٢٠هجري.

٢٥- مقالات الإسلاميين: للإمام أبي الحسن الأشعري – ٣٢٠هجري.

٢٦- عقيدة السلف أصحاب الحديث: الإمام إسماعيل الصابوني – ٤٤٩هجري.

٢٧- المختار في أصول السنة: الإمام الحسن بن أحمد الحنبلي البغدادي – ٤٧١هجري.

٢٨- شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة : الإمام اللالكائي – ٤١٨هجري.

٢٩- كتاب الأربعين في دلائل التوحيد : أبو إسماعيل الهروي – ٤٨١هجري.

٣٠- كتاب العظمة : أبو الشيخ الأصفهاني – ٣٦٩هجري.

٣١- الاعتقاد والهداية: أبو بكر أحمد بن الحسين البيهقي – ٤٥٨هجري.

٣٢- العقيدة الطحاوية: الإمام أبو جعفر الطحاوي الأزدي الحنفي – ٣٢١هجري.

٣٣- الحجة في بيان المحجة: إسماعيل بن محمد التميمي الأصفهاني – ٥٣٥هجري.

٣٤- اعتقاد أهل السنة والجماعة: حجة الإسلام الآموري الهكاري – ٥٥٥ هجري.

٣٥- لمعة الاعتقاد الهادي إلى سبيل الرشاد: ابن قدامة المقدسي – ٦٢٠هجري.

٣٦- النصيحة في صفات الرب: الإمام عبد الله بن يوسف الجويني – ٤٣٨هجري.

٣٧- كتاب التوحيد: الإمام محمد بن إسماعيل البخاري – ٢٥٦هجري.

٣٨- كتاب التوحيد ومعرفة أسماء الله وصفاته: الإمام بن منده– ٣٩٥هجري.

٣٩- كتاب الإيمان: الإمام أبو عبيد القاسم بن سلام – ٢٢٤هجري.

٤٠- كتاب الإيمان: الحافظ محمد بن يحيى بن عمر العدني – ٢٤٣هجري.

٤١- كتاب الإيمان: الحافظ أبو بكر بن محمد بن أبي شيبة – ٢٣٥هجري.

٤٢- كتاب الإيمان: الحافظ محمد بن إسحاق بن منده– ٣٩٥هجري.

٤٣- شعب الإيمان: الحافظ أبو عبد الله الحليمي البخاري– ٤٠٣هجري.

٤٤- مسائل الإيمان: القاضي أبو يعلى – ٤٥٨هجري.

٤٥- الرد على الجهمية: الإمام الحافظ ابن منده – ٣٥٩هجري.

٤٦- الرد على الجهمية: الإمام عثمان بن سعيد الدارمي – ٢٨٠هجري.

٤٧- الرد على الجهمية والزنادقة: الإمام أحمد بن حنبل – ٢٤١هجري.

٤٨- الرد على من أنكر الحرف والصوت: الإمام الحافظ أبو نصر السجزي – ٤٤٤هجري.

٤٩- الاختلاف في اللفظ والرد على الجهمية: ابن قتيبة الدينوري – ٢٧٦هجري.

٥٠- خلق أفعال العباد والرد على الجهمية: الإمام البخاري – ٢٥٦هجري.

٥١- العلو للعلي العظيم وإيضاح صحيح الأخبار من سقيمها: للإمام الذهبي.

٥٢- الأربعين في صفات رب العالمين: للإمام الذهبي – ٧٤٨هجري.

٥٣- كتاب العرش وما روي فيه: الحافظ بن عثمان بن أبي شيبة العبسي – ٢٩٧هجري.

٥٤- أقاويل الثقات في تأويل الأسماء والصفات: للإمام زين الدين المقدسي – ١٠٣٣هجري.

٥٥- إثبات صفة العلو: ابن قدامة المقدسي – ٦٢٠هجري.

٥٦- البعث والنشور: الإمام الحافظ البيهقي – ٤٥٨هجري.

٥٧- إثبات عذاب القبر: الإمام الحافظ البيهقي – ٤٥٨هجري.

٥٨- التصديق بالنظر إلى الله تعالى في الآخرة: الإمام أبو بكر الآجري – ٣٦٠هجري.

٥٩- الاعتقاد الخالص من الشك والانتقاد: الإمام علاء الدين ابن العطار – ٧٢٤هجري.

٦٠- العيون والأثر في عقائد أهل الأثر الإمام عبد الباقي المواهلي الحنبلي – ١٠٧١هجري.

٦١- قطف الثمر في بيان عقيدة أهل الأثر محمد صديق خان القنوجي – ١٣٠٧هجري.

٦٢- الدين الخالص: محمد صديق خان القنوجي – ١٣٠٧هجري.

٦٣- لوامع الأنوار البهية وسواطع الأسرار الأثرية.

٦٤- لوامح الأنوار السنية شرح قصيدة أبي داود الحائية العلامة السفاريني – ١١٨٨هجري.

٦٥- تجريد التوحيد المفيد الإمام أحمد بن علي المقريزي – ٨٤٥هجري.

* وفارس التأليف في علم الاعتقاد الذي لا يختلف فيه اثنان من أهل السنة شيخ الإسلام ابن تيمية ٧٢٨هـ، فإنه رتب هذا العلم وقعد أصوله ومناهجه، ومؤلفاته كثيرة في هذا الباب منها:

٦٦- منهاج السنة النبوية.

٦٧- درء تعارض العقل والنقل.

٦٨- بغية المرتاد في الرد على المتفلسفة وأهل الإلحاد.

٦٩- اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم.

٧٠- الصارم المسلول على شاتم الرسول.

٧١- كتاب الإيمان.

٧٢- الرسالة التدمرية.

٧٣- قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة.

٧٤- الرد على المنطقيين.

٧٥- العقيدة الواسطية.

٧٦- العقيدة الحموية.

٧٧- الرسالة التسعينية.

٧٨- بيان تلبيس الجهمية.

٧٩- النبوات.

٨٠- شرح العقيدة الأصفهانية.

٨١- شرح حديث النزول.

* إضافة إلى هذا (مجموع الفتاوى) الذي جمع فيه كثير من مؤلفاته، وبلغ المجموع سبعة وثلاثين مجلدا مع الفهارس.

** والفارس الثاني في التأليف تلميذه: العالم الرباني ابن قيم الجوزية – ٧٥٢هـ – صاحب الجهود المشكورة في الرد على الفرق الضالة، منها:

٨٢- الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة.

٨٣- اجتماع الجيوش الإسلامية على غزو المعطلة والجهمية.

٨٤- القصيدة النونية.

٨٥- شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر و الحكمة والتعليل.

٨٦- طريق الهجرتين وباب السعادتين.

ئەمانەو جگە لە مانەش لە پەرتووکە بە نرخەکانی تری.

سوپاس بۆ خوای گەورە هەموو ئەوەی کە باسکرا لەو سەرچاوانەو لەو دانراوانەو لەو پەرتووکانەی کە سودیان لێ وەرگیراوە لە دانانی ئەم پەرتووکەدا؛ یەك لەدوای یەك چاپکراون، چەندەها پەرتووکی گرنگی تریش کە ناومان نەهێناون؛ کە هەیانە چاپکراون، هەشیانە هەتا ئێستاش هەر لە جیهانی دەستنوس (مخطوطات) دان.

## میسکی دوا وتـە

ئەمە بریتیە لە بیروباوەڕی ئەوەی یەکەم لەم ئوممەتە موبارەکە، کە بریتیە لە بیرباوەڕی پێغەمبەرایەتی پاك و پوخت و بێ خەوش و دڵنیایی و پارێزراوە، بریتیە لە ڕێگەیەکی ڕاست و دروست، لەسەر بەرنامەو پرۆگرامی قورئان و سوننەت، وتەکانی سەلەفی ئوممەت و کەڵە پێشەوایانی ئەوانەی کە خاوەنی زانست و زانیاری بوون، ئەویش بریتیە لەو ڕێگەیەی کە دڵی کەسە پێشینەکانی زیندوکردۆتەوە لەم ئوممەتە مەرحومە کە خوای پەروەردگار بەزەیی پێدا هاتۆتەوە؛ پێشینانی ئێمە بە هۆی ئەم بیروباوەڕە ڕاستەوە بوون بە ڕابەر و سەرگەورە و پێشەوا و سەرمەشق بۆ کەسانی تر.

عەقیدەی سەلەفی صالح، کۆمەڵی ڕزگار بوو، گرۆ و تیرەو تایفەی سەرخراو، ئەهلی فەرمودە واتە فەرمودەناسان، ئەهلی (أثر)، ئەهلی سوننەو جەماعە.

بریتیە لە بیرباوەڕی چوار پێشەوا بەرزەکە، کە خاوەنی مەزهەبن باوەڕپێکراون لەلایەن زانایانەوە و خەڵکێکی زۆر لە موسوڵمانان پەیڕەوەی لە مەزهەبەکانیان دەکەن و شوێنیان کەوتون کە ئەمانەن: ئەبو حەنیفە، شافیعی، مالیك، ئەحمەد ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، بیرباوەڕی سەرجەم شەرعزان و فەقیهەکان و فەرمودەناسان و زانا خواناسە کارکەرە خۆپارێزە لەخوا ترسەکانە، ئەوانەی کە لەسەر بەرنامەو ڕێوشوێنی ئەوان ڕۆیشتون هەتا ئەم ڕۆژگارەی ئێمە، کارەکەش ماوەتەوەو بەردەوامە هەتا ڕۆژی دوایی.

برای موسوڵمانی بەڕێز و شکۆمەند ئەگەر ئێمە دەمانەوێ ڕزگارمان ببێت و سەرفرازی و سەرکەوتنمان بە نسیب ببێت ئەوا پێویستە لەسەرمان؛ عەقیدە بگێڕینەوە بۆ سەرچاوە ڕوون و پاك و خاوێنەکەی کە پێشەوا چاك و هەڵبژێردراوەکان لەوەوە هەڵیان گۆزیوە لە پێشینە چاکەکانمان، پێویستە

بیروباوەڕی خۆمان لەو سەرچاوە وەربگرین کە ئەوان بیروباوەڕی خۆیانیان لێ وەرگرت، ئەوان وازیان لەچی هێنا ئێمەش وازی لێ بهێنین، ئەوان لەچی بێدەنگ بوون ئێمەش با بێدەنگ بین لێی، ئەوەی ئەوان توانیان پێی رازی بن ئێمەش دەتوانین پێی رازی بین، ئەوان بەچی شێوەیە پەرستشیان ئەنجامدا ئێمەش بەو شێوەیە ئەنجامی بدەین، پێویستە پابەند بین بە قورئان و سەنەتی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، پێویستە پابەند بین بە یەکدەنگی پێشینی ئوممەت و پێشەوا گەورەکانی ، بەو قیاسە راست و دروستانەی دەربارەی ئەو کارانەی کە تازە دێنە کایەوەو پەیدا دەبن،، هەروەها لەبەر رۆشنایی ئەو بنچینەو بنەمایانەی کە ئەوان دایان ناوە.

پێشەوای باوەڕداران عومەری کوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (بەڕاستی من زانیومە لە چی کاتێکدا خەڵك چاك دەبن یان لە چی کاتێکیشدا خراپ دەبن، ئەگەر فیقە لەلایەن کەسی بچوکەوە هات واتە لەلایەن بیدعەچیەکانەوە هات؛ گەورەکان گرنگیان پێ نەدرا ئەوکاتە خراپ دەبن، ئەگەر فیقە لەلای زانا گەورەکانەوە هات، بچوکەکان شوێنیان کەوتن و پەیڕەویان لێ کردن؛ ئەوە هیدایەت وەردەگرن ئەوکاتە چاك دەبن)[1].

پێشەوای باوەڕداران عەلی کوڕی (أبي طالب) رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (سەیر بکەن و بزانن ئەم زانستە لەکێ وەردەگرن؛ چونکە ئەمە دینە)[2].

هاوەڵی پایەبەرز (عبد الله)ی کوڕی مەسعود رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (بەردەوام خەڵك لەسەر خێر و چاکەن تا ئەوکاتەی کە زانست لە گەورەکان وەربگرن؛ بەڵام ئەگەر لە بچوکەکان و خراپەکانی خۆیانیان وەرگرت ئەوا لەناودەچن)[1].

---

(١) – رواه ابن عبد البر في: جامع بيان العلم وفضله للإمام ص ٢٤٧.

(٢) – رواه الخطيب في: الكفاية في علم الرواية ص ١٩٦.

بزانە برای موسوڵمانی خۆشەویست ؛ خوای گەورە ئێمەش و تۆش هیدایەت بدات بۆ هەق:

هەرکەسێ داوای ڕێنمایی و هیدایەت بکات لە غەیری قورئان و سوننە و تێگەیشتنی سەلەفی صالح بۆ قورئان و سوننەت، یان کارێکی زیادەی هێنا لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە بە شەرعی داناوە، ئەوە بێ گومان نقوم بووە، لە گومڕایی ئاشکرادا، دورکەوتۆتەوە لە ڕێگای ڕاست، شوێن ڕێگەیە کەوتووە کە ڕێگەی باوەڕداران نیە.

هەروەها بزانە ئێمە هەر هەموومان دڵنیاین کە دەمرین لەپێش ئەوەدا کە سەرجەم سوننەتەکان جێبەجێ بکەین بە جوانترین شێوە ئەگەر بمانەوێت جێبەجێیان بکەین پێ ڕاناگەین و تەمەنمان بەشی ئەوە ناکات؛ دەی ئیتر بیدعە لە دیندا بۆچی بکەین؟

ڕەحمەتی خوا لە پێشەوا مالیك بێ کە زۆر جار ئەم وتە جوانەی دەوتەوە:

وخَيْرُ أمور الدينِ مَا كَانَ سُنة ... وشَرّ الأمور المُحْدَثاتُ البَدائعُ(٢).

واتە: چاکترین کارێك کە لە دین دا بکرێت ئەوەیە کە سوننەتە، خراپترین کارێکیش ئەو شتانەن کە لەلایەن بیدعەچیەکانەوە داهێنراون.

بە کۆدەنگی زانایان گەورەترینی کەسێ کە خوای بە هەق پەرستبێ وە پێشەوای ئەو کەسانە بێت کە خواپەرستن بریتیە لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)؛ هەر پەرستشێك پێچەوانەی پەرستشی ئەو خۆشەویستە بێت لە شێوەو شوێن و کاتدا بریتیە لە بیدعەیەکی گومڕایی و ڕەتکراوە، خاوەنی ئەو

---

(١) - رواه ابن عبد البر في: جامع بيان العلم وفضله للإمام ص ٢٤٨.

(٢) - أنظر: (الاعتصام) للإمام الشاطبي.

بیدعەتە لە خوای گەورە نزیك ناكاتەوە، بەڵكو زیاتر دوری دەخاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَابِهَا الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ سورة الجاثية: ٢٨.

واتە: لە پاشان تۆمان خستەسەر شەریعەتێك لە بارەی ئایینەوە تۆش شوێنی بكەوە، شوێن هەواو ئارەزووی ئەوانە مەكەوە كە نازانن.

وە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُ ۚ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٣٠﴾ ﴾ سورة البقرة: ١٣٠.

واتە: كێ روو وەردەگێڕێ لە ئایینی ئیبراهیم مەگەر كەسێك كە خۆی هەرزە كرد بێت؟ سوێند بێ بێگومان ئیبراهیممان هەڵبژارد لە دونیادا، بێگومان ئەو لەڕۆژی دوایی دا لەچاكانە.

وە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ ﴾ سورة النساء: ١٢٥.

واتە: كێ ئایینی چاكترو جوانترە (وە كێ دیندارترە) لە كەسێك كە ڕووی خۆی یەكلا كردبێتەوە بۆ خوا، لە هەمان كاتدا ئەو كەسە چاكەكار بێت و شوێنی ئایینی ئیبراهیم كەوتبێ بەڕاستی و پاكی (كە بە ویستی خۆی لە بەتاڵ لای داوە بۆ لای ڕاست)، خوا ئیبراهیمی هەڵبژارد بەدۆست و خۆشەویستی خۆی.

ئەوەی كە هیچ گومانی تێدا نیە؛ یەك ڕێگەیی موسوڵمانان وە هێز و غیرەتیان و سەربەرزی و شان شەوكەتیان و هەیبەتیان، بەڕاستی بریتیە لە یەكبون لە بیروباوەڕدا، ئەویش عەقیدەی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) كە بریتیە لە عەقیدەیەكی ڕون و بێ خەوش، ئەو عەقیدەیەی كە ئەوەی یەكەم لە پێشینی ئەم

ئوممەتە موبارەکە باوەڕیان پێ کردو پەیڕەوییان لێ کرد، هەر بەو عەقیدەیە حوکمی دونیایان کرد بە ڕاستی و بە دادپەروەرانە؛ بە ڕاستی لەو ژیانەدا بوونە کەسانی گەورەو ڕابەر و سەرمەشق.

**پوختەی قسە بریتیە لەمە:**

**بزانە ئەی خۆشەویست!** بەڕاستی چاك و سەرکەوتو نابین لە دونیاو لە دوارۆژدا، سەرکەوتن بۆ بانگەوازەکەمان نیە، گەورەیی بۆ نەفسی خۆمان و بۆ کۆمەڵگەکەکانمان نیە؛ تەنها بەوە نەبێت کە دەست بگرین بەوەوە کە گرنگ ترینە کە عەقیدەیە، ئەویش بەوە دەبێت کە لە بانگەوازەکەماندا دەست پێ بکەین دەسپێکەکەمان بریتی بێت لە عەقیدەی یەکخواناسیی پاك و پوخت؛ جا سیاسەت و ڕامیاری خۆمانی لەسەر بونیاد بنێین هەروەها یاساو ئەحکامەکانمان و ئاکار و ڕەوشتە جوانەکانمان و هەڵسوکەوت و ئاداب و مامەڵەکردنەکانمانی لەسەر بونیاد بنێین.

دەست پێ کردنمان لە هەموو ئەوانەدا دەبێ لە ڕێگەی قورئان و سوننەتەوە بێت، لەبەر ڕۆشنایی تێگەیشتنی سەلەفی ئەم ئوممەتە؛ ئەوە بریتیە لە ڕێگەی ڕاست و پارێزراو، بەرنامەیەکی زۆر بەهێز؛ کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێ کردوین بەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ﴾ سورة الأنعام: ١٥٣.

واتە: (فەرمانی داوە کە) بێگومان ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کەڕاستو دروستە کەواتە شوێنی بکەون و، شوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون، چونکە دوورتان دەخەنەوەو لاتان دەدەن لەڕێگەی خوا، خوا ئەو شتانەی بەئێوە ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی پارێزکار بن.

**بیروباوەڕی پێشین تاقە ڕێگەیە بۆ چاك بوونی بارودۆخی ئوممەت.**

داواکارین لە خوای بەرز و بڵند هەروەك چۆن ڕێنمایی کردوین بۆ بەرنامەو بیروباوەڕی سەلەفی صالح؛ لەوانمان بگێڕێ، داوای لێ دەکەین لەگەڵ ئەواندا حەشرمان بکات لەژێر بەیداخی گەورەی دروستکراوان تکاکار و تکا لێ وەرگیراو موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، دڵەکانمان گومڕا نەکات و لەسەر ڕێی ڕاست لایان نەدات، لەدوای ئەوەی کە بە ڕەحم و بەزەیی خۆی هیدایەتی داوین و سەرکەوتو سەرفرازی کردوین، هەروەها داکارین لە خوای گەورە کە بمان گێڕێ لە بەندە یەکتاپەرست و چاك و خواناس و زاناو کارکەرانەی کە لەسەر ڕێگەی ئەون؛ بەڕاستی خوای گەورە لەسەر ئەوە بە توانایە، بیسەر و وەڵامدەرەوەیە.

وَ صَلَّى اللهُ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَ عَلَى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أَجمَعِين.

بە یارمەتی خوای گەورە تەواو بوو.

ناصح ئیبراهیم سازانی

کوردستان/ سلێمانی

ساڵی ١٤٣٤ کۆچی – ٢٠١٥ زایینی.

# بەرهەمەکانی ناصح سازانی

١- فەزڵی نوێژ و کاریگەری لەسەر تەزکیەی نەفس.
٢- خواپەرستی و کاریگەری لەسەر پەروەردەی دەروون.
٣- پەروەردەی منداڵان لە ئیسلامدا: ١ / ٢ . نوسینی: دکتۆر. (عبدالله ناصح علوان) وەرگێڕان.
٤- گەشتی قیامەت.
٥- دایەو بابە فێرم بکەن چۆن نوێژ بکەم.
٦- هۆشیاریدان سەبارەت بە هەڵەی هەندێ لەنوێژخوێنان وەرگێڕان.
٧- پوختەی عەقیدەی سەلەفی صالح. نوسینی: (عبدالله بن عبد الحميد الأثري) وەرگێڕان.
٨- سوننەنی ئەبو داودی سەجستانی: ١/٥ وەرگێڕان.

بە پشتیوانی خوای پەروەردگار چاوەڕوانی سونەنی(الترمذي)ی بن

# ناوەڕۆك